ناوی کتێب: گوڵشەنی خۆشناوەتی

بابەت: کلتووری

دیزاین: قوباد  یاسین

ساڵی چاپ:٢٠٢٢

چاپخانە: هیڤی

ژمارەی سپاردن: 302 ی ساڵی 2022

تیراژ: ٥٠٠

پێشکەشە بە:

- ئەوانەی مێژووو کەلتووری ناوچەکەی خۆیان بە گرنگ دەزانن.

-هاوژین و منداڵە خۆشەویستەکانم، کە هەمیشە دەستباریان بۆ گرتووم و لە نووسین هاریکارم بوون.

- هەموو ئەو کەسانەی لە هەوڵدان بۆ نووسینی بابەتی مێژوویی و کلتووری و فۆلکلۆریی کوردی، بەتایبەتی ئەوانەی توێژینەوە سەبارەت خۆشناوەتی دەکەن.

# ناوەڕۆك

# محەمەد جەمال، پیاوێک لە نەسلی پەپوولە

**زیرەک کەمال**

زۆر جار بیردەکەمەوە ئەگەر کتێب نەبوایە مرۆڤ چی دەکرد؟ یان ئەگەر کتێب نەبوایە کۆمەڵگەی مرۆڤ دەیتوانی بەم شێوە و ئاراستەیەدا ڕووە و پێشەوە لە هەموو بوارەکاندا هەنگاو بنێت؟ ئەگەر کتێب نەبووایە ئێمەی مرۆڤ بەتایبەتی هەوادارانی دنیای زانین و ڕێگای هوشیاری، لە چ تەنیاییەکی کوشندەدا دەژیایین؟ خوێنەری ئازیز، ئەم کتێبەی بەردەستت، بەرهەمی قەڵەم وهزری پاراوی کاک محەمەد جەمالە، ئەو پیاوەی دەیان ساڵە لەسەنگەری وشە و مەعریفەدا شەڕ لەسەر جوانی دەکات و بە خاڵ و بڕگە و وشە و ڕستەی نووسین داوی گرتن بۆ ڕاستی وجوانییەکان دادەنێت.

پیاوێک، بەوپەڕی دڵسۆزی و سەلیقەوە خزمەتی مێژوو ئەدەبیات و زمان و مەعریفە دەکات، دەیان ساڵە چەکی مەردایەتی بە باڵادا کردووە و شانی وەبەربارێکی قورسدا کردووە و لەم ڕێگەیەشدا خزمەتێکی بێوێنەی کردووە، دەیان مەڵۆی خستووەتە سەر خەرمانەی مێژووی بەسەرهات و ڕووداوەکان، دەیان ساڵە بە وێنەی باوکێکی

دڵســــۆز و دایکێکی میهرەبان، لاوکی نەمری وغەریبی بۆ شەهیدانی ئەنفال و کیمیابارانی دەڤەرەکەمان دەڵێت.

محەمەدجەمال باســی بەســەرهاتی پاشــا و ســوڵتان و سەرۆک و ڕابەرەکانمان بۆ ناکات، باسی دارمانی کۆشک و تەلاری دەســــەڵاتی ئیمپراتۆر و پێکدادانی لەشــــکری سـوڵتانە خوێنخوار و دیکتاتۆرە مرۆڤکوژ و دڵڕەقەکانمان بۆ ناکات، باســـــی شـــــەڕی ناوخۆ و تەنکەری نەوت و گەندەڵی و فەوزای ناو میدیا و ســیاســییەخۆپەرســت و ژیانکوژ و جوانیکوژەکانمان بۆ ناکات، ئاخر ئەو جوانتر لە هەموو ئەوانە نووســـیویەتی و بەڵکو بـاســـی جوانییەکانمان بۆ دەکات، باســـــی ئەو دیمەن و چەمک و کـاتێ گۆڕی بوونـانەمـان بۆ دەکـات کە ســـیاســـەت خســـتوویەتییە ژێر ســـمی ئەســـپی ســـەرمـایەی بەرژەوەندییەکانی خۆی و خستوینیەتە سەر ڕەفەی تۆز لێنیشتووی لەبیرکردن.

محەمەد جەمال، باســـی کانی و بژوێن و نواڵە و بنار و لووتکە و گوڵ و بست بە بستی دەڤەرێکمان بۆ دەکات کە دەیان ساڵ بەر لە ئێستا ڕژێمی بەعس کیمیابارانی کرد و قڕی ســەوزی ژیانی ئەو ناوچەیەی هەڵپڕووکاند و ژیانی

مرۆڤ و باڵندە و ئاژەڵ و درەخت و گژوگیای بە مەرگ سپارد.

من لەناخی دڵمەوە ئافەرین ودەست خۆشە لە کاک محەمەدجەمال دەکەم تەمەندرێژی و سەرفرازی بە ئاوات دەخوازم، ئەرکی سەرشانی هەمووشمانە بەتایبەتی ئەوانەی لە ماناکانی نووسین تێدەگەین، لەبەردەم شکۆی محەمەدجەمالدا بوەستین و بەرێز و ستایشەوە لەبەردەمیدا دەست لەسەرسنگ بوەستین، بۆ پیاوێک بەدوای هەقیقەتدا ناگەڕێت، بەڵکوو بەوپەڕی بوێری و جورئەتەوە بەرگری لێ دەکات.

# پێشەکی

نووسین لەسەر دەڤەرو ناوچە و شوێنەکانی کوردستان کارێکی یەکجار گەورە و پیرۆزە، چونکە کارێکە خزمەت بە نەتەوەی کورد دەکات، کوردستان لە هەموو لقێکەوە زۆر دەوڵەمەندە، نەتەوەی کوردیش کە لە کوردستان دەژی تایبەتمەندی خۆی هەیە، کەلتووری تایبەتی خۆی هەیە، کە دەتوانم بڵێم مەڵبەند و مەفتەنەکەی کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر هەڵسوکەوت و عورف و عادەتەکەی.

بەڵام تائێستا کەم کەس خۆی لەقەرەی ئەم کارە داوە، نووسین و لێکۆڵینەوە لەم بوارەدا لەپەنجەی دەست زیاتر نییە، ئەگەر کاری بۆ بکرێت خۆی لەدەیان پەرتووک دەدات، ئەوەی بەم جۆرە(مشـولانە)هەستێت دەبێ شارەزای زۆر وردی هەبێت و سەلیقە و پشوودرێژی و نووسینی زۆری دەوێت، بۆیە هەموو کەس ئەم جۆرە نووسینانە ناکات.

بەڵام ئەم کارەی کاک(محەمەد جەمال توتمەیی) کارێکی یەکجار بەرز و پیرۆزە، کاکەحەمە کە ئازایانە و بوێرانە چاکی مەردایەتی لێهەڵکردووە و بەگژ ئەم کارە گرانەدا چووە، تێیدا سەرکەوتوو دەبێت، چونکە خۆی کوڕی

ناوچەی خۆشناوەتییە و چاو و گوێی بەئاو و هەوای ناوچەکە کراوەتەوە، بەئاوی ساردو سازگاری قەدپاڵی چیای هەورێ و دەرەشیرو شۆپەو ماکۆک و سەفین فرچکی گرتووە، شارەزاییەکی زۆری لە هەموو بوارەکانی ناوچەی خۆشناوەتی هەیە، شارەزایی لە وشەو دەستەواژە و پەندو ئیدیۆمی ناوچەکە هەیە، (دوو پەرتووکی لەم بورەدا نووسیوە، ئەوانیش(فۆلکلۆر خۆشناوەتی و فەرهەنگی دەنگارە)، پێشکەش بەنەتەوەکەی کردووە.

ئەم پەرتووکەی ئەم جارەشی کەناوی(گوڵشەنی خۆشناوەتی)یە، چەند بابەتێک لەخۆدەگرێ، وەک ناوی جوگرافی چیاو دۆڵ و کانیاو و دار و دەوەن و گژوگیا و ئاژەڵداری و کاروپیشە و هەروەها حوجرەو خوێندن و فەقێ و مەلاو خوێندەواری کاتی خۆی دیاری کردووە، جگە لەمانەش فەلەک ناسی لەخۆشناوەتی سەرەداوی زانینی داوەتە دەست، وەبەکارهێنانی گژوگیا بۆنەخۆشی و چارەسەرکردن.

بۆیە دەڵێم (گوڵشەنی خۆشناوەتی) دەوڵەمەندە، پڕە لەزانیاری دروست و پێش چاو، ئومێدەوارم زووبەچاپ بگات ئەم نووسینەی لەدوڕو مەرجان و لەعل و گەوهەرەی کاکە حەمە هۆنیتیەوەو پێشکەشی نەتەوەکەی

کردووە، بۆ ئەوەی لەدوا رۆژ ببێت بە ژێدەرێک بۆ لێکۆڵینەوە لەلایەن نەوەی ئێستا لەهەموو ئەو شتانەی کە لەهەگبەکەی دا کۆی کردوونەتەوە ببێتە بنەمایەک بۆ زیاتر نووسین لەسەر ناوچەی خۆشناوەتی، کەزۆر زیاتر لەم پەرتووکە هەڵدەگرێ لەسەری بنووسرێ.

من وەک عبدالوهاب شێخانی پیرۆزبایی گەرم لەکاک(محمدجمال توتمەیی) دەکەم بەبۆنەی ئەم ئەرکە پیرۆزەی کەئەنجامی داوە.

هیوادارم بەهیچ جۆرێک ساردنەبێتەوە لەبە ئەنجامگەیاندنی کارەکەی، سەرکەوتنت سەد دەرسەدە، ئەگەر کارەکەت تەواو نەکەی گوناهبار دەبی، چونکە کەسێکی بێگانە وەک تۆ شارەزایی لەم دەڤەرەدا نییە تا بێت ئەم کارە بکات.

هەرسەرکەوتووبی، هەرپایەداربی، هەر بەرخورداربی، لەکارەکەت هیوام وایە هی تریشی بەدواوە بێ.

**عبدالوهاب شێخانی**

سەرەتای بەهاری ٢٠٢٠ هەولێر

# پەسەندنامە

کاتێک بەرهەمێک سـوودگەیاندن و واتاداری و جوانی و چێژبەخشـین لەخۆیـدا کۆبکـاتەوە و ببێتە پێوەر بۆ پەیامداری، دەبێتە بابەتێکی زیندوو.

(گوڵشـەنی خۆشـناوەتی)، کە ناوەکەی بەخۆیەوەیە، وەک شـنەی ئێوارانی بەر نزاری کەپکەشـاخێکی خۆشـناوەتی، هەڵگری بۆنوبەرامێکی وایە کە دەماغ دادەگیرسـێنێت و مەسـتی دەکات. هەر بابەتە دەتباتە مێرگێکی رازاوە و گوڵچنینی لێ ئەنجام دەدرێت.

ئەم بەرهەمەی(محەمەدجەمـال توتمەیی)مـانـدووبوون و شـەونخوونی زۆری پێوە دیارە، زۆرشـتی لەبەرهەمە کلتووریەکـان لە لەنـاوچوون پـاراسـتووە، هەروەک ئینسکلۆپیدیایەکی ناوچەیی دەکەوێتە بەرچاو.

جێگـای ئەوەیە بکرێتە سـەرمەشـقێک بۆ نـاوچە و دەڤەرەکانی تری کوردسـتان، بەتایبەتی کەهەتا ئێسـتا وەک پرۆژەیەکی نەتەوەیی ئەم کـارە گرینگە ئەنجـام نەدراوە،بۆیە بەچاو لێکەری و لاسـایی کردنەوەش بێت کارێکی باش دەکرێت لەناوچە و دەڤەری تر کەسـانێکی دڵسـۆز ئەم کارە بەئەنجام بگەیەنن، زیاتر کلتوورمان

بـابردەڵە نـابێـت و ئێمەش توشـــنـا بین دوای کڵاوی بابردووبکەوین.

ئەوەی جێگای ســـەرنج و لێ وردبوونەیە ئەم بەرهەمە نـایـابە بەش بەش کراوەو زۆر لایەنی ژیـان دەگرێتەوە، هەرلە نـاولێنـان و دابونەریـت و تـاکوو دەگـات بە یاســاباوەکانی خوێندن و مەدرەســەکان و کورتەی ژیانی زانایان و چۆنیەتی و شـــێوازی گوزەرانی بەرێی خەڵکی خۆشناوەتی.

ئەوەنـدە ئەڵێم کـاک محەمەد بە کـاتی گونجـاو بەفریـای رابردوو کەوت. کـارەکەت پڕ بەرهەمە و ئـاوێنەیەکی بەرچاوی ئەم دەڤەرەیە، بیرت روون و دەستخۆش.

**تالیب عەبدولسەمەد سەرانی**

مامۆستا لەفاکەڵتی پەروەردە/ بەشی کوردی، زانکۆی سۆران

# چەند پەیڤێک

**خوایە بەناوی تۆ...**

نووســـین لەبواری مێژوو و جوگرافیا و بوارەکانی ژیان لەخۆشـــناوەتی کارێکی هەروا ســـەرپێیی و ئاســـان نییە، بەڵکوو بەپێچەوانەوە کارێکی ســـەختە و مـاندووبوونی زۆری دەوێ، بەهۆی ئەوەی تائێستا سـەرچاوە کەمن کە بەتەواوی باســـی مێژوو و جوگرافیا و بوارەکانی ژیان و گوزەرانی خەڵکی ئەم ناوچەیە بکات، هۆیەکەشـی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەوا بەدرێژایی مێژوو، ئێرە شـوێنی ململانێ و شـــۆڕش و یاخیبوون بووە، هەرکەســـێک و لایەنێک لەدەستەڵات یاخی بوایە، ئەوا بێگومان ئێرەی هەڵدەبژارد، هەر بەو هۆیەشەوە بووەتە ناوچەیەکی داخراو لەبەردەم مێژوونووس و گەڕیدە و کلتوور و کەلەپوورناســـەکان، بۆیە لەو پێناوەدا ســـەروەت و ســـامانێکی نەتەوایەتیمان لەدەست چووە، ئەویش خەسارەتێکی گەورەیە، کە نەمان توانی ئەوەی لەسینگ و دڵی پیاوە قاڵبوو و بەتەمەنەکانی خۆشـــناوەتی بخەینە ســـەر کاغەز و لەفەوتان رزگاری بکەین، ئـاخۆ چەنـدان بەســـەرهـات و مێژوو و نـاوی جوگرافی و ناونانی شـاخ و بەرزایی و چیرۆک و بەیت و

بالۆرەمان فەوتابێ، ئێستایش ئەوەی گرنگیم پێداوە زیاتر ڕاو ســـەرنجی پیر و بەســـالاچووەکانە، بەوردی گوێم لێگرتوون و ڕاو سەرنج و تێڕوانینم بەهەند وەرگرتوون.
مـاوەیەکی زۆرە خەریکی کۆکردنەوەی ئەم بەرهەمەم، بەتـایبەتی لەبـارەی مێژووەکەی، نەم دەوێرا خۆی لە قەرەبـدەم، دواتر زۆرم لەخۆکرد و توانیم ئەم بەرهەمە تەواو بکەم ، بێگومـان بێ کەموکوڕی نییە، بۆیە داوای بەخشین دەکەم، چونکە هیچ کەسێک بێ کەموکوڕی نییە تەنها خوای گەورە بێخەوش و بێکەموکوڕییە. ئەم کتێبە وەکوو نیمچە ئینســـکلۆپیـدیـایەکە لەســـەر دەڤەری خۆشناوەتی.
هـیوادارم کەلێنێکی بچووکی کتێبخـانەی کوردیـم پڕکـردبـێتەوە وهـیوای بەختەوەری بـۆ هەمـوولایەک دەخوازم .

**محەمەدجەمال توتمەیی**

بالیسان- بەهاری ٢٠٢٠

# مێژووی خۆشناوەتی بەر لە زایین

بەپێی ئەو پاشـماوە کۆنانە و ئەو سـەرچاوانەی کە باس لە مێژووی کۆنی خۆشـناوەتی دەکەن، خۆشـناوەتی مێژوویێکی دوورودرێژ و پڕ لە کارەسـاتی هەیە. دیارە لەمێژە ئاوەدانە.

با یەکەم جار بێینە سـەر ئەو پاشـماوانەی کە وەکوو شـوێنەوار لە خۆشـناوەتیدا هەن، یان هەبوونە، وەکوو شـوێنەوارەکانی: (گردی کانیی کەڵەک و گردی بالووکاوە و سـاریج و بێوران و گردی دێگە و گردی شـلیمۆن و گابڕە و پاشـماوەکانی گوندی هەرمک و پاشـماوەی دێرینی بێتواتە و شەقڵاوە و دۆڵی سماقوڵی و قەڵاسنج و دۆڵی کۆڕی....هتد) ئەم پاشـماوە و شـوێنەوارانە دەری دەخەن کەوا خۆشـناوەتی خاوەن دیرۆکێکی لەمێژینە و کۆنە، بەڵام لەهەمووی گرنگتر هەروەک نووسـەر (محەمەدسـەرگەینێڵی)نووسـیویە: (خۆشـناوەتی پێگەیەکی پیرۆزو بەرچاوی ئایینی هەبووە، بەڵام بەداخەوە تاکوو ئێسـتا وەکوو نووسـینێکی مێژوویی نەچووەتە سـەر کاغەز، ئەویش بریتیە لە (ئەشـکەوتی ئیبراهیم خەلیل) ، ئەم ناوە بەربڵاوە لە کوردسـتان و لەزۆر شـوێن

گوێبیستی ناوی ئیبراهیم خەلیل دەبین، هەروەک سەرگەینێلی دەڵێ (دۆڵناران)کە کەوتووەتە رۆژهەلاتی سەروچاوەی مەرکەزی ناحیەی بێتواتە، شوێنی ئیبراهیم پێغەمبەر بووە و هەم شوێنی نەوەکانی لە دۆڵناران ئیبراهیم پێغەمبەر دەخرێتە (مەنجەنیقەوە)، کە ماوەیەکی زۆر چیلکە و دار و سووتەمەنییان کۆکردووەتەوە و حەزرەتی ئیبراهیمیان تێخستووە و بەفەرمانی خوای گەورە (ياناركوني بردا وسلاما على ابراهيم) ئاگرەکە نە ئەوەندە ساردبە و نە ئەوەندە گەرم بە.

ئەوەبوو وەکوو موعجیزەیەکی ئیلاهی حەزرەتی ئیبراهیم لەو کارەساتە رزگاری بوو، لەزۆر گوندی خۆشناوەتی ئەشکەوتی بەناو(ئیبراهیم) هەن.

دوای ئەو کارەساتە لەلایەن خوای گەورە فەرمانی پێدراوە کەوا بچێتە (مەککە)لەوێ سارای خێزانی و تاقە کوڕەکەی (ئیسماعیل) بەتەنیا بەجێدێڵێ، ئیدی نەگەڕاوەتەوە بۆ کوردستان.

# ئایینە یەهوودی

نووسەری میللی و بەتوانا: (بەختیار دواوەیی) لەکتێبەکەیدا " جوولەکەکانی کوردســـــتان" کە ماوەیەکی زۆر لەگەڵیدا ماندوێتی چەشت، دەڵێ:

"ئەو ســــەرچاوانەی کەباس لەهاتنی جوولەکە دەکەن بۆ عیراق و کوردستان زۆرن."

بەڵام بەختیار تەنها چوار ســــەرچاوەی باس کردووە و دەڵێ:

١-ئینجیلی پیرۆز: دەڵێت جوولەکەکان لەپێش چەند ساڵێک بەرلە زایین راپێچی شاری بابل کراون.

٢-پەرتووکی(مێژووی جوولەکە لە عیراق هەتاکوو ئێســـــتا)ئەم پەرتووکە یەکەم جار بە زمانی عیبری نووسراوە لەلایەن (میخایل شالۆ)لەساڵی ١٩٢٦ ی زایینی چاپ کراوە و دەڵێت:

جوولەکە لە عیراقدا بەکۆنترین کۆمەڵی جوولەکەی هەموو جیهان دادەنرێت، لەساڵی ٩١١-٦١٢ پێش زایین، لەکاتێکدا بوونیان بۆ ســــەردەمی کۆتایی ئیمپراتۆری ئاشـــــووری دەگەڕێـــتەوە، بەڵام لەدوای چەنـــد هـــێـــرشـــــێـــک کەئاشوورییەکان کردیانە سەر فەلەستین، جوولەکەکانیان

گرتن و گواستنیانەوە بۆ چەند شوێنێکی شاخاوی، کە مەبەستی کوردستانە.

٣-گۆڤاری دۆسیەی ئیسلام دەڵێت: جوولەکە بەچەند شەپۆلێک هاتوونەتە کوردستان، کە ڕەنگە لەیەکەمین شەپۆلدا ئەو شەپۆلە بێت کە لە ساڵی ٧٣٢ پێش زایین ، کاتێک ئاشوورییەکان بەسەرۆکایەتی پاشای ئاشووری(تیگلات پیلاسەر)ی سێیەم (٧٤٥-٧٢٧ پ.ز، ساڵی ٧٣٢ پ.ز، دیمەشقیان رووخاند و ئینجا هێرشیان کردە سەر شانشینی ئیسرائیل، کەزاڵبوون بەسەر ناوچەی (جەلیل)ی باکووری فەلەستین و خۆرهەلاتی ئوردندا(خێڵی نەفتالی)و دانیشتوانی شارەکانی خۆرهەلاتی ئوردن بەدیل گیران و بران بۆ ئەو ناوچەیەی کە دەکەوێتە باکووری ئاشوورەوە و لەژێردەستەلاتی ئاشوورییەکاندا بوون (باکووری کوردستان) ئیتر شانشینی ئیسرائیل تەنها ناوچەی دەوری شاری (شۆمیرۆن*)(سامیرە)ی پایتەختی لێمایەوە.

٤ -گۆڤاری مێرگ: مێژووی بێتواتەی دەگەڕێنێتەوە بۆ (٢٧٠٠)ساڵ پ.ز.کە ئەو کات گەلی (گۆتی) تیادا ئەژیان، لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی هەندێ جار ژمارەی

ماڵەکانی بیتواتە کەیشـــتۆتە ٥٠٠ ماڵ، لەو ژمارەیە پەنجا ماڵ جوولەکە بوونە.

جوولەکە لەخۆشناوەتیدا لەزۆربەی گوندەکان هەبوون، لە هەندێ شـوێن دژایەتییان کراوە، بەڵام لە هەندێ شـوێنی تر زۆر ڕێزیـان گیراوە و ژن و ژنخوازیشـــیـان لەگەڵ کراوە.

خوالێی خۆشـبێ (قادرگۆزێ) لە کتێبەکەیدا بەناوی (من و شــــەقڵاوە)لە لاپەڕە ١١١دا دەربـارەی جوولەکەکـانی شەقڵاوەدا دەڵێت:

لەئـاوی نـاوەنجییەوە تـا کەمێـک لەرۆژئـاوای ئـاوی کانیی(خمان) گەڕەکی مەسیحیەکان بوو، لەوێشەوە تاکوو دەگەیشـــتە چاکی باووباپیران گەڕەکی موســـڵمانان بوو، مـاڵەجووەکـانیش کە ژمـارەیـان بیســــت مـاڵ دەبوون کەوتبوونە نێوان مەســــیحی و موســــوڵمـانـان، چونکە جووەکان ئەوەندە زۆرنەبوون بۆیە شـــوێنێکی تایبەتیان بۆ پەرستگا نەبوو، بەڵکوو لەماڵی ئیسـحاق کۆدەبوونەوە بۆ عیبادەتی تایبەت بەخۆیان، ئەم ئیســــحاقە مالم نەبوو بەڵکوو پیـاوێکی خوێنـدەوار بوو، هەروەهـا قـادرگۆزێ دەڵێت پێدەچێ لەســـەردەمی کۆندا(کەنیشـــتە)لەشـــەقڵاوە هەبووبێ، زۆربەی جوولەکەکانی شـــەقڵاوە دووکانداریان

خەریکی بازرگانیکردن بوونە، هەندێکیشـــیان خەریکی خمکردن و جاجم و بەرماڵ دروستکردن بوون، مام قادر دەڵێ ناوی کانی (خومـان)لەکانی (خمـان)ەوە هـاتووە، کەسـەرچاوەیەکی ئاوی شـەقلاوەیە، چونکە ئەو کانییە بۆ لە خمـدانی جلوبەرگ و تەون و ریس رەنگکردن بەکـار دەهات، کە تەنها جووەکان ئەم کارەیان دەکرد.

وەکوو لەپیاوە ریشـسـپییەکانی خۆشـناوەتی گوێبیسـت بوومە، جوولەکەکـان مرۆڤی زۆر ژیر و ئـاقڵمەنـدیـان هەبووە و نەرمونیـان بوونە لەگەڵ خەڵـک، بۆ نموونە ئەگەر یەکێک قسـەیەکی ناشـرینیان بەرانبەر یەکێکی تر کردبایە، ئەوا لەوەلامدا پێیان دەگوت (عەیبە ئەوە شـەرم ناکەی ئەو قسـە ناشـیرنانە ئەکەی؟)لەئایینی جوولەکەدا نەریتێکیان هەبوو هەموو رۆژانی شـەممە دەچوونە سـەر رووبارەکان، باوەڕیان وابوو کەوا (دارعەسـای) مووسـا دەدۆزنەوە، بەلام مەبەستەکە زیاتر کۆبوونەوەیان بوو.

لەخۆشناوەتی ئێستاشی لەگەڵ بێ لەکاتی وەرزی پاییز و بارانبارینێدا بارانی یەکەم واتە ماوەیەک پێش بارانی(پەڵەی) بەبـارانی یەکەم دەڵێن: (کەپرەشـــینە) ئەم کەپرەشـــینە کولتووری ئەوانە بۆ ئێمە ماوەتەوە، چونکە سـەری سـاڵی عـیبری لەوەرزی پـاییـزدایە و گەورەتـریـن جەژنـی

جوولەکەکان بووە، کەپێیان دەوت(رەنشـــەشـــانە) بەواتای (راس الســـــنـــة)عەرەبی، لەو کـــاتەدا هەڵـــدەســـــتـــان بەدروســـــتکردنی کەپرێک تەنها لەداری بی دروســـــتیان دەکـرد هەمـوو مـیـوەیەکـیـان بەو کەپـرەوە دەکـرد و زۆرجوانییـــان دەڕازانـــدەوە، تـــامـــاوەیەک ئەو کەپرەیە بەردەوام دەبوو و لەژێر ئەو کەپرەدا ئاهەنگی ســــەری ســـاڵی عیبرییان دەکردەوە، ئەم رەنشـــەشـــانە ســـواوە و لەلای ئێمە بووەتە کەپرەشینە.

لەدابونەریتی جوولەکەدا تەنها مالم بۆی هەبوو ئاژەڵ و گیان لەبەر سەرببڕێ، بۆیە لەوەرزی پاییزدا کە دابەستی قەڵەودەبوون و کـاتی کوشـــــتنەوەیان دادەهـات دەبوایە چـــاوەڕێی مـــالم بکەن بۆ ســـــەر بڕینی دابەســــــتی، جوولەکەکـانی بێتواتە هەروەک (بەختـیـار دواوەیی)ئەڵێ: لەبێتواتە ولاخیان ئامادە دەکرد و چەند کەســـێک بەدوای مالمدا دەچوونە (هەریر و باتاس) دیارە مالم لەوێ بووە، بەلام مام قادرگۆزێ دەڵێ جووەکانی شەقلاوە چاوەڕێیان دەکرد تاکوو مالم لەبالیســــانەوە دەچووە شـــــەقلاوە بۆ ســـەربڕینی دابەســـتی، هەروەک مام قادردەڵێت: ئەو کات زۆرترین ماڵەجوو لەبالیسان بوونە.

جوولەکە لە زۆربەی گوندەکانی: (خەتێ، توتمە، بالیسـان، شـێخ وەسـان، بێراوە، هەرمک، مەلۆک، بێتواتە، دواوە، گوندەکانی دۆلی هیران، سـماقولی، شـەقلاوە، هەندێ گوندی دەشـتی هەریر...هتد) هەبوونە تاکوو دامەزراندنی دەوڵەتـی سـەربەخـۆی جـوولەکە لە فەلەسـتـین، لەخۆشـناوەتی ژیانیان بەسـەربردووە، تێکەڵاویەکی زۆر بەهێز لەنێوان جوولەکە و موسـڵمان دا بووە، تەنانەت بەهۆی تێکەڵاویانەوە گەلێک موسڵمان فێری زمانی عیبری بوون و زۆرئاشـنـایی قسـەیان لەگەڵ کردوون، وەکوو باسمان کرد خەڵکی زۆر ژیر و بەسەلیقەیان هەبووە کەوا باشـترین کاریان کردووە وەکوو: (بازرگانی ، خمکردنی جلوبەرگ و پینەدۆزی و زێڕینگەری و کـاری جۆلایی و دروسـتکردنی پێداویسـتییەکانی ژیان، من پێموایە گەلێک پیشـەی ئەوان وەکوو کولتوورێـک بۆ ئێمە مـاوەتەوە، تەنـانەت لە دروسـتکردنی (قەرێ)قـاورمە، وەکوو بـاس دەکەن ئەوان دایان هێناوە.

# ئاینی مەسیحی لەخۆشناوەتی

دەربارەی مەسـيحييەكانی خۆشـناوەتی (ميخائيل منێور كوسـا) لە كتێبی (تاريخ شـقلاوە)دا بەم جۆرە باسـی مەسيحييەكانی شەقڵاوە دەكات، مەسيحييەكان نامۆ نينە بە كوردستان و بە شەقڵاوە، يان لە شوێنی ترەوە هاتبنە ناوچەكە، بەڵكوو دانيشـتووی رەسـەنی شـەقڵاوەن و لەسەدەی يەكەمی زايين (مارادی)يەكێك بوو لە قوتابييانی مەسـيحی لە حەفتاو دوو قوتابييەكە، لەو وڵاتە دەسـتی كردووە بە بڵاوكردنەوەی ئايينی مەسـيحی، تاكوو ئێسـتا لە شـوێنی رەسـەنی خۆيان ماونەتەوە، مەسـيحيەكانی خۆشـناوەتی لە دابونەريت و مێژوو و كلتووردا زۆر لە كوردە موسـوڵمانەكاندا نزيك بوونە و لە هەموو شـتێكدا هاوبەش بوون، هەمان كارەسـات تووشـی ئەوانيش بووە، لە بيروبۆچوون و دابونەريتدا هەمان دابونەريتيان هەيە و كەواتە لەزۆربەی شـتدا هاوبەشـن. تەنانەت لە پير و پياوچاكدا هاوبەشـن، پياو چاكێك گۆڕەكەی لە ئەشـكەوتێكی چيای سـەفين دايە لە لای مەسـيحييەكانی شـەقڵاوە بە (رەبەن بۆيـا) نـاودەبرێ، بەڵام لەلای موسڵمانەكان بە(شێخ وسوورەحمان) بەناوبانگە.

مەسـیحیەکانی شـەقڵاوە بەتایبەتی پیاوە بەتەمەنەکانیان ئێستاش خۆیان بەخۆشناو دادەنێن، چەندان کەسایەتی و پیاو ماقوڵیان تیادا هەڵکەوتووە، وەچەندین نووسـەرو رۆژنامەنووسیان هەن کە شـایەنی ئەوەن هەڵوەستەیان لەسەر بکرێ، مەتران ئەدای شێر یەکێکە لەو کەسایەتی و نووسەرانەی کە تەواوی ژیانی لەپێناو گەل و میللەتەکەی تەرخان کرد، کۆمەڵێک کتێب و نووسینی لەدوا بەجێماون.

# هاتنی سوپای ئیسلام

پێش هاتنی سوپای ئیسلام و بە موسڵمانبوونی کورد، ئەو کاتە گەلی کورد بەدەست داگیرکاری و زوڵم و ستەمی (رۆم و فارس)ناڵاندوویەتی، بۆیە چاوەڕوانی هەرهێزێک بوونە بۆ ئەوەی لەم داگیرکاریەی ئەوانەوە رزگاریان ببێ، لێرەدا نووسین و وتەی چەند مێژوونووسێک دەخەینە روو کە چۆن کورد ئایینی ئیسلامی قبوول کردووە:

١-نووسەرو بیرمەندی کورد (مەسعوود محەممەد) دەڵێ: (هاتنی ئیسلام کوردی خۆشحاڵ کرد بۆئەوەی لەژێر ستەمی رۆم و فارس رزگاریان ببێ).

٢-محەمەدامین رۆژبەیانی نووسیویەتی: (کورد ستەمی ساسانییەکان تەنگی پێهەڵچنیبوون، بۆیە لەبەرانبەر هاتنی سوپای ئیسلامبوون بە رێنیشاندەر و دژی شای ساسانییەکان هاوکاری ئیسلامیان کرد و هەموو شارو گوندەکانیان بەبێ شەڕ تەسلیم بە سوپای ئیسلام کرد).

٣-ئایەتوڵلا مەردۆخی ئەڵێ: (کورد بەڕەزامەندی خۆی ئەو ئایینە نوێیەی قەبووڵ کرد و بوون بە موسوڵمان).

٤-محمدامین زەکی بەگ، نووســـەری ناوداری کورد وای نووســـیوە:(کوردەکان بیریان کردەوە ئەم ئایینە نوێیە کەمەبەسـتی ئیسـلامە، بەتەواوی ڕێکەوتە لەگەڵ تەبع و ویژدانیانەوە، بۆیە بەئاسـانی بێ شـەڕو شـۆڕو بەرەبەرە قبووڵیان کرد).

زۆر جار ئەوە دەبیســـترێ لەولاو لەولا گوایە لەکاتی فتوحات و هاتنی سـوپای ئیسـلام و پرۆسـەی بەئیسـلام کردنی کورد، کوشـــتارگەلێکی زۆر گەورە دەرهەق گەلی کورد کراوە لەکاتی هاتنی سـوپای ئیسـلام، وەکوو باوەو ئەڵێن کوردبەزەبری شمشێر موسڵمان بوون، یان واباس دەکەن کەوا (خـالـیـدی کوڕی وەلـیـد)بەهـۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە ســوپای ئیســلام لەکاتی فەتحکردنی کوردســـتان کوژراون، بۆیە لەبەرانبەردا خالید بڕیاری داوەو وتوویەتی (دەبێ ئەوەندە لەکوردان بکوژم ، تاکوو دنیا ماوە نابێ ئێسک پرووسک لەکوردستان ببڕێت)، یان دەڵێن ڕەوەندو کۆچەریەکان لەکاتی چوونیان بۆ کوێستان هەســـت بەوە دەکەن کەمەڕومالآت کرمەکرمی خواردنی وردە ئێسک دێتە بەرگوێیان.)

گوایە ئەو وردە ئێسکانە پاشماوەی ئەو کوشتارگەلەیە کە سوپای ئیسلام دەرهەق بە کوردی کردووە.

هەروەها لەزۆربەی شـــوێن، چ لە نزیک ئاوەدانی چ لە چیاکاندا تاشـــەبەردی دوو پارچە یان قەڵشـــتی هەن، کە سرووشتی بەردەکان خۆیان وابووە، لەبەرانبەردا ئەیانوت ئەو بەردانە ســـاغ بوونە و ئیمامی عەلی بە(زولفەققار) کەناوی شمشێری ئیمامی عەلی بووە، شەقکراون.

یان لەســـەر هەر ڕێگایەک بەردی قووڵیان ببینیایە، ئەیان ووت ئەوە جێپێی (دولدول)ـــە، کە ئەسپی تایبەتی ئیمامی عەلی بوو، بەڵام لەراستیدا ئەو باسوخواسانە هیچ راست نین، بەڵکوو ئەو باســـوخواســـانە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە باوەڕێکی زۆر پتەو و بەهێزیان بە ئیســـلام هەبووە و گەلێک جار خورافیات و باســـی ئەفســـانەیی خۆی تێکهەڵکێشـــی بیروباوەڕیان کردووە، بەڵگەشـمان بۆ ئەوە ئەوەیە کەوا لەکاتی فتوحاتی ئیسلام بۆ سـەر کوردستان ، نە لەســـەردەمی خەلافەتی ئیمـامی عەلی بووە و نە خـالیـدی کوڕی وەلیـدیش ســـەرکردایەتی ئەو هێزەی کردووە کە هـاتووەتە ســـەر کوردســـتـان، بەپێی ســـەرچاوەکانیش شـــەڕ و بەرەنگاری بەرانبەر ســـوپای ئیســـلام کراوە، بەڵام بەو راددەیەش نەبووە، لەزۆربەی گوندەکان گوڕی (ئەسحابان)هەیە، بەڵام بەرێژەی زۆریش نـا، بەڵکوو گۆڕەکـان بەپەنجەی دەســـت دەژمێردرێن،

ئەویش مەرج نیە کوژرابن بەڵکوو لەوانەیە بەهۆی نەخۆشـــی مردبن، وەکوو باس دەکرێ تەنها لەچەند شـــوێنێک شـــەڕی ســـەخت رووی داوە وەکوو دۆڵی سماقوڵی کەئەڵێن شەڕی گەورەی لێڕوویداوە.

پێش ئەوەی کورد موسڵمان بێت، سێ ئایین لە کوردستان پەیڕەویان لێکراوە(زەردەشـــتی، جوولەکە، مەســـیحی)، لەشکری ئیسـلام لەسەردەمی خەلافەتی (عومەری کوڕی خەتاب)لەسـالی(٢١)کۆچی فەتحی عیراق و کوردسـتانیان دەستپێکرد، دوای ئازادکردن و پرۆسـەی بەئیسلامکردنی عیراق، لەرێگـای موســـڵەوە ئەو ســـوپایە گەیشـــتنە کوردستان، بەسەرکردایەتی(عەبدوڵلای کوڕی جەندەل).

هەروەک نووســـەر (تـاهیر حەوێزی لە کتێبی (مێژووی کۆیە) ئاماژەی پێ دەکات و ئەڵێ:

دوای ئەوەی ســـوپای ئیســـلام لە هەولێر جێگیر دەبن، پشوویەکی درێژ دەدەن و ئینجا خۆیان رێک دەخەنەوە و دەبن بەدوو بەش، بەشـێکیان بەرەو باکووری هەولێر بە رێدەکەون و هەڵدەکشـێن بەرەو ناوچەکانی شـــەقلاوەی ئێسـتاو تاکوو دەگەنە رواندز و دەوروبەری، لەولاو لەولا تووشی شەڕبوونە، بەلام کەمتر باسیان لێوەکراوە.

بەشەکەی تر بەرەو رۆژهەڵاتی هەولێر بەڕێ دەکەون، لە کۆیە و دەوروبەری لەلایەن مەسیحییەکانی (هەرمۆتە) بەرەنگاریان بوونەتەوە و شەڕ رووی داوە، لە ئەنجامی شەڕەکەدا سەرکردەی مەسیحییەکان بەناوی: (میتای کوڕی سەنعا) کوژرا، هەروەها سەرکردەی سوپای ئیسلامیش بریندار دەبێ، دوایی بەهۆی برینەکەیەوە دەمرێ، شەڕەکە لەبەرژەوەندی لەشکری ئیسلام بەکۆتا دێت، دوای فەتحکردنی کۆیە سوپای ئیسلام بانگەوازێک دەردەکات بۆ خەڵکی کۆیە: (هەرکەسێک ئایینی ئیسلامی قبووڵ نەبێ، ئەوا لەسەری دەدرێ، ئەوەی موسڵمانیش نەبێ دەبێ جزیە بدات).

بۆیە لەبەرانبەردا ئەوەی ئایینی ئیسلامی قبووڵ کرد لەشارەکە مایەوەو ئەوەی تریش کە زەردەشتی بوون، بەرەو دۆڵی (سماقوڵی و خۆشناوەتی) رایانکرد، هەروەک نووسەر تاهیر حەوێزی دەڵێ(ئەوکات نیمچە حکومەتێکی کوردی لەناوچەی خۆشناوەتیدا هەبوو، (خاوەر زەمین)حوکمی ناوچەکە دەکات، پایتەختەکەشی بیتواتە)بووە.

دوای ئەوەی شەڕی کۆیە تەواو دەبێ و سوپای ئیسلام بەتەواوی بالادەست دەبێ، پاش ماوەیەک سوپاکە خۆی

ڕێک دەخاتەوە و فەرمان دەردەکرێت کەوا هێرش بکرێتە سەر خۆشناوەتی، لەدۆڵی سماقولی شەڕێکی سەخت بەرپا دەبێ، لەنێوان سوپای ئیسلام کە لە کوێیەوە هاتبوون و وەئەوانەی یاخی بووبوون و لەکوێیە هەڵاتبوون، ئەنجامی شەڕەکە لەبەرژەوەندیی سوپای ئیسلام دەبێ و سەرکەوتن بەدەست دێنن، وەچەند کەسێک لەسەرکردەکانی ئیسلام لەو شەڕەدا دەکوژرێن، وەکوو(زراری کوڕی ئەزوەڕ و مەغدیدەرەش)، گۆڕەکەیان دەبێتە مەزارگە و تا ئەو دوایانەیش خەڵک سەردانیان دەکردن.

هەروەک باس دەکەن سەرکردەی زەردەشتییەکان ناوی(سمایل )بووە، بەهۆی ئەوەی ڕەنگی دەموچاوی مەیلەو ڕەش بووە، بۆیە بەسمایلە قوڵ ناوبانگی دەرکردووە، لەو شەڕەدا کوژراوە، ئێستاش دۆڵەکە بەدۆڵی سماقوڵی ناو دەبرێت، بەڕۆیشتنی ڕۆژگار ناوەکە سواوەو لەسمایلە قوڵەوە بۆسماقوڵی گۆڕاوە.

ئیدی لەوساوە ئایینی ئیسلام بەرەبەرە پەرە دەستێنێ و تەواوی کوردستان دەگرێتەوە، خەڵکەکەی موسلمان دەبن.

بەبڕانەوەی فەتحکردنی شـــــارو بـــاژێڕو قەڵاو گونــدە کوردنشینەکان ، نیشتیمانی کورد(کوردستان) کەوتە ژێر دەســـەڵاتی عەرەبە موسـڵمانەکان، وەکرا بە پارچەیەک لە قەڵەمڕەوی خەلافەتی ئیسلامی، وەلەلایەن والی و نوێنەرو بەرپرسانی خەلافەتەوە بەڕێوەبرا، هاوکات ئایینی ئیسلام و رۆشــنبیری ئیســلامی و زمانی عەرەبی بەرەبەرە بڵاو بوونەوەو تەشــەنەیان ســەند، میللەتی کوردیش بەهەموو چین توێژەکانیەوە دەســـتبەرداری ئایین و بیروباوەڕی خۆیان بوون و بڕوایان بە ئایینی نوێ هێنا.

راســتییەکی بەڵگە نەویســتە کەبڵاو بوونەوەی ئیســلام لە کوردســـــتاندا و بە موســـــوڵمان بوونی کورد، بەخاڵێکی وەرچەرخـــانـــی هەمەلایەن و هەرەمەزن دادەنـــرێـــت، لەدیرۆکی کورداو لەهەموو بوارەکـــانی کۆمەڵایەتی و ئایینی و ســـیاســـی و رۆشـــنبیری جڤاکی کوردەواریدا رەنگیدایەوە، دەســـەڵات و فەرمـان رەوایی لەفـارســـــە ســـاســـــانیەکان و رۆمە بێزەنتیەکانەوە گوێزرایەوە بۆ دەســتی عەرەبە موســـوڵمانەکان، مزگەوت و حوجرەکان جێگەی ئاگرخانە و پەرســـتگاکانیان گرتەوە، لەئەنجامدا ئەرکە ئایینییەکان و رێورەســـمەکانیدا لەجیاتی(پیر و موغ و قەشـــە) لەســـەرەتا(مەلا و فەقێ )و پاشــانیش شــێخ و

سـوّفی رێبەری خەڵکیـان دەکردو رێگـای راسـتی خوداناسـینیان نیشـان دەدان)، بەڵام ئەو وەرچەرخانە کتوپڕ رووی نەداوە بەڵکوو سـاڵانێکی ویسـتووە تاکوو هەرەزۆری کورد ببنە موسـڵمـان. بۆیە مـاوەیەکی ویستووە تاکوو بەشێکی کورد کە زەردەشتی بوونە ببن بە موسـوڵمـان ، لەهەندێ شـوێن واباس دەکرێ کە دووسەد ساڵی تێپەڕاندووە، ئینجا بوونەتە موسڵمان.

# بلاد الكركار

لەکتێبی(مسالک الابصار) کە نووسەرێکی میری بەناوی (ئەبوو فەزوڵڵای العمری) نووسیویە:
لە سەدەی هەشتەمی کۆچی خۆشناوەتی: (بلاد الكركار)بووە و دانیشتوانەکەشی بە(حسنانیە، حسنانلو) ناوئەبرا، لە سەرچاوەکانی سەردەمی عەباسییەکان ناوی حەسنانی نەهاتووە، یەکەم جار لەسەردەمی مەغۆلەکان ئەو ناوە هاتووە، هەروەها کتێبی: (صبح الاعشی) کە نووسەرەکەی ناوی: (شیخ ابو العباس احمد) لە بەرگی پێنج، لاپەرە ٣٧٣-٣٧٩ دا ئەڵێ(اقلیم الجبال) واتە هەرێمی شاخاوی، لە بیست و چوار عەشیرەت پێکهاتووە و یەکێک لەوانە عەشیرەتی خۆشناوە.
بەپێی ئەم دوو سەرچاوەیە دەردەکەوێ کە خۆشناوەتی لەسەدەی هەشتەمی کۆچیدا بە (وڵاتی کەرکار)بەناوبانگ بووەو سێ تیرە بوونە بەناوەکانی (تیرەی میر عیسای کوری شەهابولدین کە گەورەترین تیرەیان بووە، تیرەی میر عەبدوڵڵای کوری شەهابولدینی زەنکی و دەبێتە دووبەش بەلی و جاکی، وەتیرەی فەخرەددین ئەمیر).
ئەم سێ تیرەیە لەئاستی مەسەلە چارەنووسسازەکان یەک هێز و یەک دەست بوونە، دەربارەی ناوی کەرکار

وەکوو باس دەکرێ دەڵێن بەهۆی ئەوەی هەموو پێداویستییەکانی ژیان هەر لەلای خۆیانەوە دروستیان کردووەو دابینیان کردووە و پێویستیان بەکەلوپەل و شتی دەرەکی نەبووە، کەلوپەل و پێداویستییەکان بریتیبوون لە: (رانک و چۆغەر، کراو پەستەک، گۆری، پێراو، مافوور، لباد، جامی ئاو خواردنەوە، قاپ و ملاک، ملاکە دۆ، چەقۆ، خەنجەر، شمشێر ، تیر و کەوان، داس بیور، داسووکە).

بۆ سەلماندنی ئەم راستیەی سەرەوەتا ئەو ماوەیەی دواییش لە شەقڵاوەو بێتواتەو گوندی خەتێ کارگەی دروستکردنی(داس و بیورو داسوکەو بژار برو پێمەڕەو گاسنی جووتکردن .. چەندان شتی تر)دروست دەکران داس و بیوری ئەو شوێنانە بەناوبانگ بوون لەشوێنەکانی تر دەهاتن ئەو کەلوپەلانەیان دەکڕین هەروەهالەشەقڵاوەو بێتواتە کارگەی دروستکردنی کرو جاجم و بەڕو جەوار هەبوون.

من خۆم ئەمساڵ (٢٠١٩) لەوەرزی هاوین پیرەمێردێکی زۆر بەتەمەنم بینی لە (توتمە)تەمەنی بەقسەی خۆی ٨٩ ساڵ بوو، وەکوو سەردانێک هاتبوو ، دیار بوو لەساڵی ١٩٥٥ لەمەدرەسەر توتمە فەقێ بووەو ناوی(مەلا محمد )بوو خەڵکی دەشتی قەراج بوو، وتی:

من ساڵی ١٩٥٥ لێرە دەمخوێند لای مەلا احمد، ئەو کات زۆربەی کەلوپەکانی پێداویستی لێرە چنگ دەکەوت، لەبیرمە کەس هیچ شتێکی لەدەرەوە نەدەکڕی، چونکە هەموو شتێکی ناوەخۆ بوونی هەبوو، وەکوو پێداویستییەکانی خواردن و کەلوپەلی تر.

وەدەربارەی گۆڕانی ناوی (کەڕکاڕ) بۆ خۆشناو هەروەک باس دەکرێ، دوای کۆتایی سەدەی هەشتەمی کۆچی ، دانیشتوانی ئەو ناوچەیە هەڵساون بەدانانی رەز و باخ و بیستانێکی زۆر، ئەگەر تا ئەو کات ئیش و کاری سەرەکییان بەخێوکردنی ئاژەڵداری بووبێ، لەو ساتەوە دەستیان کردووە بە چاندن و کاری کشتوکاڵی و رەزو باخ، بەهۆی ئاو و هەواو کەشەوە و بوونی ئاوێکی زۆر، ناوی (خۆشناویان )لێناو بەحوکمی ئەوەی ناوچەیەکی پێش چاو و دڵرفێن و لەبەر دڵان بووە، وەکوو خۆشناوچە ناوبانگی دەرکردووە، ئەگەر ئەوکاتیش ناوچە بەکار نەهاتبێ، ئەوا گوتوویانە ئەو ناوەخۆشە، واتا گۆڕانی دیمەن و روخساری ناوچەکە بوو بە هۆی گۆڕینی ناوی ناوچەکە .

# هاتنی ئەمیرزادکان بۆ خۆشناوەتی

بنەماڵەی ئەردەلانیەکان کەلە رۆژهەلاتی کوردستان بوون، لەشاری سنە نیشتەجێ بوون، بنەماڵەیەکی گەورەو بەهێزبوونە، بەجۆرێک ململانێیان لەگەڵ سەفەوی و فارسەکاندا هەبووە، تا کارکەوتووەتە ئەوەی ئەو بنەماڵەیە پەرش و بڵاو بکرێن لەلایەن سەفەویەکانەوە، زۆربەی نووسەرەکان رایان لەسەر ئەوە رێکە کەلەسەدەی چواردەی زایینی ئەو بنەماڵەیە لەلایەن سەفەویەکانەوە هێرشیان بۆکرابێ و پەرش و بڵاوەیان پێکرابێ.

دەربارەی هاتنی (ئەمیز) بۆ خۆشناوەتی چەند رایەک هەیە وەکوو:

١-یەکێک لەو رایانە پێی وایە کەئەمیز بەسەردان هاتۆتە خۆشناوەتی ، کەسەرنجی داوە شوێنێکی باشە بۆمانەوەو ژیان بەسەربردن، ئیدی بڕیاری مانەوەی داوە.

٢-رای دووەم ئەڵێ: گوایە بۆ مەسەلەی بازرگانی هاتووەتە باشووری کوردستان و چووەتە (هەرمک) کە گوندێکی سەر بەبێتواتەیە، دواتر ماوەتەوە.

٣ -رای سێیەم ئەوەیە کەوا لە رۆژهەڵاتەوە لێیان قەوماوە و بەناچاری هاتووەتە خۆشناوەتی.

هەرچۆنێک بووبێ ئەو بنەماڵەیە لە(سـنە)ی رۆژهەڵاتەوە هـاتوونەتە خۆشـناوەتی و لە گونـدی(هەرمـک) گیرسـاوەنەتەوە، ئەو کاتە میری خۆشـناوان میر شـەڕک) بووە، میر شەڕک میرێکی خەڵکی ناوچەکە بووەو پیاوێکی بەراوێژ و زیرەک و نـانـدەر بووە و خەڵکی نـاوچەکە گوێڕایەڵی بوونەو لە قسـەی دەرنەچوونە، لە ئاسـتی مەسـەلە چارەنووس سـازەکاندا ڕاوێژی بە خەڵکانی دنیادیدە و پیـاو مـاقوولانەوە کردووە، میرشـەڕک کە دەزانـێ ئەمبێز نەوەی مـیرئەردەلانە رێزێکـی زۆر و بێپایانیان لێدەگیرێ و خانوویان بۆ دروسـت دەکرێ و چەنـد پـارچە زەویەک وئـاشـێکی ئـاو و جۆگەیەکیـان پێدەدرێ، ئیدی مـاوەیەکی باش لەلایەن میرشـەڕکەوە دەحاوێندرێنەوە، دەسـت دەکەن بەکار و کاسـبی و کاری کشـتوکاڵ و چاندن، ئەو کاتیش ئاو زۆربووە و چەندان پـارچە زەویـان بەبرنج و مـاش و کونجی و تووتن داچاندووە، ئەمە جگە لەوەی گەنم و جۆشـیان چاندووە، مـاوەیەک بێکێشـە دەمێننەوە، کـاتێک کە خەریکی برنج چـانـدن و تووتنکردن بوونە، چەنـد شـەوێـک ئـاویـان

لەجۆگەکە بڕیوە، بۆیە ئەمبێز دەچێتە لای میر شـــەڕک و سـکاڵای ئەوە دەکات کەوا چەند شـــەوێکە ئاو لەبرنج و کشتوکاڵیان بەردەدرێتەوەو ئاو دەبڕدرێ، میرشەڕک پێی دەڵێ لەمەودوا ئاگاتان لە جۆگەکە بێ و هەرکەسێک هات و ئـاوی بڕی بیکوژن ئەگەر کوڕی منیش بوو، ئەم بڕیارەی میرشــــەڕک بەلای ئەمبێزخانەوە گرنگ دەبێ و تازە فەرمان لای میر شـــەڕک دەرچووە و بێمنەت شـــەو دەچن ، ئێشـــکگری لەســـەر بنەوانی جۆگەکە دەگرن، لەنیوەی شـــەودا یەکێک دێت ئاوببڕێ، ئەوانیش هێرشـــی بۆدەکەن و هەرلەوێ دەیکوژن، کەســـەیری کوژراوەکە دەکەن دەبینن کوڕی میرشەڕکە، تازە کارەساتەکە رووی داوە، بۆیە وابیر دەکەنەوە کەوا چ بە میرشـــەڕک بڵێن، بۆیە دەســـت و پێوەندەکانیان هێرش دەکەنە ســـەرماڵی میرشـــەڕک و قەتلوعـامیـان دەکەن و میرشـــەڕکیش دەکـوژرێ، لەوە بەولاوە حـوکـم حـوکـمـی بـنەمـاڵەی ئەمبێزخان دەســـت پێدەکات و بانگەوازی حوکمدارێتی بەتەواوی خۆشـــنـاوەتی بڵاو دەکەنەوە کەوا مـیری خۆشـــناوەتی میر ئەمبیزەو دەســـتەلاتی کۆمپلیتی ئەو ناوچەیە دەگرنە دەســت، لەوەبەولاوە خەڵک ســـەریان بۆ

میرئەمبێزدانەواندو پاش ئەو رووداوە تەواوی خۆشناوەتی داگیرکرد و دابەشی سەر سێ کوڕەکانی کرد.

١-میرئـاودەل کرایە میری نـاوچەی(پشـــتکەری)، واتـا ناوچەی بێتواتە و هەرمک، کەچەندین گوند لەخۆدەگرێت، دواتر لەبێتواتە نیشتەجێ بوون و لەهەرمک نەمان.

٢-میریوسف: لە بەشی رۆژهەلاتی بالیسان دانراو بوو بە میری نیوەی بـالیســـــان و ئەو گونـدانەی رۆژهەلاتی بالیســـــان. تا دەگاتە تەواوی گوندەکانی بەرانبەر بەو گوندانەی کەدەیگرێتەوە.

٣-میرمەحمەل: رۆژئـاوای بـالیســـــان و ئەو گونـدانەی رۆژئـاوا تـاکوو دەگـاتە گونـدەکـانی دەشـــتی هەریرو شەقلاوە ....هتد.میرمەحمەل براگەورەیان بوو.

پاشای بابان چەند جارێک هەوڵیاندا ئەو میرانە بخەنە ژێر رکێفی خۆیـانەوە، بەلام لەدواییـدا بەهۆی نـاکۆکی نێوان میریوســـف و میرمەحمەڵ کەلەســــەر بەشــــەڕهـاتنی منداڵەکـانیـان ، نێوانیـان تێک چوو، بـابـانیەکـان ئەمەیـان بەهەل زانی و توانیان دەست بەسەر ناوچەکەیاندا بگرن.

نووســـــەری کتێبی(خۆشـــــناو و خۆشـــــناوەتی)، (کەمال خورشید میران)نووسیویە:

دەوران هەروایە، کەس هـاودەمی دۆران نییە، خەڵـک سـەریـان بۆ ئەمبێز و حوکمەکەی دانەوانـد و کەوتنە جنێودان و بوختـانکردن بەمیر شـەڕک، هەزار نـاو و ناتۆرەیان بۆ هۆنیەوە، لێرەدا گومانێک دروسـت دەبێ، پێناچێ ئەوانەی میر شـەڕکیان ناسـیوە و لەژێر حوکمی عادیلانەی ئەودا ژیانیان کردووە، ئاوا لەناکاو و بە کون فەیەکونێک بکەونە تـانەو تەشـەردان لەمیر شـەڕک، بەڵگەشـمان بۆ ئەوە ئەوەیە، تا ئەو دواییانەش ئەوانەی بەتەنیشت گۆڕستـانی هەرمکدا تێدەپەڕین، کە دەگەیشتنە لای گۆڕی ئەمبێز، ئەیـان گوت(فـاتیحـایەک لۆ ئەوێ مەقبەرێ، ئەمبێزم لێهەردا دەرێ).

# شەڕی سکتان

کاتی خۆی (بیتوێن) و زۆر شـوێنی تر چۆڵ بوون، تەنها کشتوکاڵیان لێ دەکرد، بەتایبەتی دەشتی بیتوێن زۆربەی دەکرایە برنج، دوای ئەوەی پـاییزان برنجەکە دەهـاتە بەرهەم، برنجەکەیـان کۆدەکردەوە و دەیـانبردە گونـدی (سـکتان) و لەوێ عەنبار دەکرا، ئەو کاتە سـکتان سـەر بە ئیمارەتی سـۆران بووە و میر محمد پاشـای رواندز سـەرپەرشـتی دەکردن، هەروەها سـکتان سنووری نێوان ئیمارەتی سـۆران و بابانیەکان بووە، پاشـای بابانیەکان فەرمـان دەردەکـات بۆ فراوانکردنی دەسـتەڵاتی هێرش بکەنە سـەر سـکتان و بیخەنە ژێر رکێفی خۆی، هێرش دەست پێدەکات، دیارە ئەو کاتە وەرزی زستان بووە، بەم زسـتانەخەڵکی سـکتان هەڵدێن و دەچنە رواندزلای میر محمد.میرمحمد کەچاوی بەو ماڵ و منداڵە دەکەوێت زۆر توورە دەبێت، بۆیە پاشـای کورەی رواندز فەرمان بە (رەسـوڵ بەگی)برای دەکات کە هێز کۆبکاتەوەو هێرش بکەنە سـەر لەشـکری بابانیەکان، بەرەسـوڵی برای دەڵێت(من وام دانابوو کەلەگەڵ بابانیەکان رێک بکەوین و بەیەکەوە وڵات لە بێگانەکان پاک بکەینەوە، بەڵام وادیارە

لەخۆیان بایی بوونەو بڕۆ هێز ببە و هێرشیان بکە سەر و تاکوو زێی کۆیە راویان بنێ).
لەشکری بابانییەکان چواردەوری قەڵای سکتانیان دابوو، ٤٠ کەس لەخەڵی سکتان کەسەر بە پاشای کۆرە بوون لەناو قەڵاکە خۆیان قایم کردبوو، وەدوو ژن بەنهێنی ئاو و خواردەمەنیان بۆ دەبردنە ناو قەڵاکە.لەشکری بابانیەکان زۆر (کۆلکە مێو)یان بڕیبوو و تۆپیان لەسەر قایم کردبوو، ئەو کەسەی کە تۆپەکانی دەهاویشتن خەڵکی لای سلێمانی بووەو تۆپی دەگرتنە قەڵاکە، بەنهێنی خەبەر دەنێریتە لای ئەو ٤٠ کەسەی ناو قەڵاکە و دەڵێ(من ژنم سکتانیەو خوشکەکەشم شووی بەسکتانیان کردووە، فەرماندەکەم هەڕەشەم لێدەکات و پێم دەڵێ تۆ وەکوو پێویست تۆپ ناهاوێژیەناو قەڵاکە، لەبەر ئەوە پێم باشە کە قەڵاتەکە چۆڵ بکەن) بۆیە ئەوانیش دەڵێن راست دەکات یەکسەر قەڵاکە چۆڵ دەکەن.
دوای ئەوەی کەلەشکری بابانییەکان دەچنە ناو قەڵاتەکە ، سکتان دەسووتێنن و دەگەڕێنەوە کۆیە.
لەو لاشەوە رەسووڵ بەگ کە بە پیاوێکی ئازا ناوبانگی دەرکردبوو و لە هیچ هێزێک نەدەگەڕایەوە بە لەشکرێکی زۆرەوە هێرش دەبات بۆ سەرکۆیە، ئەو کاتە بابانییەکان

لە قشـــڵەی کۆیە بوون، خەبەریان پێ دەدرێ لەشـــکری (پاشای کورە) گەیشتە دەروازەی کۆیە، هێرشەکە ئەوەندە لەناکاو بووە تەنانەت بابانییەکان نەیان توانیوە تۆپەکان دابنێن، بۆیە راو دەنرێن و تـاکوو لەئـاوی زێی دووکـان دەیان پەڕێننەوە و دوکان دەبێتە سنووری نێوانیان.

ئینجا ڕەســـوول بەگ خەبەر بۆبرایەکەی دەنێرێ بەناوی (فەتحی کۆیە)ئەویش وەسـتا(برایمی ماوەرانی) دەنێرێ بۆ دروســـتکردنی قەڵات لە (بۆگدو ســـارتکە و دەربەندی گۆمەسپان و دەربەندی رانیە و دوکان).

پاشـــای کورە(میرمحەمەد) لەدەوری خۆی و لەو مـاوە کـورتەی دەســــتەڵاتـی (١٦٠) قـونـگـرەو قەڵاتـی دروستکردوون.

هەردەربارەی مێژوو و شـوێنەوارو دانیشـتوانی سـکتان ، بەڕێز (عبدالله احمد سکتانی)لەنووسینێکدا دەڵێ:

سکتانییەکان خەڵکی رەسەنی سکتانن و لەهۆزی گەورەی خۆشــــناون، بەپێـی لـێکـۆڵـینەوە وردەکـان و ئەو ســـەرچاوانەش کەلەبەر دەســـتدان ریشـــەو رەچەڵەکی خەڵکی ســـکتان لەکوردســـتان دەگەڕێتەوە بۆدەوروبەری ١٠٠٠ سـاڵ بەر لە ئێسـتا، کەدەکاتە سـەردەمی خیلافەتی عەباسیەکان و ماوەی دەستەڵاتی تورکە سەلجوقیەکان.

لەدەوروبەری ساڵی ١٣٥٠ ی زایینیدا فەقێ جەعفەر خۆی و پێنج لەکوڕەکانی بەناوەکانی (میرعمر یان میر ئۆمەری کوڕەگەورە، میرخـدر کوڕی نـاوەنجی، میرمـامەر، میر مەحمەر، فەقێ زوبێر)دەچنە ســکتان و دیارە دەوڵەمەند بوونەو بۆیە هەموو زەوییەکانی ئەوێیان کڕیوەو دابەشـی هەر پێنج کوڕەکەی کردوەولەوکاتەوە تـائێســتـا نەوەو دوای نەوە نیشــتەجیی ئەم شــوێنەن، وەهەندێ لەتیرەی وەکوو(عەبابەکری و فەقێ رەســوولی و کوێخا حســنی برایمـاغـاو حەمەدبەگی) جیـابوونەتەوە، بەڵام هەموویـان خەڵکی سکتانن و نەوەی ئەم پێنج کوڕەن.

ریشـــەی ســـکتانییەکان لە ســـوڵتان عبداللەوە تا فەقێ جەعفەر:

سوڵتان عبدالله

قاسم

غازی

حسین

سەید بەتەل

فەقێ جەعفەر١٣٥٠

میرعمر- میرخدر- میرمامەر- میرمەحمەر- فەقێ زوبێر.

ئێستا سکتانیەکانی نەوەکانی فەقێ جەعفەر وەچەیەکی زۆریان ناوەتەوە ، بەقسەی عبدالله احمد سکتانی لە شەش هەزار کەسی تێپەڕاندووەو لەزۆربەی پارێزگاو قەزاو ناحیەکانی هەرێمی کوردستان و پاریزگاکانی عیراق و سوریاو ئیران و تورکیاش دا هەن.

لەولاتی مەغریب گوندێک بەناوی (سکتان)هەیە و وەکوو خەڵکی ئەو گوندە باسیان کردووەو ئەڵێن:

ناوی گوندەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی زانای گەورە (عیسی کوڕی عبدالرحمن سکتانی ساڵی ١٠٠٦ز کەدەکاتە زیاتر لەهەزار ساڵ لەمەو بەر)کە چۆتە مەغریب.

وەدەربارەی شوێنەوار و کۆنی سکتان ناوبراو نووسیویە: گۆڕستانی داری دەرگەی کەوتووەتە باشووری ناحیەی سکتان بەرانبەر(خڕێ کونە قیڕی) لەسەر گردی دەگەی هەڵکەوتووە، بەڵام پێشتر هەروەک (تاهیر حەوێزی) دەڵێ:( ناوی ئەصحابەی دەرگەی) بووە، جگە لەو گۆڕستانە چەندان گۆڕستانی تر هەن لەم ناوچەیە کە هی سەردەمانی فەتحی ئیسلامە، بەناوی ئەصحابە مەشهوورن، گۆڕستانەکانی تریش هەر یەکە و هی سەردەمێکە.

بەپێی وتەی پیاوانی دنیادیدەو سەرچاوە مێژووییەکان ئەو پارچەگۆزانەی کەلەو ناوچەیەدا دۆزراونەتەوە لێکۆڵینەوەیان بۆ کراوەو دەرکەوتووەکە هەندێکیان مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانی پێش زایین، وەهەندێکی تریشیان بۆ ٩٠٠ ساڵ زیاتر لەمەوبەر، وەکوو باسدەکرێ و دەرکەوتووە ئەم ناوچەیە شار بووە، ناویشی شاری(مەراتوو)بووە، شوورایەکی گەورە لەدەوروبەری شارەکەدا هەبووەو تا ساڵەکانی شەستەکانی سەدەی رابردوو شوێنەواری شوورایەکە مابوو، بەڵام بەهۆی هێنان و کردنەوەی رێگای گشتی هیران – رانیە تێکدراوە، وەدەرگایەکی گەورەشی هەبووە بۆ هاتوو چۆی خەڵک، هەروەها رێگای کاروان سەرابووە لەگەڵ (چیوەو بالیسان و هەریرو رواندز)

لەو سەردەمەدا وەک دەرکەوتووە لە توێژینەوەکان پێدەچێت ئەم شارە لەسەردەمی خەلافەتی ئیسلامی بووە، بەتایبەت(عەباسی و ئومەوی)واتەلەساڵانی(٤٢٠ک—١٠٠٠)زایینی ئەم شارە هەبووە، ناوچەیەکی بازرگانی گرنگ بووەو چەندەها دوکان و قەیسەری لێهەبووە،

بەپێی زۆری گۆڕستان لەو شوێنە پێدەچێت ئەم شارە قەرەباڵغ بووبێ، واتا ٢٥—٣٥ گوندی کۆنی لەسەر بووە،

ئەوانیش گوندەکانی (خەزێنە، گردی ســـونەبیان، بلاروک، کانی کفرۆک، گۆڕەزەنگ، قەڵاتگە، قەراتە رەش و هیتر)، ئێســـتا هیچ یەکێ لەم گوندانی ئاوەدانیان تیادا نیەو تەنها شوێنەواریان ماوە.

سـاڵی ١٩٤٨ تیمێکی بیانی بە هاوڕییەتی چەند شـوێنەوار ناسێکی عیراقی هاتوونەتەخۆشناوەتی لە ( توتمە ) چونکە ئەو کاتە (مەخفەرێکی پۆلیس) لە توتمە بووە بۆیە شـــەو هـاتوونەتەوە ئەو گونـدە، چەنـد رۆژێـک مـاونەتەوە و ســەردانی چەند شــوێنەوارێکی دۆڵی بالیســانیان کردووە وەکوو(گردی کانی کەڵەک، گردی بـالووکـاوە، ســـــاریج، گردی دێگەو شـلیمۆن و گابڕە) تاوەکوو درەنگانی ئێوارە ئەم تیمە کاریان کردووەو بەشوێنەوارەکان ئاشنا بوونەو دواتر رێپۆرتـاژێکی دوورو درێژیـان دەربـارەی ئەنجـامی کارەکەی چەند رۆژەیان داوەتە لایەنی ســەرووی خۆیان و گۆڤاری ســۆمەری عیراقی لەســـاڵی پەنجای ســـەدەی رابردوو بڵاو کردۆتەوەو ئەڵێن:

لە ئەنجامی سەردانی چەند رۆژەی لە یەکێک لەناوچەکانی باکووری عیراق چەند شـوێنێکی دیرۆکیمان پشـکنی و بە دیـارکەوت کەوا گردەکـانی (کـانیی کەلەک و بـالووکـاوەو دێگەو گردی شـلیمۆن و قەراتگەی نێوان شـێخوەسـانان و

کانی بەرد) بەتایبەتی گردی باڵووکاوە دەرکەوت کەوا ئەم شوێنە بەرلە چەند سەدەیەک قەڵایەکی زۆرگەورەو پتەو لەسەرگردی باڵووکاوەدا هەبووەو بەپێی پشکنینەکان دەرکەوت کەلەناو قەڵاکەدا ئێسک پرووسکێکی زۆربەدی دەکرێ، بۆیە وای بۆدەچین کەوا بەسەریاندا رووخێنرابێت.هەروەها دەربارەی گردی دێگە مامۆستای خوالێخۆشبوو مەلا(عبدالسلام حیدری) لە کتێبی (چەند لاپەڕەیەکی ون لەمێژووی کورد)دا دەڵێ:

سێ هەزار ساڵ بەر لە ئێستا گردی دێگە ئیمارەتێکی کوردی لێ بووە، ئەمیری ئەو ئیمارەتە ناوی (دێگەشا)بووەو حوکمی ئەو دەڤەرەی کردووە، پاشان لەلایەن سوپای ئەفراسیاب لەناو چووە.ناوی (لەندەهۆر)لەخۆشناوەتی زۆر بەکاردێ، وەکوو باسدەکرێ ، دوای رووخانی دێگەشا لەندەهۆر حوکمی ئەو شوێنەی کردبێ و دواتر ئەو گردەیان بەسەردا دەرووخێنن، بەڵام دیار نییە کامە سوپا هاتووە بۆ تێکدانی گردی دێگە.

هەروەها گردی: (شلیمۆن لە ڕۆژاوای بالیسان هەیە، شوێنێکی ئەسەریە و پێدەچێ لە ناوەکەیەوە لەسەردەمی ئاشوورییەکان (شلیمۆن)پاشا لەوێ ژیابێ).

لەلایەکی تریشـــەوە ئەو تیمەشـــوێنەوار ناســـەی ســـاڵی (١٩٤٨)هاتبووە خۆشـــناوەتی ســـەردانی (قەراتگەی نێوان شـــێخوەســـــانـــان و کـــانی بەرد)یـــان کردووەوبەپێی لێکۆڵینەوەیەک نووسیویانە، قەراتگەو گورگان دووشوێنی زۆر کۆنن و مێژووەکەیان بۆ دووهەزار ساڵ بەرلەئێستا دەگەڕێتەوە، پاشـــماوەی دانیشـــتوانی ئەم دوو شـــوێنە پێـدەچـێ دوای وێـران بـوونـی قەراتـگەو گـورگـان ، (بێراوە)ئاوەدان کرابێتەوە، گوندی بێراوە بەهۆی کۆنیەوە، بە(دایکی گونـدەکـان دادەنرێ(ام القری) ، چونکە چەنـدین گوندی دەوروبەری وەکوو (گوندەکان شیرەی سـەروو و خـواروو و خـۆران و کـانـی بەردو کەنـدەســـــۆرو گورگان)هەموویان خەڵکی ڕەسەنی بێراوەن،
بێوران شوێنێکە کەوتۆتە بەرانبەر توتمە بەپێی سەرچاوە مێژووییەکـان بێوران گونـدێکی گەورەبووە بێوران کەوتووەتە سەر ڕووبارێکی بچووک و کاتی خۆی لەسەر دەســـتی کابرایەکی مەســـیحی دروســـت کراوە بەناوی: (ئەرمەن لەنتی یۆنان) ، هەروەها ســەرچاوە مێژووییەکان باس دەکەن خەڵکی گوندەکە بەشـــێوەیەک دەدوان کە نووســەرەکە لێیان حاڵی نەبووە، دیاربووکە کوردی بووە، دواتر لە لایەن ســـــوپای تەتەر وێران کراوە، یەکێک لەو

زانـــاو عـــاقڵمەنـــدانەی بێوران (عبـــدالمليـــک عەبـــدەی بێورانی)بوو کە شـــــەیدای کۆکردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) بوو بۆئەم مەبەستە گەڕیدەیی هەڵبژاردوەو لەخوراســـانەوە بۆتەبەرســـتان گەڕاوەو لەبوخارا ئەمری خوای کردووە.دوای رۆیشـــتنی ســـوپای تەتەر خەڵکەکە دەچن (کۆریان)ئاوەدان دەکەنەوە کە کەوتووەتە بەرانبەر بێوران. ساڵی ١٩٩٣ کابرایەکی بیانی کە پێدەچوو جولەکە بووبێ هـات لە شـــوێنی کۆریـان بەهۆی نەخشـــەیەک کوپەیەکی زێڕی دەرهێنا لەبەر چاوی چەندین کەس.

لە ناوەڕاســـتی ســـەدەی شـــازدەدا کەســـێکی زۆردار بەناوی(ئەحمەدبەگی مراری) دەستەلاڤت دەگرێتە دەست ، لەچیای ئەوبەری توتمە ولە(ســـاریج) تەختێکی شـــاهانە دروســـــت دەکات و بیرێکی ئاو لێدەدات کەتا ئێســـــتاش مـاوەو دووســـــەنگەریش لەم بەرو لەو بەری ســـــاریج دروســـــت دەکات کە ئێســـــتا بە قەڵاتە کافر ناودەبرێت، مەبەســت لە بەکارهێنانی وشـەی کافربەهۆی سـتەمکاری ئەحمەد بەگەوە بووە ، دوو کچی هەبوون بەنـاوەکـانی (زێنە و زەمبەر) نـاوی زێنە ئێســـتـاش بەکاردێت و بە شـــوێنێک دەوترێت کەلە خوارووی ســـاریجە، هەروەها وەکوو بـاس دەکەن حەوت کوڕی هەبوون ئەو کوڕانە

ئەوەندە بەهێزبوونەو کەس دەرەقەتیان نەهاتووە، بەهۆی هەڵکەوتەی ساریج کە شوێنێکە زۆر ستراتیجەو هەموو دەشتی توتمەو بالیسانی لێوەدیارە، بۆیە کەس نەی وێراوە بێ سەرانە سەندن بتوانێ بەو دەشتەدا گوزەربکات، وەتەواوی ناوچەکەی لەژێردەستدا بووە، ئەوەی لێشی یاخی بووبایە ئەوا بێگومان یان ئەوەتە دەی کوشت یان لە کوپکی زیندان زیندانی دەکرا، کوپکی زیندان لەسەر بەرزاییەکە بەرانبەر توتمەو بناغەی خانووەکە ماوەو هەروەها زیندانەکەش ماوەو پڕە لە ئێسک پرووسک، هەروەک باس دەکەن ئەڵێن کانی کەلەک ئەو وێرانی کردووە چونکە ئامادەنەبوونە بە دانی سەرانە، دوای ماوەیەکی زۆر لەدەسەتەلات ساڵی ١٧١٣ نەخۆشی (تاعوون) پەرەی سەندو خەڵکێکی زۆر بەم نەخۆشیە سەری نایەوە، بنەماڵەی مراریش لەناوچوون، بەم شێوەیە سەردەمی مراری بەسەر چوو.

لەسەردەمی عوسمانیەکان نەهامەتیەکی زۆرلەگەڵ هاتنی ئەوان رووی لە ناوچەکە کردووە بەجۆرێک هەموو دانەوێڵەیەکیان بردووەو ئەوەی پێشیان نەچووبێ هەروەک باس دەکەن دانەوێڵەکانیان تێکەڵ یەک کردووە، بۆیە خەڵکەکە بیریان لەچارەیەک کردۆتەوە هەڵساون ئەو

گەنم و دانەویلەیەی کەبەرهەمیان دەهێنا لەچاڵیان دەکرد لەژێرزەوی، مێژووی هەڵکەندنی چاڵ بۆ سەردەمی عوسمانییەکان دەگەڕێتەوە.
لەگرانی گەورەدا ئاوارەیەکی زۆر رووی لە خۆشناوەتی کردووە دیارە ئەو ساڵە لێرە هات بووە و باشتربووە لە جێگاکانی تر.
ساڵی ١٩٢٠ لەترسی هێرشی ئینگلیز دانیشتوانی توتمە گوند چۆل دەکەن و لە دۆڵی نیشاو کە کەوتۆتە ژێر چیای کڵاو قاسم دەگیرسێنەوە و لەوێ هەندێ خانووی سادە دروست دەکەن و چەند رەزێک دادەنێن ، دیارە رەزەکانی نیشاو بەروبوومیان باش بووە بۆیە دەیان گوت:

ئەوەی رەزەکی هەبی لەنیشاوێ جۆخینەکی
هەیە لە شیناوێ

شیناوە گوندێکە لە دەشتی هەریر و لە نزیک سیساوەیە، دیارە جۆخینی شیناوە بەناوبانگ بووە بۆیە بەراوردیان لەگەڵ جۆخینی شیناوە کردووە.

# دەشتی مەرگووڕ و حمەرمامزان

بنەماڵەیەک لەبێوران لەدەشـــتی توتمەدا هەبوون بەناوی (بنەماڵەی شـــەمزین)ســـێ کوڕی هەبوونە بەناوەکانی (تـاژدین و مـامیـل و عەمەر) (عەمەر) دواتر نـاوەکە گۆڕانکـاری بەســـەردا هـاتووەو بۆتە(حمر) ئەو گەنجە لەرۆیشـــتنـدا گەلێـک خێرا ڕۆیشـــتووەو نـازنـاوی (حمەرمامزی) بەســـەردا ســـەپێنراوە، (شـــەمزین) .خاوەن زەوی و زارێکی زۆر بووە بەجۆرێـک بـاس دەکرێ کەهەموو زەویەکـان زۆربەی هی ئەو بنەمـاڵەیە بووە، چەند ماڵە جولەکەیەکیش لە(کۆریان) هەبوونە کەکەوتۆتە بەرانـبەر بـێـوران ، کـچـی یەک لە جـولەکەکـان نـاوی(مەرگووڕ) بووە، (حمەر مـامز) حەزی لەو کچە جولەکەیەکردووە، چوونەتە داخوازی، گوێیان بەجیاوازی ئایین نەداوەو مەرگووڕ یەکەم مەرجی ئەوە بووە کەدوای موسلمان بوونی داوای ئەو دەشتەی کردووە لە بنەماڵەی شـــەمزین بەرانبەر مارەیی و شـــووکردنی بە حمەر مامز، ئیدی رێک دەکەون و پارچە زەویەکیش لەباشـــووری خەتی دەبێ ئەویش هی بنەماڵەی شـەمزین بووە، دەدرێتە مەرگووڕو بەم شێوەیە ناوی لێنرا، لەتوتمە چەند شوێنێک

هەن گەواهی ئەوە ئەدەن کە بەناوی ئەو شـــەمزینە نرابن وەکوو:

١-بەردی کاشـەمسـەی ، لەبنەرەتدا بەردی کاک شـەمزین بووە، دواتر گۆڕانکاری بەســـەردا هاتووەو بۆتە بەردی (کاشەمسەی)چونکە لەسەر زار ئاسانترە.

٢-کانیێ کۆری شەمزینی

٣-کانیی باشەمزینی

٤-کۆمێ مامێ زینی.

خۆشناوەکان و گەرم بوونی ئێواران

لەمێژووی هاوچەرخی کوردســـتاندا ووتەیەکی کلتووری هەیە ، کە ئەڵێن:خۆشـــناوەکان لەدوای نیوەڕۆیان گەرم ئەبن، یان ئەڵێن شێت ئەبن.

راســتی ئەم بەســـەر هاتە لە جەنگێکی مێژووییدا هاتووە، سـەردەمی جەنگی جیهانی یەکەم بووە، سـوپای روسـیای قەیســەری(عرووس) هێرشـی هێناوەتە سـەر کوردسـتان، تـانزیـک رواندز هـاتووە، ئەو شـــارەی لەســـەردەمی میرمحمدی پاشـای گەورە پایتەختی میرنشـینی سـۆران بووە، لەپێناو پاراســتنی ئەم شــارە مێژووییەو بۆئەوەی شـــوێنەوارو کلتووری ئەم گەلە بپارێزن، پیاو ماقوولانی رواندز، پەیامێکیان بۆ سـەرجەم هۆزو عەشیرەت و پیاوە

ناوداره‌كانی ده‌ورو به‌ر ناردووه‌، تیایدا داوایان كردووه‌ كه‌وا هێز كۆبكه‌نه‌وه‌و به‌هانای رواندزه‌وه‌ بێن و له‌ده‌ست و په‌لاماری دوژمنان بیان پارێزن، ئه‌و سه‌رده‌مه‌ش هێز ته‌نیا هێزی عه‌شایه‌ر بووه‌، هه‌رعه‌شیره‌ته‌و هێزی تایبه‌تی خۆی هه‌بووه‌، له‌به‌رانبه‌ر ئه‌و داواكاریه‌ی پیاو ماقوولانی رواندز، هه‌رعه‌شیره‌ته‌و هێزو چه‌كداری خۆیان كۆده‌كه‌نه‌وه‌و به‌هانای رواندزه‌وه‌ ده‌چن، له‌هه‌ڵمه‌تێكی فراواندا هێرش ده‌كه‌نه‌سه‌ر سوپای داگیركه‌ری رووس، توانیان تێكیان بشكێنن، له‌شاره‌كه‌ دووریان خسته‌نه‌وه‌، ئه‌مجاره‌ رووسه‌كان هێرشێكی پێچه‌وانه‌یان كرده‌وه‌ سه‌ر هێزه‌ كوردیه‌كان وله‌سه‌روبه‌ندی داگیركردنی رواندزدابوون، به‌ڵام ئه‌وه‌نده‌ شپرزه‌و ماندووبووبوون نه‌یان ده‌توانی رێ بكه‌ن، گردێك كه‌سووپای رووسه‌كانی لێ بووه‌، زۆربه‌ی عه‌شیره‌ته‌كان هێرشیان بۆ كردووه‌، به‌ڵام نه‌یان توانیوه‌ بیگرن، دیاره‌ ئه‌وكاته‌ دوای نیوه‌ڕۆیه‌كی دره‌نگ بووه‌، كه‌نۆره‌ خۆشناوه‌كان بووه‌، خۆشناوه‌كانیش هێرشێكی مه‌ردانه‌ ده‌كه‌نه‌ سه‌ر گرده‌كه‌، هه‌رچه‌نده‌ هۆزه‌كانی تر داواده‌كه‌ن كه‌به‌م ئێواره‌یه‌ هێرش نه‌كه‌ن، چونكه‌ دره‌نگه‌، به‌ڵام خۆشناوه‌كان گوێ به‌ داواكه‌یان ناده‌ن و هێرش ده‌كه‌ن، ئیدی له‌هه‌موولاوه‌ له‌نێو

عەشیرەتەکاندا دەبێتە هوتاف و پیاهەڵدان و ئەڵێن خۆشناوەکان گەرم بوونە، بەم شێوەیە پەلامارەکەیان ئەنجامداو سەرکەوتنێکی مەزنیان بدەست هێنا.

دەربارەی ئەم نازناوە ، عەشیرەتی (هەرووتی) ئەڵێن: ئێمە بووینە ئەم هێرشەمان کردووەو گردەکەمان لەدەستی عرووس رزگار کردووە، چونکە هەمان ناو بەهەرووتیەکانیش دەووترێ، کە پاش نیوەڕۆیان گەرم دەبن، تائێستا ئەم مشتومڕە هەیە، تائێستا بەتەواوی ساغ نەبۆتەوە کەئایا خۆشناوەکان بوونە یان هەرووتیەکان، هەرچەندە عەشیرەتی هەرووتی عەشیرەتێکی زۆر گەورەنین ، بەڵام ئەوانیش جێپەنجەیان لەبزاڤی رزگاری گەلی کوردا هەیە.

# سەردەمی عوسمانییەکان

ئەم سەردەمە بەناخۆشترین کات زانراوە، کە عوسمانییەکان هاتوونەتە خۆشناوەتی، چونکە هەڵسوکەوتیان زۆر دوژمن کارانەبووە، هەرچەندە بەشێکی گەورە لە گەلی کورد بەهۆی ئەوەی عوسمانییەکان بانگەشەی دەوڵەتی ئیسلامییان دەکرد، کوردیش لەرووی ئایینەوە زۆر پابەندبووە، لەم پێناوەدا پشتگیرییان لە دەوڵەتی عوسمانی کردووە، وەکوو پیر و بەساڵاچوانی خۆشناوەتی باسیان کردووە، عوسمانییەکان لەپێناو مانەوەی خۆیاندا دەستیان لەهیچ شتێک و پیرۆزییەک نەپاراستووە، لەسەردەمی گرانیدا چەکدارانی دەوڵەت هەڵساون بەتاڵانکردنی هەرچی بەردەستیان کەوتبا، شیعاریان ئەوەبووە(بائێمە لەبرسان نەمرین، هەرچی دەبێ بابێ)، هەڵساون بەدانانی چەندین باج لەسەر خەڵکی گوندنشین، وەکوو مێژوو باس دەکات تەنانەت باجی ئەوەیان داناوە کەکەسێک قەڵەو بوایە دەبوایە باج بدات، کەپێیان دەوت(سمتانە، قونانە) ئەوەی سمتی گەورەبایە، باجیان لێدەسەند، جگە لەوەش هەرچی ئازووقە و کەلوپەلی خواردن لەماڵان هەبوایە دەیان برد،

یـان ئەگەر پێشـــیـان نەچووبـایە ئەوا خواردنەکـانیـان لە(هەمبـانە)کـان دێنـا دەرەوە و لەگەڵ خۆڵیـان تێکەڵ دەکرد، لەهەنـدێ شـــوێن و گونـدی خۆشـــنـاوەتی خواردنەکـانیـان کۆکردۆتەوە و نەوتیـان پێداکردووە، بۆ ئەوەی کەس ســـوودی لێنەبینی. ئەم داگیرکـاریەی عوسـمانییەکان کەلەسـاڵی ١٨٣٦ ز دەسـتی پێکرد تاکوو ســـاڵی ١٩١٨ز خایاند، چەندین کارەســـات و ماڵوێرانی رووی لە کوردســـتان بەگشـــتی و ناوچەکە کرد، وەکوو هێرش بۆ ســـەر ئیمارەتی کوردی ســـۆران لەرواندز، کە تـاکە هیوای گەلی کورد بوو، بەنـاوی ئـایینەوە لەنـاویـان برد.

جگە لەوەش دەســـتیان بۆ ئابڕوو و ناموســـــی خەڵک درێژکردووە، هەروەک (بەختیـار دواوەیی) لەکتێبی (خۆشـــناوەتی لە ســـەدەی بیســـت و یەکدا)کە لەزاری بەساڵاچوانی گێڕاوەتەوە، لەلاپەڕە(٢٣)دا دەڵێ:

لەســـاڵی ١٩٢٠دا کاتێ تورکەکان لەشـــەڕی ئینگلیزدا شـکاون لە (بیتوێن)، بەمەبەسـتی دەربازبوونیان بۆ دۆڵی بـالیســـان، کـاتێـک دەگەنە گونـدی(نواوە)یەکێـک لە ئەفســـەرەکانیان دەچێتە ماڵێک، داوای کاو ئالیکی لەژنی خـاوەن مـاڵ کردووە بۆ ئەســـپەکەی، ژنەکەش جوان و

پێش چاو و ســــوور و ســــپی بووە، بۆیە لەکاتی ژنەکە دەچێتە (کــادین)بۆ هێنــانی ئــالیــک، دوابەدوای ژنەکە ئەفســــەرەکەش بەدوایدا دەچێ، دەســــت درێژی دەکاتە ســــەری، ژنەکەش زۆر مەردو ئازابووەو هەردوو گونی ئەفســەرەکە دەگرێ، بەهەموو هێزی خۆی دەیسـوڕێنێ و بەری نــادا تــاکــوو ئەفســــەرەکە دەمــرێ، تەرمەکەی لەژوورەوە بەجێدێڵێ ، دواتر ئێوارێ مێردەکەی دێتەوەو بەســــەر هاتەکەی بۆ دەگێڕێتەوەو هەربەوشــــەوە تەرمی ئەفسەرەکە دەبەن و ژێر خاکی دەکەن.

تورکەکـان لەســــەردەمی جەنگی یەکەمی جیهـان (نەفیر عام)یان ڕاگەیاندووە، کەبە(سەفەربەلک) بەناوبانگە، شوێن نەماوە لەم کوردســتانە بەتایبەتی خۆشــناوەتی کەنەیکەن بەســــەربازو ڕەوانەی بەرەکانی شــــەڕ لەگەڵ ئینگلیزیدا نەکەن، چەندین کەس ئێستاشی لەگەڵ بێ نەهاتوونەتەوەو بێســەرو شــوێن بوونە، هەندێکیشــیان هەرچۆنێک بووە پاش چەند ســــاڵێک خۆیان گەیاندۆتە ماڵەوە، نموونەمان زۆرن ، وەکوو لەشــــەقڵاوە چەنــدین کەس چوونەتە ســەفەربەلک، جیاوازیش نەکراوە لەنێوان مەســیحیەکان و موســــڵمانەکان، هەندێ کەســــیش وەکوو(ســـۆفی برایم لەشــەقڵاوەو حاجی ڕەســـوڵ لەبالیســــان و چەندانی تر ،

لەکاتی شکانی سوپای تورک لەبەسرابوونە، هەڵاتوونە و گەڕاونەتەوە بۆ وڵاتی خۆیان. هەندێکیان چوونەتە وڵاتی حیجاز و زیارەتی کەعبەشیان کردووە ئینجا گەڕاونەتەوە.

# هاتنی سوپای ئینگلیز

دکتۆر خەلیل علی موراد لەبابەتێکیدا کەلە ئینسـکلۆپیدیای هەولێر لاپەڕە ١٣٧٨دا، بەناونیشـــانی (ئیدارەی هەولێر لەدوا سەردەمی عوسمانیەکاندا.١٨٣٦-١٩١٨)دا دەڵێ:

دواســەردەمی عوسـمانییەکان کەنزیکەی هەشــت دەیەی لەمێژووی هەولێر بەڕێ کرد، هەرلەدەســـــتپێکی دووەم جاری داگیرکردنی شـــارەکە لەلایەن عوســـمانییەکان لەســـــاڵی (١٨٣٦.ز)لەمـاوەی هێرشـــە بەرفراوانەکەی عوسـمانییەکان کردیانە سـەر میرنشـینی محمدپاشـای رواندزی تـا کۆتـاییەکەی بەوەهـات هێزێکی داگیرکەری بەریتـانی پێیـان نـایە شـــاری هەولێر لە١٠ی تشـــرینی دووەمی ١٩١٨دا، ئەو ســـەردەمە لەمێژووی هەولێر تـا رادەیەک ئارامی و سەقامگیری بەخۆیەوە بینی.

ئەگەر تائەوکاتە سـەرانە و باجیان دابێتە عوسـمانییەکان، بەلام بەهاتنی بەریتانیا بۆ هەولێر و دەوروبەری ئەو باج سـتاندنە نەماو خەڵک دەسـتیان کردەوە بەکاروکاسـبی بووژانەوە تەنهـا لەو شـــوێنـانە نەبێ کەبەرنگـاریـان بوونەتەوە، واتا هێزە کوردییەکانی لایەنگری عوســـمانی، هێزەکـانی ئینگلیز بەهەمـان شـــێوە تـالانی مەڕو مـالاتی

خەڵکیان کردووە.هەرلەو سەردەمەدا ئینگلیزەکان دەستیان بەهێرش کردن کرد، بۆدەوروبەری هەولێر، بەتایبەتی بۆ باکووری هەولێر و ئەو شار و گوندانەی کە لە دەوربەریدا بوون، ئەوکات تازە عوسمانییەکان رۆیشتبوون و لەدوای خۆیان ویرانی لەئابووری خەڵک جێهێشـــتبوو، هەروەک تورکەکان کولتوریکیان جێهێشـتبوو کەوا ئەوان دەوڵەتی ئیسلامین، بۆیە زۆربەی عەشیرەت و پیاو ماقوولانی ئەو ســەردەمە خۆیان ڕێک خســتەوە بۆبەرەنگاری ســوپای ئینگلیز، لەبەرانبەردا ئینگلیزەکان بەهەموو جۆرە چەکێک هێرشـــیان بۆفراوان بوونی دەســـتەڵاتیان دەســـتپێکرد، ئێســتاش شــوێنی بۆردومانی فڕۆکەکانی ئینگلیز لەهەندێ گوندی خۆشـــناوەتی جێماون، وەکوو گوندەکانی (خۆران و زیارەت و قەراسنج)لەبناری سەفین.

دیارە لەسنووری بیتوێنەوە هێرشـیان دەسـتپێکردووە بۆ بێتواتە و دۆڵی بالیســـان، یەکەم جار لەکۆیەوە بەســـەر چیای هەیبەت سوڵتانەوە دا هێرشیان کردووە بۆ بیتوێن، دوای پــاک کردنەوەی بیتوێن ئووردووی ئینگلیزەکــان جولێنراوە بۆ دۆڵی قەشــان، ســوپاکە نزیکەی ســێ هەزار ســـەرباز بوونە، هەندێ پیادەو هەندێکیش ســـوار، وەکوو خەڵکانی بەتەمەن باســـیان دەکرد نزیکەی چوار فڕۆکە

لەسەریان دەسوڕایەوە، هەندێ لەسوپای تورکەکان تەقەیان لەفڕۆکەکان کردووە، دواتر پاشماوەی تورکەکان تەفرو توونا کراون.

دواتر (میرانی رەشید بەگ) کەمیری خۆشناوان بووە(بەری پشتگەری)لەگەڵ چەند ریش سپیەک خۆیان دەگەیەننە ئینگلیزەکان ، لە(قەشان) رێککەوتنێک مۆر دەکەن، کەوا ئینگلیزەکان واز لەبێتواتەو دواوەوگوندەکانی تر بێنن، ئیتر سوپاکە بەرەو دۆڵی (بالیسان)دەست بەجوولە دەکەن، لەو کاتەدا لەبناری(شیشار) بیست چەکداری کوردی لایەنگری تورک، تەقە لەسوپای ئینگلیزدەکەن، ئینگلیزەکانیش بەچەند گوللە تۆپێک شوێنەکەیان تۆپباران دەکەن و لەئەنجامدا هەموویان دەکوژرێن، هەروەها چەند کەسێک کەلە کتێبەکەی کاک بەختیار دواوەیی(خۆشناوەتی لەسەدەی بیستەمدالەلاپەڕە(٢٣)دا دەنووسێ، لەبەگزادەکانی گوندی بێراوەبوون و لایەنگری تورکەکان بوونە بەتفەنگەرەشکەبۆسەیان لەسوپای ئینگلیز دادەنێنەوەو تەقەیان لێدەکەن، بەڵام بەگوللە تۆپێک وەڵام دەدرێنەوەو چەکدارەکان تێک دەشکێن، ئیتر سووپا بەرەو دۆڵی بالیسان دەڕواو رەشید بەگی بێتواتە تاکوو بالیسان

لەپێش سـوپـای ئینگلیزەکـان دابووە.لەهەرگونـدێـک بەرەنگاریان بووبانەوە ئەوا گوندەکەیان دەسـووتاند، ئینگلیزەکـان کەلەلای بێتواتەوە پێشـڕەویـان کردو بانگەوازێکیان بۆ خەڵکی دۆڵی بالیسـان بلاو کردەوە، کەتیایدا هاتبوو، هەرگوندێک بیەوێ سـەلامەت بن و نەسووتێن بابچنە دەستەچەپ، واتا چیای هەورێ و کلاو قاسم و بەنی هەریر، ئەوەی بچێتە دەسـتەراسـت واتا رۆژهەلات و باکووری دۆڵی بالیسـان ئەوا گوندەکە دەسووتێنن.

گوندەکانی بالیسان و بێراوەو شێخوەسان بەهۆی ئەوەی هەم شـەڕی ئینگلیزیان کردو هەمیش چوونە رۆژهەلات، بۆیە بەشێکی زۆریان سوتێنران، کەچی خەڵکی گوندەکانی توتمەو بێڕۆو خەتێ چوونە چیـای کلاو قـاسـم، لەدۆڵی(نیشـاو) خانووی کاتیان دروسـتکردن و ماوەیەک لەوێ مانەوە کۆمەڵێک رەزی دێمیان دانان و ئەو رەزە مێوانە بەجۆرێک بوون بەسـەرچاوەی ژیانیان پاش چەندسـاڵێک لەبەری رەزەکەیان خوارد، هەروەک دەیان گوت:

ئەوەی رەزەکی هەبێ لەنیشاوێ<br>
جۆخینەکی هەیە لەشیناوێ

دیارە جۆخینی گوندی شـــیناوەی دەشـــتی هەریر زۆربە بەرەکەت بوونە.
بەم شێوەیە ئەو گوندانەی باسمان کردن لەلایەن سوپای بەریتانی نەسووتێنران.
لەبەری گـونـدەکـانـی (هەرووتـیـان)بەرەنـگـاریەکـی ســەختکراون، بەرەحمەت بێ(شــێخ نەجیم شــێخ کـاکەمین)گەلێـک جـار دەیگێڕایەوە، کەوا فڕۆکەیەکی ئینگلیزەکـانیـان لەخوارووی (هەرووتەکۆن)خســـتبووە خوارەوە، لەبەرانبەردا زۆربەی گونـدەکـانی هەرووتیـان سوتێنران.
دوای ئەوەی کەوا ســوپای بەریتانیا هەموو شــوێنەکانی کۆنتـرۆڵ کرد، ئینـجـا هەوڵیـدا لەڕێگەی ســـەرۆک عەشـیرەتەکانەوە ئیدارەی خۆجێیی هەرشـوێنێک بەئاغاو بەگزادەکـان بســـپێرێ، ئەوەبوو(دەبلیو ئارهەی)حـاکمی سـیاسـی لەسـەردەمی داگیرکاری بەریتانیا، دەسـتی کرد بەگەڕان و سوڕان بۆ هێور کردنەوەی دۆخەکەو سەردانی خۆشـــنـــاوەتی کرد، بەپێی نووســـینەکـانی (دەبلیو ئارهەی)لەکتێبی(دووساڵ لەکوردستاندا) دەنووسێ:
دژایەتیەکی زۆر لەنێوان میرانەکانی خۆشـــناودا هەبووە، هەریەکە ویســـتوویەتی ئەو بکرێتە حاکمی شـــەقڵاوە،

بەجۆرێک دژایەتییەکە گەیشـــتۆتە رادەیەک کەس ددانی بەبراگەورەیی هیچ کامێکیاندا نەناوە، وەباسـی یەکەیەکەی میرەکـان دەکـات و وادەیـان نـاســـێنێ لەدرێژی بـالاو کەڵەگەتی و چۆنیەتی ریش و دەمووچاو و شـــارەزایی میرەکانی خۆشناوەتی لە زمانەکانی تر.

وەکوو نموونەیەک باســی (میرانی باییزبەگ)ێک دەکات و دەڵێ:

بەپێویســـتی دەزانم کەکەمێک بەلادا بچم تۆزێک باســـی خۆشناو بکەم، دەبێ بڵێین: دواسەرۆکی (میرمەحمەڵی)ئەو هۆزە بەتوانایە پیاوێک بوو ناوی(میرانی باییزبەگ)و ئەو پیـاوێکی قەڵەوی کەتەبوو بەجۆرێـک کەجـارێکیـان لەگەشتێک بۆ کۆیە، چوار رۆژی پێدەچێ، کەتەنیا ٣٣ میل دوورە ئەو ســـێ ئەســـپی لەوانەی کەســـواریان دەبوو تۆپاندبوو، خۆیشـــی بەنەخۆشـــی(ئەنفلۆنزا)لەســـەرەتای تشرینی دووەمی ١٩٢٠ مردبوو.

هەروەهـا بـاســـی میرانی قـادربەگ دەکـات و بە(هینری هەشتەم )ناوی دەباو دەڵێ:

ئەو خوێنـدەواری هەرنەبوو و لەزمـانی کوردیش زیـاتر هیچی تری نەدەزانی، بەشـــێوەیەکی گشـــتی ئەو پیاوێکی دەســـتپاک و نیـازپاک بووە، بێگومـان ئەو ســـەرۆکی

خەڵکەکەیەتی، ئەگەر راوێژکارێکی باش یارمەتی بدابایە ئەوا دەبووە سەرۆکێکی نموونەیی.

ئینجا باسی سەرۆکێکی تری خۆشناوەتی دەکات و دەنووسێ:

سەرۆکەکەی دیکەیان (مستەفاغا)بوو، کەخەڵکی(کۆڕێ)بوو، سەرەرای ئەو دەنگۆیەی کەئەو چەندبراو خزمی خۆی کوشتوون، کەچی لەپیاوە هەرەباشەکان بوو کەمن دیومن، ئەو چەند سعاتەی کە لەژێر دارتویێکی دەرەوەی گوندەکە بەسەرمان برد، خۆشترین یادگاری منە لەکوردستان، من لانی کەم لەبارودۆخێکدا بەژیانی خۆم قەرزاری ئەو و پیاوەکانی ئەوم، ئەو لەهەرە ئەو کوردانەبوو کەدوورن لە خۆپەرستی و دڵسۆزن.

بۆئەوەی حاکمی سیاسی بەریتانیا یەکێک دابنێ بەحاکمی شەقڵاوە، دەست دەکات بەجووڵە، بەڵام رکابەریەکی توند لەنێوان میرانی (رەشیدبەگ و قادربەگ)هەبووە، هیچ کامێکیان پێیان خۆش نەبووە ئەوی تر بەحاکمی شەقڵاوە دابنێری، ئیدی ئەو دوو کەسە وارێک کەوتوون کەهەردووکیان بچنە لای مامیان، کپیاوێکی پیرو بەتەمەن بووەو لەبالیساندا دانیشتووە، ئەویش عەزیزبەگ بووە،

وەســـوێند بخۆن کەدڵســـۆزی یەکترن، بەڵام ئەوە رووی نەدا، پێـک نەهـاتنی ئەو دووبرایە بەهۆی ئێرەیی بردن بووە.

لەرۆژی ٢٥ی مانگ ســـاڵی ١٩٢٠ لەلایەن دەبلیوئارهەی بەفەرمی(میرانی قـادربەگ)کرایە حـاکمی شـــەقڵاوە، کەدەســـتەڵاتی بەســـەر هەرســـێ لقەکەی خۆشـناو(هۆزی کۆڕێ)داهەبوو.

لەهەمان کاتدا رەشـــیدبەگ بەفەرمی کرایە ســـەرۆکی لقی(میرمەحمەڵی) و ســـاڵح بەگیش بەرەســـمی کرایە سەرۆکی لقی(میریوسفی)، بەگشتیش قادربەگ سەلماندی کەسەرکەوتووترین حاکمە.

# خۆشناوەتی

خۆشـــناوەتی پانتاییەکی زۆری لەباکووری پارێزگای هەولێر داگیرکردووە، بەگەورەترین هۆز لە پـارێزگـای هەولێر دادەنرێـت وەدووەم هۆزیش لەبـاشـــووری کوردستان دا دێت دوای هۆزی گەورەی جاف، دراوسێی زۆربەی هۆزەکانی هەولێر و دەشـــتی کۆیە و بەشـێکی سلێمانین، وەکوو عەشیرەتەکانی (هەرووتی و سوورچی و خەیلانی و هەرکی و زراری و گەردی و بلبـاس و شێخانی و بۆلی و ئاکۆ).

لەرووی ئیدارییەوە دابەشـی هەردوو پارێزگای هەولێر و سـلێمانی بووە و بۆ سـەر قەزاکانی شـەقلاوەو رواندز و کۆیە و رانیە دابەش بووە، خاوەنی قەزایەکە کە شەقلاوەیە و چەند ناحیەیەکی هەیە وەکوو(پیرمام، هیران ، سـکتان ، باسـرمە، بالیســان، بێتواتە)، وەلەچەند دۆڵێک پێکهاتووە وەکوو:

١-دۆڵی عەلیاوە. ٢ –دۆڵی سماقولی.

٣-دۆڵی قەلاسنج. ٤–دۆلە گۆران. ٥–دۆڵی هیران. ٦–دۆڵی ئاژگە و زرگوێز، ٧–دۆڵی بالیســان. ٨–دۆڵی مەلەکان٩–

گوندەکانی دەشتی هەریر، ژمارەی گوندەکانی خۆشناوەتی لە ١٦٠ گوند زیاترە، لەرۆژهەڵاتەوە سنووری خۆشناوەتی لە سەروچاوەی بێتواتە دەست پێ دەکات و لە رۆژئاواش لە گوندی زیارەتی مەلازادان کۆتایی دێت، لە باکووریشەوە لە گوندی مەلەکان دەست پێدەکات و درێژ دەبێتەوە بەرەو باشوور تاکوو لەدەربەندی گۆمەسپان تێپەڕ دەبێ.

## چیاکانی خۆشناوەتی بریتین لە:

١-چیای ســـەفین: ئەم چیایە کەوتۆتە ســـەر شـــەقڵاوەو ١٤٧٥ مەتر لە ڕووی دەریـــاوە بەرزە، لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگوندی جەلی دەســـت پێ دەکات و لە ڕۆژئاواشـــەوە لە گوندی حوجران کۆتایی دێت، وە ١٠ ســـەرچاوە و کانی بەم نـاوانەی تیـادایە (کـانیی خوڕاو، کـانیی شـــەمـان، ســـەرخۆران، کانیی شـــێخ محەمەد، کانیی کنێر، کانیی زیزنە، کانیی گویز، کانیی شـیلان، کانیی ســمایلان، کانیی ئـاوەگرد). ســـەفین وەکوو بـاس دەکرێ دەڵێن لەکـاتی نیشتنەوە و کەمبوونی لافاوی سـەردەمی (نووح) بەشێکی ســـەفینەکەی نووح بەر ئەو چیایە کەوتووە و ناوەکەی لە سەفینەکەی نووحەوە بەجێماوە.

# سەفینە شێتی خۆشناوان

زۆر جار ئەو نازناوە بەسەفین گوتراوە، لە چەندین حەیران و لاوکدا نازناوی سەفینە شێتی خۆشناوان بە کاردێ، بۆ چەند هۆیەک و بیرو رایەک دەگەڕێتەوە وەکوو:

-*ئەڵێن لەبەر ئەوەی ئەو چیایە زۆر بڵندە و لەزۆر شوێن ئەگەر هەوربێ و باران بێ، ئەوا لەوێ بەفرە. یان ئەگەر لە شوێنەکانی تر ئاسمان هەور و ساماڵ بێ، ئەوا لەسەر چیای سەفین بارانە و تەڕوتووشییە.

-*هەندێک دەڵێن بەهۆی ئەوەی شوێنێکی سەختە و تاشەبەردی زۆر گەورە و زلی لەسەرە و لەچیاکانی تر جیایە و ڕێگای کەمن و زۆربەی هەڵدێرە، بۆیە پێی دەڵێن سەفینە شێت.

-*هەندێکی تر دەڵێن ئەو نازناوە خەڵکی دەشتی هەولێر ناویان لێناوە، بەحوکمی ئەوەی پەرە (پەڵە) لەدەشتی هەولێر زۆر بە زەحمەت دەکەوێ، کاتێک کە دەبێتە هەور لەسەر چیای قەرەچووغ، هەورەکە هەڵدەکشێ بۆ سەر چیای سەفین و لە چیای قەرەچووغ باران نارێ و دێتە

ســـەر چیای ســــەفین، وەکوو دەڵێن(قەرەچووغ هەوری خڕکردەوەو سەفینیش لۆخۆی راکێشا.
هەروەها لەسەر چیای سەفین گۆڕاییەک هەیە ، کەنزیکەی چوار تاکوو پێنج دۆنم دەبێ، دەوروبەریشـــی لووتکەی بەرزن، وەکوو دەڵێن هاوینان (خانزادی میری سۆران) بۆ فێنکایەتی چۆتە ئەو گۆڕەو لەوێ ژیانی هاوینەی بەسـەر بردووە، بۆیە پێی دەڵێن گۆڕێ خانزادێ، چاڵە بەفرێکیشی لەنزیک هەیە ، چاڵەکەش بەچاڵی خانزادەوە مەشهوورە.
٢ -چیـای هەورێ: ئەم چیـایە لە ڕووی دەریـاوە ١٤٤١ مەتر بەرزە و هەر دوو دۆڵی هیران و بالیســـان لەیەک جیا دەکاتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە لە بیتوێنەوە دەســـت پێ دەکات و لە سپیلکی سنووری سوورچیایەتی کۆتایی دێت و لەهەر شوێنێک ناوێکی هەیە بەم شێوەیە لە قەمتەرانەوە لە ســـنووری بیتوێن دەســـت پێ دەکات (ناڵەشـــکێن، ســەرینێوە، نووســەک، ســەرەدۆر(ســەرەدۆڵ)، هەورێ، بنکوڕ، بێشێخ، کڵاوقاسم، زەرتکان، شاخی سوور، شاخی عەوشـــێ، شـــێخ ســـەف، کڵاوی داوەر، زینەتیر، کەپکی حەمەداغا، شەکرۆک، سۆرەپەل، بەنیهەریر، گۆڕبەشیلان).
ئەم کـانیـانەی لێ هەیە: (بیرێ گەری بێرەکی، کـانیی هەورێ، کانیی گوێز، کانیی ســێورگە، کانیی تەلانە، کانیی

جوولەكان، كانیی بێشێخ، كانیی نیشاو، كانیی بەردەبەشی، كـانیی خـارەبـاس، كـانیی كونەكۆتر، كـانیی رفتێ، بیرێ گردمازی، بیرێ سـاریجی، ئاوی گەرەكون، كانیی شـێرك، كـانـیی بلاررووك) ئەم زنـجـیرە چیـایە دووروودرێـژە دارســـــتـــانێكی چڕوپڕی خۆرســـــكی هەیە كە بریتین لە(داربەڕوو، مازی، كرۆســــك، گێوژ، كفر، گەز، دارەبەن، كەوەت، بلارووك، تەوسكە، تاووك).

ئەو گیا بەهاریانەشــی لێ هەیە: (ترشــۆكە، كەنگر، كاردی ریشــــۆك، كاردیی شــــاخی، كاردیی قوڕێ، ســـــلێرك، كەڤرۆكە، گوێزبەلە، هەنجیرەكیویلكە، قاقۆزبەراز، پیرفۆك، پەلەزێ، .....هتد).

دەربارەی ناوەكەی هەورێ: وەكوو لەچەند سەرچاوەیەك باس دەكرێ، گوایە لەسـەردەمی زەردەشـتیەكانەوە جۆرە دارێك لە چیاكانی خۆشـــناوەتی هەبووە، ناوی(هەوریس) بووە، لە شێوەی دارمازی بووە و لەلای زەردەشتیەكانەوە دارێكی پیرۆز بووە و زۆر گرنگییـان پێـداوە بۆ ئەوەی لەنـاو نەچێ، وەكوو مـام قـادر گۆزێ دەڵێ: لەچیـای ســـــەفینیش ئەو دارە هەبووەو بەشــــێوەیەك چیـاكـان دارســـــتانێكی زۆر چڕو پڕ بوونە لەداری هەوریس، بەڵام دوای هــاتنی ئــایینەكــانی تر بەهۆی ئەوەی لەلایەن

زەردەشـــتیەکانەوە پیرۆز بووە، بۆیە بڕیویان تاوەکوو وای لێهـاتووە دارەکە کەمی کردووە، بەتەمەنەکـانی ناوچەکەش باسـی ئەو داری هەوریســەیان دەکرد، بەڵام ئێستا ئەو دارە نەماوە.

٣-چیای شـیشـار: لووتکەی شـیشـار زۆر بەرزەو بەڵام دوورو درێژ نیەو کورتە، لەرۆژئـاوای بێتواتەیەو تـاکوو دەگاتە رۆژهەڵاتی گوندی هەرمک و لەوێ کەرت دەبێ.

٤ -مۆتە: گردێکی گەورەیە و لەشـــاخ دەچێ کەوتۆتە باکووری رۆژهەڵاتی مێرگەســەر و درێژدەبێتەوە بەرەو باکوورو تاکوو دەگاتەوە چیای ماکۆک.

٥-چیای ماکۆک: کەوتۆتە باکووری بێتواەو لە دەشـــتی بیتوێن دەستپێدەکات و درێژدەبێتەوە تاکوو دەگاتە نزیک ئالانەو لەهەر شـــوێنێک ناوێکی هەیە وەکوو(حاجیلە، دۆرنـاران، مـاکۆک، ژاڵە، کڵاوی دێوانـان، دەرەهەرتەل، دەرەزێوە، کەپرە، دەرەشـــیر، دەرەدار، شـــۆپە کە ١٩٨٠ مەتر لەرووی دەریاوە بەرزە، سەرباری خەتێ، سەرەزێ، ئیرۆن، دانیشـــتوانی رۆژهەڵاتی مـاکۆک هۆزی ئـاکۆن، بەڵام رۆژئاواو باشوور ماکۆک عەشیرەتی خۆشناون ئەم زنجیرە چیایە دوورودرێژە کوێســـتانە و دارودرەختی کەمی لێ هەیە چونکە شوێنەکەی ساردە.

٦-ئاراســـن: بەشــێکی ئەم چیایە کەوتووەتە باکووری ڕۆژهەڵاتی (مەلەکان) و چەند ناوێکی هەیە وەکوو(ئاراسن، کۆرانەگـادەر، ڕەشـــکی لەســـەر، قۆپی جوانەگـا، سەرەسێو).بەهۆی هەڵکەوتەی چیای ئاراسن کە کەوتۆتە نێوان دووچیـا، بۆیە نـاوەکەی لەتورکیەوە هـاتووەو بەواتای(چیای ناوەند).

٧ -چیای شـۆپە: ئەم چیایە کەوتۆتە نێوان دۆڵی مەلەکان و دۆڵـی بـالـیســـان، چـیـایـێـکی بەرزەو لەرووی دەریاوە(١٩٨١)مەتر بەرزە، سەختەو لەسنووری باکووری شێخوەسانان هیچ ڕێگایەکی تیادا نییە، لەخوارووی شۆپە واتا باکووری ڕۆژئاوای شـێخوەســانان بەرزاییەکی لێیە، من خۆم چوومەتە ســـەری شـــوێنەواری (گرکانێکی) لێ هەیە و بەقەد بیست مەترێک شـاخ و بەردی تواندۆتەوەو ناوەڕاسـتی شـوێنەکەش قووڵەو زۆربە ئاشـکرا شـوێنی بورکانی پێوە دیارە، بەڵام تائێســتا روون نەبووەتەوە کە ئەو بورکانە کەی و لەچ سەردەمێکدا رووی داوە.

دەربـارەی نـاوەکەی لەچییەوە هـاتووە؟ مـاوەیەکی زۆرە لەدوای ئەوەبووم کە مانای شۆپە لەچییەوە هاتبێ، تا ئەو دواییانە گەیشـتمە ئەوەی کە دوای ڕاوێژو پرسـیار لەگەڵ کەســـانی شـــارەزا لەزمانەکان، لەکۆتاییدا بۆم دەرکەوت

کەوا وشـەی (شـۆپە) وشـەیەکی کۆنی تورکیە و ئێسـتا کەم بەکاردێ، واتاکەشی دوومانای هەیە:
١-بەواتای شەق لێدان هاتووە.
٢-بەواتای کۆتایی بەرزایی دێ، کەئەمەیان راستیەکەیەتی چـونـکە بەرزایـی شـــاخـی شـــۆپە لەبـاکـووری گوندی(شێخوەسانان) کۆتایی بەبەرزایی دێت، بۆیە منیش پێم وایە کەدووەمیان شیاوتر و راستترە.
٨ -ئاوەگرد: بەشـێکە لەچیای سـەفین و کەوتووەتە نێوان سـماقوڵی و دۆڵی هیران، قەڵایەکی شـوێنەواری لێهەیەو پێدەچێ زۆر کۆن بێ.
٩ -بەنەباوی: ئەم چیایە کەوتووەتە نێوان دۆڵی سماقوڵی و دۆڵی عەلیـاوە، سـەرووی چیـایەکە دەشـتـاییە و (باوی)(چەقەلە)ی لێ هەیە، بۆیەش بەو ناوەنراوە، وشـەی بەن بەو بەرزاییانە وتراوە کە زۆر بەرز و عاسێ نەبن و سەرووی بەرزاییەکە شیاو بێ بۆ چاندنی دەغڵ و دان.
١٠ -چیای نووسـەک: ئەم چیایە کەوتووەتە رۆژهەڵاتی گونـدەکـانی(چیوەی سـەروو و خواروو)، دەربـارەی ناوەکەی ئەم چیایە زۆر دڕکی (نووسـەک)لێیە، کەگیایەکی دڕکـاوی ووردە و زوو بەلەشـی مرۆڤ و زینـدەوەر دەنووسێ، لەبەر زۆری ئەم دڕکە گیاییە ناوی لێنراوە.

ئەڵێن پیرەژنێـک کە تەنهـا کوڕێکی هەبووە، دیـارە بۆ کردنی مازی لەو چایە بوونە، لەناکاو کوڕەکە دەســـت بەهاوار و فیغان دەکات، دایکی کە دەچێتە لای دەبینێ مار پێی وەداوە، پاش ماوەیەکی کەم کوڕەکەی دەمرێ، بۆیە دایکەکە هاوار دەکاو دەڵێ:

نووسەکە نووسەکە نووسەکە

رەببی هەموو ساری تێتبەربی ئاگرەکە

ئاگرەکی بەمۆلەکە

تاتێدا بسۆتێ ماری بۆرو بۆرەکە.

١١-ســـەربەن: ئەو شـــوێنەی ئێســـتای (پیرمام)ی لێیە ســـەربەنی پێدەڵێن. یـان چیـای پیرمـام کەبەرزیەکەی ١٠٩٠مەترە.

جگە لەو چیایانەی باســـمان کردن هەندێ چیای نزمتر و بچووکتر لەخۆشـــناوەتیـدا هەن وەکوو(زنجیرە چیـای ســـەریرەش، کە بەرەو رۆژئاوا دەکشـــێ تاکوو دەگاتە سنووری هەرکیان، چیای کۆڕێ، تیشی باسرمە، سۆرکی شەقڵاوە، سۆرکی چنێران ، چیای شێخ زەرد).

چەنـد (دەرێـک)ی هەیە وەکوو(دەرەزێوە، دەرەهەرتەل، دەرەشیر، دەرەدار) وشەی دەر بەواتای رێگای سەخت بە شاخی سەخت و بەرز، هەیە دەستکردە، هەشە خۆڕسکە

و ئەو دەرانە هاتووچۆی کاروان و هاتووچۆی کەسی پیادا رەت دەبوون، چەندجارێک بەهۆی سەختیی رێگاکە وڵاخ بەبارەوە هەڵدێراوەو کاروانچیش لەو رێگایەسەختە مردوون، بەتایبەتی ئەوانەی کەشارەزاییان کەم لەم رێگایانەدا هەبووە، هەروەها گرنگییەکی تریشیان هەبووە، بۆ شۆرش و هاتووچۆی پێشمەرگەو هێنان و بردنی ئازووقەو کەلوپەل. دەر- بەواتای دەرچوون یان رێگای سەخت یان رێگای ووردو باریکەڵە دەگەیەنێ، لەخۆشناوەتی چەند رێگایەکی سەخت بوونیان هەیە، کەلەشاخ و شوێنی سەخت هەڵچنراون، لەوانەیە باریکەڵە رێیەک هەبووبێ دواتر بەدەست و پاچ و تەورو بارێیە رێیەکە خۆشتر کرابێ، ئەو دەرانە بۆ زیاتر رێگا کورت کردنەوەیە، بەو رێیانە دەوترێ دەر، ئەم دەرانە سوودێکی زۆریان بۆ خەڵکی ناوچەکەو رێبوارو کۆچەری و پێشمەرگە هەبوو.

لێرەدا یەکەیەکە باسی ئەو دەرانەتان بۆدەکەین:

١- دەرەشۆپە: کورتیلەو باریکەرێیەکی زۆر سەخت کەلەچیای شۆپەهەیە و دەکەوێتە باکووری گوندی خەتێ، رێیەکە بەجۆرێک سەختە کەبەئاستەم دەتوانی مرۆڤ پێیدا سەرکەوێ، وڵاخ ناتوانێ پێیدا بڕوا، زۆر کەم

بەکارهاتووە تەنها لە حاڵەتێکدا یەکێک بەرێکەوت لەوێ بووبێ ویستبێتی بچێتە سەر چیای شۆپە، ئەگینا زۆر هەڵدێرەو کەم کەس دەتوانێ پێیدا بڕوا.

٢- دەرەدار: بەهەمان شێوە لەچیای شۆپەیە و کەوتووەتە باکووری ڕۆژهەڵاتی گوندی شێخوەسانان، ئەو دەرە چەند کۆسپێکی بۆ کراوە وەک قاڵدرمەیەک مرۆڤ و وڵاخیش دەتوانێ پێیدا بڕۆن، بەڵام کەمێک زەحمەتە، وەکوو باس دەکرێ چەند جارێک وڵاخ هەڵدێراوە، بۆ هاتوو چۆی کەسی باشە، ڕێگاکە گوندی شێخوەسانان و مەلەکان بەیەکەوە گرێ دەدا، پێشمەرگە سوودی زۆری لێبینیوەبۆ هاتووچۆکردنی نێوان دۆڵی مەلەکان و دۆڵی بالیسان.

٣- دەرەشیر: ئەم دەرە دەرەشیر لەهەموویان ناوبانگی زیاترە، لەچیایەکی زۆر سەختدایە، کەوتۆتە باکووری گوندی شیرەی سەرێ، بەجۆرێک ئەگەر لەخوارووی کێوەکە سەیر بکەی دەڵێی مەحاڵە ڕێگای پیادە سەرکەوێ، ئەڵێن کابرایەکی دەشتەکی تەلاقی خواردووەو گوتوویەتی هەرسێ تەلاقم کەوێ ڕێگا بەو چیایەدا سەرناکەوێ.کاتی خۆی یەکجار عاسی و ترسناک بوو، چونکە لەهەندێ شوێن بەسەر تاشەبەردی زۆر سەختدا دەڕۆیشتی، (علی

شـــەعبان و حاجی ڕەحمان شـــێخوەســـانی)لەحەفتاکانی ســـەدەی رابردوو بەهەرەوەز ڕێگاکەیان باشـــتر کرد و چەند کۆسپێک و دیوارێکیان بۆ دروست کرد.

جاران بەهاران ســـونەتکەر دەهاتن جانتایەکی بچووکیان پێبوو گوند بەگوند دەگەڕان بۆ ســـــونەتکردنی منداڵان دەهاتن، خەڵکی باکووری کوردستان بوون، مام سەیدیان پێدەگوتن، یەکێک لەو ســـــونەت کەرانە لەشـــەســـتەکانی ســـــەدەی رابردوو منـداڵێکی لەگەڵ بووە لەدەرەشـــــیر لەژێرتاشـــەبەردێک پشـــوو دەدەن ، بەردەکەیان بەســـەردا دەڕمێ و هەردووکیان دەمرن هەرلەوێ دەیان نێژن.

٤- دەرەزێوە: ڕێچکە ڕێیەکی ســـــەخت و عـاســـــێیە، بەئـاســـــتەم مرۆڤ دەتوانێ پیـایـدا بڕوا، بەڵام نزیکە بۆ کوێستانەکان، بۆیە هاتووچۆی پیادا دەکرا.

٥- دەرەهەرتەل: ڕێچکە ڕێیەکە سەختەو بۆ هاتووچۆی کوێســـــتـانەکـان نزیکەو ئـاژەڵدارەکـان پیـایـدا گوزەریـان دەکرد.

یەکێک لەو ڕێگایانەی کەسوودی زۆری هەبوو بۆ خەڵکی خۆشـــــناوەتی ڕێگـای دۆرەتیر بوو، بەجۆرێـک جگە لە خۆشـــــناوەتی بەڵکوو ناوچەی بیتوێن و هەرووتیایەتی و

مەڕدارەکانیش بۆ کوێســتان و گەرمیان کردن بەو ڕێیەدا هاتووچۆیان دەکرد.
ئەم ڕێگایە لەنزیک گوندی(ســیســاوە)دەســتی پێدەکرد و بەدرێژایی چەنـد کیلۆمەترێـک تــاکوو دەگەیشـــتە ســـەر(زینەتیر)، ئینجا شـــۆڕدەبێتەوە بۆ دۆڵی بالیســـان، دۆرەتیر لەهەر شـــوێنێک ناوی تایبەتی هەیە وەکوو(بن تات ، گۆم، دارو بێدار، جۆتەدار، دوودەری، گۆڕێ بیرێ ، ئەسحابە، گەری نیشاو، زینەتیر).
کاروانچییەکانی دۆڵی بالیسان و مەلەکان و هەرووتیان و بیتوێن ســـــوودی زۆریان لەو ڕێگایە دەبینی، بەتایبەتی کاروانچێتی توورتن و ترێ و هەنارو.....هتد، بەم شـــوێنەدا گوزەریان دەکرد بۆ دەشـــتی هەریرو دەشـــتی هەولێرو موصـــــل، بۆســــــاغکردنەوەی ئەو بارەی کەپێیان بوو، هەروەها چەندان کارەســاتی ناخۆش لەو شـوێنەدا ڕووی داوە ، وەکوو(ڕێگری، کوشـــتن، رووتکردنەوە، تەقینەوەی مین، شـەڕی دەستەویەخە لەگەڵ دوژمن، شـەڕی کاروان، کەمینیان دادەنا، لەم بابەتەدا دەیان چیرۆک و بەسـەرهات دەگێڕنەوە، لەلایەکی تریش شـــوێنێک بوو هاوار بڕبوو، هەمووی دارستانی چڕبوو گەلێک جاریش ئاژەڵی دڕندەی وەکوو (پڵینگ و شـێر) پەلاماری کەســانی تەنیایان داوە، ئەمە جگەلەوەی مـــاوەیەک (ئەشـــقیـاکــان) لە دۆڵەتیر

کەمینیان دادەنا، وەخەڵکیان رووتدەکردەوە، ماوەیەکیش رێگای سەربازی بوو بۆ هێنانی ئازووقە و پێداویستی سەربازی بۆ رەبیەکانی سەر زینەتیر.
لە شەستەکانی سەدەی رابردوو حکومەتی عیراق ویستی رێگای دۆرەتیر و زینەتیر بکاتەوە، هەتاکوو دوودەری هێنا، بەڵام بەهۆی کوشتنی چاودێری رێگاکە کەناوی(صالح) بوو و خەڵکی هیران بوو، بەدەستی کەسانی نەناسراو، رێگاکە راگیرا، ئیدی هەروا مایەوە تاکوو ساڵی ١٩٧١ بە فەرمانی (علی شەعبان) بەهەرەوەزی و هەر چەند رۆژێک گوندێک، بە تەور و خاکەناس و باریە و تەقاندنەوە رێگاکە کرایەوە، هەرچەندە رێگاکە زۆر بەرتەسک و لۆفەکان لەیەک نزیک بوون و زۆر ئاستەم بوو دوو ئۆتۆمبێل لەیەک لابدەن، بەڵام کارێکی تابلێی باش بوو، هەرلەهەمان ساڵدا واتا ١٩٧١ یەکەم ئۆتۆمبێل گەیشتە دۆڵی بالیسان ، دواتر خەڵکی دۆڵی بالیسان چەند سەیارەیەکی (جێب لاندرۆڤەریان ) کڕین.
کەژمارەیان (٥) جێب بوون.
دۆرەتیر لەوەرزی زستاندا دۆڵێکی پڕمەترسی و سەخت بوو، بەتایبەتی کاتی بەفربارین(بەفروباو کڕێوەی دۆرەتیر بەناوبانگە، کەم کەس دەتوانێ خۆی لەبەر راگرێ،

ئەوانەی دەچوونە شـــارو کەلوپەل و پێداویســـتی ماڵیان دەکڕی لەگەڕانەوەدا ئەو کەلوپەلەیان هەر یەکەو دۆســـت و برادەرێکی لەگونـدی (شـــێخ مەموودیـان) هەبوو، ئەشـــیاکەیان لەو ماڵانەدا دادەنا و چەند رۆژێک دواتر بە ولاخ بارەکەیان دەگواستەوە بۆ گوندەکانیان، لەم رووەوە گونـدی شـــێخ مەموودیـان چـاکەو پیـاوەتییەکی لەرادەبەدەریان لەگەڵ خەڵکی دۆڵی بالیسان دەنواند.

لەوەرزی هـاویـنـیشـــــدا لەبەر ئەوەی رێـگـایەکـی دووردرێژبوو بۆ پیادە و ســـوار هیچ کانی و ئاوێک لەســـەر ریگادا نەبوو، بۆیە دەبوایە ئەوانەی بەم رێیەدا رەت دەبوون، بەلای کەمی هەنـدێ ئـاویـان پێبـایە، وەکوو(کوندەیەک یان دێمکەیەک یان مەتارەیەک).

بۆ مێژووش ئەڵێم (ئـاورەحمـان بەگی ســـیســـــاوە) لەناوەراستی سەدەی رابردوو کوپێکی ئاوی لەناوەڕاستی دۆرەتیر دانـابوو، هەموو رۆژێـک چەنـد کونـدەئـاوێکی لەســـیســـاوە بە ولاخ دەنارد و لەکووپەکەیان دەکرد و ســـێبەرێکی باشـــیشـــی بۆ کردبوو، بۆ ئەوەی رێبوار و کاروانچی ئاوی لێبخۆنەوە، ئەم کارە نەوازەشـــی پاش ئەوە هـاتە ئاراوە کەزۆر هەوڵی دا بیرێک لە(داروبێدار) لێبدا بەدەســـت، بەلام لەبەر ئەوەی نەگەیشـــتە ئاو بۆیە سەری نەگرت.

دەربارەی ناوەکەشـــی بۆ ناوی لێنراوە دۆرەتیر چەند رایەک هەن وەکوو:

١-هەندێک دەڵێن بەهۆی ئەو شـــەڕو ئاژاوانەی کەلەم شـــوێنە روویداوە کاتی خۆی، چ لەگەڵ داگیرکەران، چ هێزی عەشـــایەر لەگەڵ عەشـــیرەتەکانی لەیەک نزیک ، بەتیرشەڕی لێکراوە.

٢-هەندێکی تر دەڵێن لەبەر ئەوەی دۆڵەکە راستەو راستە واتـا هیچ بەربەســـــت و پێشـــەک نییە ، بۆیە بەقەد تیرهاویشتنێک تیرەکە بەر هیچ شوێنێک ناکەوێ و راست دەڕوا.

٣ -تیرەبەستن لەخۆشناوەتی بەکاردێ، واتا رۆیشتنێک کەگەڕانەوەی بۆ نەبێ و بەدوای یەک رۆیشـــتنیش دەگرێتەوە.

هەرســـێ رایەکە لەیەک نزیکن هەم لەوانەیە شـــەڕەتیری لێکرابێ ، هەم دۆڵەکە راســـتە و تیر بهاوێ و بەرهیچ شتێک ناکەوێ، هەمیش تیرەبەستن و رۆیشتنی لەدوای یەک و نەگەڕانەوەش .

# ناوی خۆشناو لەچیەوە هاتووە؟

لەســــەر ناوی(خۆشـــناو) چەند بیروڕایەک هەیە کەبەم جۆرەیە:

١-نووسەرو رووناکبیر(زیرەک کەمال) دەڵێ:

من لەو باوەڕەدام کەناوی خۆشـــناو، بۆ ناوی خۆش بگەڕێتەوە، چونکە جاران لە خۆشـــناوەتی ناوی خۆش و کوردیان لەمنداڵەکانیان ناوە، وەکوو(گوڵچین، خاتوون، گولیزار، خونچە، نێرگز، بەیبوون، گور، کنێر، ســووســن، چنار..) و چەندان ناوی تر، بۆیە پێدەچێ لەناوی خۆشەوە هاتبێ، دواتر گۆڕانکاری بەســـەردا هاتبێ و بووبێتە خۆشناو.

٢ -ئەڵێن چەند کەسێک هاتوونەتە خۆشناوەتی ، ئەو کاتە دیارە وەرزی زســـتان بووەو بەفرێکی زۆر کەوتووەو شەختەو بەستەڵەک بووە، یەکێکیان بەئەوانەی دیکە دەڵێ ، ئێرە خۆشە؟یەکیان دەڵێ ناو، واتا نەخێر.

٣-لە هەندێک ســەرچاوەدا باســدەکرێ، کەخۆشـــناوەتی جاران پێی گوتراوە(حەســـناوات، حەســـنان لوو، حەســـنیە..هتد) ئەڵێن گوایە لەوەوە هاتووەو دواتر سواوەو بۆتە خۆشناوەتی.

٤ -نووسەری کتێبی خۆشناو و خۆشناوەتی، کەمال خورشید میران، دەڵێ لەخۆشناوچە هاتووە، بەحوکمی ئەوەی شوێنێکی دڵگیر و پێشچاو و خۆشە، بۆیە ئەگەر جارانیش ناوچە بەکار نەهاتبێ، وتوویانە ئەو ناوە شوێنێکی خۆشە،

تائێستا زیاتر ئەو رایە پەسندکراوە کە لە خۆشناوچەوە هاتبێ.

خۆش+ناو

هاوەڵناو+ ناو

لەزمانی کوردی زۆرجار هاوەڵناو بەپێش ناو دەکەوێت، وەکوو(سوورگوڵ، رەشەدۆر، شیناو...هتد).

٥- حەیدەر عەبدوڵلا نووسەر و وەرگێڕ دەڵێ: هەروا ئاسان نییە وشە تەنیا لە ڕووی لێکچوون و پێکچوونەوە لێک بدەینەوە، ناکرێ بڵێین (جێیالا) لە (جبال)ی عەرەبییەوە هاتووە! بۆ وشەی (خۆشناو) سەرەتا دەبێ وشەی (خۆش) وەربگرین، ئایا ئەم وشەیە لە چ زەمانێک کورد بەکاری هێناوە، کە بەکاری هێناوە هەر بەو واتایەی ئێستا بووە، یان گۆڕانی بەسەردا هاتووە؟ دواتر دەبێ سەر بە فەرهەنگی عەرەبی و فارسیدا بگرین داخۆ جیرانەکانمان چۆن ئەو وشەیە بەکار دێنن، بە نموونە لە

زمانی فوســحای عەرەبیدا هەمیشــە ســیفەت لە دوایە و مەوســووف لە پێشــەوەیە، کەچی لە بەکارهێنانی وشــەی (خۆش) لە شــــێوەزاری عەرەبیدا کارەکە پێچەوانەیە، بە نموونە: (خوش قراءة.) یانی (خوێندنەوەیەکی باش- قراءة جیدة). دەزانم فارس و تورکەکانیش بە هەمان واتای ئێمە بەکـاری دێنن. هەر چۆنێـک بێـت دەبێ ســــەرەتـا لە لێکدانەوەی شــکڵی دووربکەوینەوە و بەدوای ســـەرەتای ناونان و ڕیشــەکەیدا بگەڕێین، ئایا کورد بەخۆی وشــەی (خۆشــناو)ی داڕشــتووە، یان عەرەب و فارس و توورک، کە چەندان ناویان بۆ شــــار و گوند و دوند و ناوچە و گردی کوردستان داناوە.

# ناو و جۆرەکانی باڵندە

دەڤەری خۆشـــنـاوەتی بەشـــێکی نزیکە لەنـاوچە کوێســتانییەکان و بەشـیێکیشـی نزیکە لەناوچەگەرمەکانی کوردســـتان و بەشـــێکیشـــی نزیکە لەدەریاچە و ڕووبار، بۆیە لەوانەیە ئەو باڵندانەی لەخۆشـــنـاوەتی دەژین و کوێسـتان و گەرمیان دەکەن جیاوازبن لە ناوچەکانی تری وڵاتەکەمان.

من لێرەدا تیشـــک دەخەمە ســـەر ناو و جۆر و قەبارەی لەشی ئەو باڵندانەی کە لەخۆشناوەتی دەژین و کوێستان و گەرمیـــان دەکەن، لێرەدا داوا لە خوێنـــدکـــار و ئەو نووســـەرانە دەکەم, کە دوای ئێمە بابەتەکە ئەکادیمیانەتر و تێروتەســـەلتر لەســـەری بنووســـن، چونکە ئەو بابەتە زیـــاتـر هەڵـــدەگرێ، هـیـوادارم ئەوان بەدواداچـوون و ماندووبوونی زێتری بۆ بکەن .

**بەشی یەکەم: باڵندەی وشکانی راوکەر.**

١- **هەڵۆ:** باڵندەیەکی تیژفڕی چڕنووکتیژە و دەنووکی خوارە، چـاوەکـانـی تیـژ و دووربیـنن. و لەدوورەوە نێچیرەکەی دەبینێ و نێچیرەکەی بەزەحمەت لەدەســـتی رزگاری دەبێ.

٢- **باز:** بەهەمانشێوەی هەڵۆیە و چاوتیژە و کەمێک لە هەڵۆ بچووکترە، بەنێرەکەی دەوترێت (جوڕە) بەمێیەکەشی دەوترێت (تەڕلان) ، تەڕلان لەکوردەواری زۆربەکاردێت ، بە ژنی جوان و قەڵەو و بەتەمەن دەوترێت.

٣- **باشـــووکە:** ئەم باڵندەیە لەکۆمەڵەی بازە و ڕەنگی جینجرە و چاوتیژەو لەئاســمان ڕادەوەســتێ و لەزەوی نێچیری دەســتنیشــان دەکات ، ڕاســتەوخۆ هێرشــی بۆ دەکات.

٤- **شـمقار:** لەکۆمەڵەی بازەو گۆشـتخۆرە و دەنووکی درێژترە لەهەڵۆ.

٥- **شـــەهێن:** بەهەمــان شــێوە لەتیرەی هەڵۆیەو باڵندەیەکی گەورەیەو گۆشـــتخۆرەو ڕەنگی بۆرەو لەباز گەورەترە.

٦- **دووبراله:** جووتە باڵندەیەکی گەورەن و گۆشتخۆرن و وەکوو هەڵۆ وان هەمیشە دووبەیەکەوەن و بۆیە ناویان لێنراوە دوو براله.

٧- **ســیســارکە کەچەڕ (کەچەلڕ):** باڵندەیەکی گەورەی ســـەر ڕووتـاوە و لووســـە و بۆیە بەکەچەڕ(کەچەلڕ) ناودەبرێت، خواردنی ســیســارکەکەچەڕ بەزۆری گۆشـتی ئاژەڵی مرداربوو دەخواو هەمیشە لەسەرکەلاکە.

٨- **خەرتەل:** جۆرە داڵێکی زەبەلاحەو لەتیرەی هەڵۆیەو کاتێک باڵەکانی لەیەک دەدا دەنگێکی گەورەی لێوەدێت و باڵەکانی نزیکەی مەترێک دەبن.

٩- **کوندەبۆ:** جۆرە باڵندەیەکی سـەرگەورەی چاوگەش و تیژە، بەشـــەو دەخوێنێ و دەنگی خۆشـــە بەتایبەتی لەبەهاراندا شـــەوانە دەنگی دێت، خواردنی کوندەبۆ زیاتر چۆلەکەی بچووک و مشـــکە، لەکوردەواریـدا کونـدەبۆ بەشـــووم دانراوەو ناوی بەدە، ئەڵێن لەهەر شـــوێنێک لێی بخوێنێ ئەو جێگایە چارەنووسی وێرانەیە.

١٠- **کۆلارە:** باڵندەیەکی گەورەی گۆشتخۆرە و لەتیرەی داڵە.

١١- **قرغۆ:** بـاڵنـدەیەکی دەنووک تیژبوو، بەشـــی لای ســـەرەوەی دەنووکی تۆزێک چەمابووەوە، لەشـــێوەی دەنووکی باز، قرغۆ باڵ٥ندەیەکی گەورە بوو و گۆشتخۆر بوو، جاران لەدەوروبەری شـــەقڵاوە دەدیتراو بـاڵندەی کچکەی دەخوار، بەڵام ئێستا نەماوە.

١٢- **ماســـیگر:** هێندەی رەشـــۆلەیەک دەبێ، بەزۆری خوارنی ماســـییە بۆیە بەم ناوە نراوە، لەئاســـمانەوە رادەوەســـتێ و کەماســـییەکی لەناو گۆمە ئاوێکدا بینی،

یەکسەر هێرشی بۆ دەکات و دەیخوا.

**بەشی دووەم: باڵندەی وشکانی راونەکەر .**

١- **سوانکی کێشکە:** باڵندەیەکی بچووکە و لەشوێنێک ئاوەدانی لێبێت ئەویش لەوێیە، لەژێرسواندەی خانوو هێلانە دروست دەکات، لەهەموو وەرزەکانی ساڵدا بوونی هەیە و کۆچ ناکات و کوێستان و گەرمیان ناکات ، مێیەکەی رەنگی بۆرەو نێرەکەشی بەهەمان شێوە بۆرە، بەلام چەند خەتێکی رەشی لەسەرباڵەکان و سەریدا هەیە، درێژیەکەی نزیکەی حەوت سانتیمەتر دەبێت و خواردنی لەپاشماوەی مرۆڤ و گەنم و جۆ و کلۆ پێک دێت.

٢- **رەشۆرە:** رەشۆرەی خۆشناوەتی جیایە لەگەڵ شوێنەکانی تر ، هەم لەکێش هەم لە گەورەیی ، هەرچوار وەرزی ساڵ لەناو باخچەکاندا دەبینرێت ، رەنگی رەشەو درێژیەکەی نزیکەی ١٥ سانتیمەتر دەبیت، خواردنی دانەوێڵەو مێش و مەگەزە.

٣- **کلک تەکێنە:** چۆلەکەیەکە بەقەد سوانکیە و ژیانی لەناو باخچەو شوێنی دوور لەئاوایی یە، کەهەڵدەنیشێ کلکی بەرز و نزم دەکات و دەیجووڵێنێ.

٤- **نیق:** چۆلەکەیەکی زۆر بچووکە و رەنگی مەیلەو بۆرە ، دوورلەئاوایی دەژی و کەدەفڕێ دەنگێکی لێوەدێت، بەزۆری لەناو دڕی و دڕک هێلانە دروست دەکات.

٥- **قەتێ:** باڵندەیەکە پەڕەکانی بۆرو زەردە نێرەکەی چەند خەتێکی رەشی لەکلکیدا هەیە، قەتێ لەوەرزی دروێنەدا لەناو دەغلودان هێلانەکەی دەبینرێت.

٦- **کەو:** هەمووومان کەو دەناسین و پێویست بە پێناسە ناکات.

٧- **زەردۆرە:** وەکوو رەشۆلە وایەو بەڵام رەنگی زەردەو بەهاران پەیدا دەبێ و دەنگێکی خۆشی هەیە.

٨- **قەلەبەرخۆرە:** باڵندەیەکە بەقەد کۆترێک دەبێت و رەنگی بۆرە چەند خەتێک بەسەرباڵەکانیدا هەیە ، ژیانی لەچیاو ناو باخچەکاندایە، ئەڵێن قەلەبەرخۆرە بەحەوت جۆر دەتوانێ بخوێنێ، بۆنموونە وەکوو پشیلە دەتوانێ میاوەمیاو بکات.

٩- **زەردەشامی:** ئەو چۆلەکەیە رەنگی زەردە و چەند خەتێکی رەشی بەسەر پشتیدا هەیە، لەبەهاراندا پەیدا دەبێ و تا نزیکی پاییز دەمینێتەوە، دەنگی خۆشە، هێلانەکەی لەچۆلەوانیدا دەکات.

١٠- **پەڕەسێلکە:** باڵندەیەکە باریکی ڕەشی سەر و کلک سپیە، باڵندەیەکی کۆچەریە و کوێستان و گەرمیان دەکات، لەکۆتایی زستان دەردەکەوێ و پێش هاتنی پاییز بەڕەوە دەڕۆن، لەکوردەواریدا پەڕەسێلکە بەپیرۆز دانراوەو لەبەر ئەوەی هێلانەکەی لەناو ماڵاندا دەکات، بۆیە زۆر ڕێزی دەگیرێ و جاران ئەیان گوت پەڕەسێلکە ئەڵێت:

ئاوێ دینم لەمەدینێ
قوڕێ دینم لەقوڕە شینێ
هەرچی هێلانێم خەراب کات
ئێکیان لەمارێ نەمینێ.

١١- **سووسکە:** کەوێ زیخی: لەتیرەی کەوەو زۆر خێرایە لەڕۆیشتن، ڕەنگی وەکوو خۆڵ وایە بۆیە زوو ون دەبێت و نابینرێت، ژیانی لەشوێنی زیخەڵانەو بۆیە لەهەندێ جێگا پێی دەڵێن (کەوێ زیخی).

١٢- **پۆڕ:** ڕەنگی بۆرەو کەمێک لەکەو گچکەترەو گۆشتی خۆشەو کاتێ کەدەخوێنی دەدۆزرێتەوەو لەکاتی بەفردا زوو دەکەوێ و باڵ ناکرێ بۆیە زوو دەگیرێ.

١٣ - **چرگ:** لەقاز گەورەترەو قاچ و ملی درێژەو وەکوو عەلەشیش وایە ، گۆشتی دەخورێت، زۆر جار ئەگەر

ئاژەڵێک قەلەو بێت ئەڵێن (هەند قەرەوە ئەرێی چرکە).بەڵام ئێستاکە نابینرێ، پێدەچێ نەمابێ.

١٤-**بارانبرە:** تەیرە ئەبابیلە: وەکوو پەرەسێلکە وایە ، رەنگی رەشەو قاچ و دەنووکی کورتن، ئەگەربکەوێتە سەرزەوی بەزەحمەت هەڵدەستێتەوە، بۆیە لەژێرسواندەو شوێنی بەرز دەنیشنەوە بۆئەوەی بتوانن دوایی بفڕن، باڵندەیەکی کۆچەریەو کاتی لەبەهاراندا باران کۆتایی دێت ئەوان پەیدا دەبن، بۆیە بەم ناوە نراوە.

١٥- **قەلەڕەش:** باڵندەیەکی گەورەی رەشە، بەڕەوە دەفڕن، بەزۆری لەدەشتەکاندان، گۆشتی ئەم باڵندەیە ناخورێ.

١٦ - **قەرەباچکە:** رەنگی رەش و سپییە، کلکی درێژەو لەکۆتر باریکترە ، تەپڵی سەری رەشەو دەنووکیشی راست و ئەستوور و رەشە، سەرباڵەکانی سپییە، قاچەکانی رەش و لووسن و چاوی مەیلەو شینن، دەنگی بە (چیکەچیکە) لە کاتی فڕیندا بەلاخواری دەفڕێ و دەتوانی بەقونان بڕوا.

١٧ - **دارکونێرە:** دەنووک درێژوتیژە، سەری سوورە و بەرسینگی زەردە و سەرباڵی رەش و سپییە، هێندەی رەشۆڵەیەک دەبێت، ئیش و کاری ئەم باڵندەیە دارکوون کردنە و ئەو کرمەی لەناو داردایە دەیخوا، ئەڵێن دارکونێرە

کە شـــەو دادێت تۆبە دەکات و ئەڵێت تا من مابم جارێکی تر بەدەنووک دار نـاکوڵم، بەڵام کە رۆژ داهـاتەوە هەمـان رێچکەی جاران دەگرێ و دەســـت دەکاتەوە بەدار کوڵین، ئەو شـــوێنەی کونی دەکات گیانلەبەری تر هێلانەی تیادا دەکات.

١٨- ســـۆفیلکە: چۆلەکەیەکی پۆپیتەدارە، رەنگی مەیلەو زەردە ، بە زۆری لەنـاو وەرد و دەغلانـدا دەدیترێـت و دەنگێکی خۆشـــیشـــی هەیە، ئەم چۆلەکەیە چوار وەرز دەمێنێتەوە و کۆچ ناکات.

١٩ - کۆترە کێوی: کۆتری کێویە و رەنگیان مەیلە و شینە بەرەوە دەفڕن.

٢٠ - کوڕکار: جۆرێکە لەباڵندە و وەکوو کۆتر وایە و لەناو باخچەکانی شەقلاوە و دەوروبەری دەبینرێت.

٢١ - پۆپەی ســـلێمـانکە: بـاڵندەیەکی پۆپیتەداری جوانە، پۆپیتەکەی سوورە و رەنگی مەیلە و بۆرەو چەند خەتێکی رەش بەسـەر باڵ و پشـتیدا هەیە، ئەو باڵندەیە یەکێکە لەو باڵندانەی کەلە قورئانی پیرۆزدا ناوی بە (هدهد)هاتووەو یەکێک بووە لەو باڵندانەی کە لە ژێردەســـتی (حەزرەتی ســـلیمان) کاری نامەبەری و چاودێری کردووە، بۆیە بە پیرۆز دادەنرێ و راو ناکرێ.

٢٣- **گاپەل:** لەتیرەی کۆترە و بەڵام گەورەترە، گۆشـــتی بەلەزەتەو راودەکرێ، بەتایبەتی لەپاییزاندا کە لەســـەر (دارئەســـپیندار) هەڵدەنیشـــێ و بەباران باڵی تەڕ دەبن ، بەشـەو لایتی لێدەدەن و دارەکە رادەوەشـێنن و دەکەوێتە خوارەوە.

٢٤- **رەنگارە:** مەلێکی رەنگاورەنگی ســـەوزو شـــین و قاوەیی یە، زۆر جوان و پێش چاوە، بەڵام لەلای خاوەن پوورەی هەنگ دوژمنە چونکە مێشـــە هەنگوین دەخوات، هیلانەکەشـــی لەژێر زەویـدایەو لەشـــوێنی زیخەڵان بەدەنووک دەکۆڵێ و هێلانەی تیـادا دروســـت دەکات، ئێواران بەرەوە لەئاسمانن و دەنگیان دێت.

٢٥ - **قازو قورینگ:** جۆرە قازێکی کێویەو کوێســـتان گەرمیان دەکەن، لەکاتی کۆچدا لەشـــوێنی نزیک گۆم و رووبار دەنیشـــنەوەو لەوێدا راو دەکرێن ، قورینگ ملی درێژەو هێندەی عەلەشـــیشـــی مێیە دەبێت، گۆشـــتیان خۆشـەو کاتێ بەرەوە دەفڕن بەئاسماندا تەقەیان لێدەکەن دەیان هێننە خوارەوە.

٢٦ - **تفتیلک:** لەکۆمەڵەی کۆترەو رەنگی بۆرەی پەڵەپەڵەیەو (گمەگم و کوڕەکوڕی)لێوەدێ، لەســـەرەتای هاویندا پەیدا دەبن و لەســـەرەتای پاییزدا کۆچ دەکەن،

تفتیلک حەزی لە(نیســـک) ەو بەزۆری لەپەرێزە نیســـک بەرەوە دەنیشنەوە.

٢٧- **حاجی لەق لەق:** هەمووومان بینیومانە پێویســـت بە پێناسە ناکات.

٢٨- **شـــالوور:** جۆرێکە لەبولبول و نەغمەخوانەو دەنگی خۆشە، لەنیوەشەودا دەخوێنێ.

٢٩ - **شـــوان خـافرێنکە:** بـاڵنـدەیەکی بۆرەو لەچۆلەکە گەورەترەو لەچیادا دەژی، تالێی نزیک نەبیتەوە نافڕێ و زۆریش دوورنـاکەوێتەوە، بەتـایبەتی شـــوان بەدوای دەکەوێ و کەچی نـاشـــگیرێ و مەڕو مـاڵاتی لێ وون دەبێت و گورگ پێی وەردەبێ ، ئەڵێن شـــوان خافرێنکە دۆســـتی گورگە لەگۆشـــتەکەدا هاوبەشـــیتی، بۆیە بەم ناوەنراوە.

٣٠ - **بەفری:** جۆرێکە لەچۆلەکەو مەلێکی زۆرجوانەو رەنگاو رەنگ و کلک درێژەو کاتێ کەبەفر دەکەوێ ، ئەو بـاڵـندەیە پەیـدا دەبێ لەبرســـان دەچێتە ســـەربان و لێوەســـواندەی گوندەکان خواردن بۆخۆی پەیدا دەکات، کەس راوی ناکەن چونکە لەبرسان دێتە ناو ئاوەدانی.

٣١ - **بەردەکوڕە:** جۆرێکە لەچۆلەکەو خرپنەو لەســـەر بەردو شـــاخدا دەژی و هێلانەشـــی هەرلەشـــاخدا بەقوڕ

دروست دەکات و رەنگیشی مەیلەو بۆری سەریشی چەند خەتێک.

٣٢ - **بن زگ سـوور:** ژلەوەرزی پاییزدا بەرەوە دەهاتن، بەتایبەتی جاران لەناو باخچەکانی شەقلاوە بەدی دەکران، وەکوو باس دەکەن ئەوەنـدە زۆر بـوون کەزۆربەی باخچەکانیان دادەپۆشی، شوێنی نیشتنیشیان زیاتر لەسەر داربەڕوو و تاوک و سۆبلەتی بوو، وەبەری ئەو دارانەیان دەخوارد، بەڵام ئێستا زۆر کەم بوونەتەوەو خەریکە لەناو دەچن.

٣٣ - **قـاژوو:** وەکوو رەشـۆرە وایە بەڵام گەورەترە، شـێوەی دەنگەکەی قاژەقاژی لێوەدێ، بۆیە ئەم ناوەیان لێناوە.دەین کولاند وەک ئەڵێن گۆشتەکەی بەتام بوو.

٣٤- **فارەقەل:** ئەم جۆرە باڵندەیە مشـەخۆر بوو، هەرگیز خۆی مـانـدوو نـاکرد بۆ دروسـتکردنی هێلانە، بەڵکوو چاوەڕێی دەکرد تـاکوو قەرەبـاچکە هێلانەی دروسـت دەکرد، ئەویش دەچوو داگیری دەکردو فەرخەی هەڵدێنان، بۆیە قەرەباچکە زۆر لەفارەقەل دەترسا.

٣٥- **زەردو زراویلکە:** ئەم چۆلەکەیە دەنگی زۆر خۆشـە ، لەبەهاراندا یەکەم باڵندەیە دێتە ناوچەکەمان وەکوو ئەڵێن مژدەی بەهار ئەو دەیهێنێ.

٣٦ -**گێرزوله:** چۆلەکەیەکی بچووکی رەنگـاو رەنگە، لەســـەرتای بەهاردا پەیدا دەبن، ئەم جۆرە نێرو مێیەکە زۆر هـاوکـاری یەکتر دەکەن بۆ ئەوەی بێچوەکـانیـان بەخێوبکەن.

٣٧- **سیێ:** باڵندەیەکی خڕپنی رەنگ گەنمیە، هێندەی کۆتر دەبێت، کوێســـتان وگەرمیان دەکات، بەڵام زۆر رێک نیە لەکاتی رۆیشـتنی بۆ کوێسـتان و گەڕانەوەی بۆ گەرمیان، وەکوو بڵێین کـاتی دیـاری کراوی نیە بۆ رەو ، بەڵکوو گەلێک جار پێش داهاتنی بەهارو هێشـــتا بەفر هەرماوە کەدەڕوا بۆکوێستان ، پایزانیش بەهەمان شێوە.

# گیانەوەری کێوی و زیندەوەر

بەهۆی هەڵکەوتەی خۆشناوەتی ڕووبەرێکی زۆری هەیە لەدۆڵ و دەشت و کێو و شاخ و هەڵدێر، بۆیە جۆرەها گیانلەبەری کێوی دڕندەو ئەوانی تر دەژن، لێرەدا یەکەیەکە باسیان دەکەین:

١- **گورگ:** گیاندارێکی دڕندەیە و لەشێوەدا وەکوو سەگ وایە، بەڵام لەزۆر شتدا جیاوەزە لەگەڵ سەگ، چونکە گورگ تووکنە و لەراکردندا خێرایەو چاوەکانی تیژن و لووڕولوور دەکات و دوژمنی مەڕوو مالاتەو چڕنووک و کەڵبەکانی بەهێزن بۆهێرشکردن زۆر خێرایە، بەزۆری لەشوێنی دارستانی خۆڕسک و شاخدا دەژی ، بەڕۆژ کەم دەردەکەوێ، بەشەو خواردنی پەیدا دەکات، نەریتێکی هەیە، ئەگەر بگاتە مێگەل ئەوا چەندی مەڕو بزن ببینێ و بتوانی دەیان خنکێنێ.

٢- **هەرس:** لەشوێنی کەژو کێو و شاخاویدا دەژی، گیان لەبەرێکی خڕپنی گەورەی زۆر کورکنە، دەست و پێی وەکوو مرۆڤ وایەو چاوەکانی گەورە نین و کزن، زۆر خۆرەو دەتوانی بەسەر داربکەوێ و مەلەوانەو وەکوو مرۆڤ دەتوانێ بەپێ بڕوا، هەرس حەزی

لەهەنگوینە بێباکانە بەسەر داری کلۆر هەڵدەگەڕێ و هەنگوین دەدۆزێتەوە، جاران وورچ لەخۆشناوەتی هەبووەو بەڵام ئێستا نەماوە.

٣- **بەراز:** گیانلەبەرێکی چوارپەلی دووسمە، هێندەی گۆلکێکی ئاساییە، سەری بەملیەوە نووساوە بۆیە ناتوانێ ئاوڕ بداتەوە، نێرەکەی ئێکانەی پێدەڵێن، بەهۆی ئەو قۆچەی کە هەیەتی زەوی هەڵدەدڕێ و بەدوای خواردنا دەگەڕێ، مێیەکەشی مالۆسی پێدەڵێن، بەراز زۆر لەبەر دلان نیەو زۆر جار ئەگەر یەکێک سپلە بێت و دەییووس بێت ئەڵێن (دەرێی بەرازە)، بەشەو بەڕەوە دەردەکەون و هێرش دەکەنە سەر گەنم و جۆو برنج و نۆک و نیسک وێرانی دەکەن، ئێستا بەراز لەخۆشناوەتیدا گەلێک زۆرەو بەڕەوە دەبینرێن.

٤- **گۆڕهەرکەن:** گیانلەبەرێکی کێوی رەشەو لە پشیلە گچکەترە، بەزۆری لەو شوێنانەدا دەبینرێ کە زەویەکەی نەرمەو گۆڕی مرۆڤ هەڵدەکەنێ و جەستەکەی دەخوا، بۆیەش بەو ناوەنراوە.

٥- **سەگراو:** گیانلەبەرێکی شیردەری درێژی ئاویەو ماسی دەخوا، بەزۆری لەناو گۆم و رووباردا دەبینرێ ، چوارپێی هەیەو وەکوو گۆلکێکی گچکەیە، چنگی وەکوو

چنگی سەگ وایەناوپەنجەکانی بەپەردە داپۆشـراوە، کلکی پان و راســـتە، رەنگی پێســـتەکەی قاوەیی یە، پێســـتی سەگراو زۆربەنرخ بوو.

٦- **کەفتیار:** گیانەوەرێکی یەکسمە، روو و دەمووچاوی وەکوو کەروایە، بەڵام بچووکترە لەکەر، گۆشـــتی بۆگەن بوو دەخوا، درندەو لەپەلاماردا توندوتیژە، لەدەم رووبارو مێرگدا شەوانە بەدوای خواردندا دەگەڕێن.

٧- **رێوی:** گیانلەبەرێکی کێویەو لەوەتەی هەیە بەفێڵباز نـاوی دەرکردووە، تەنـانەت ئەگەر مرۆڤێک فێڵبـاز بێـت ئەڵێن (ئەرێی لەلای ریوی دەرســـی خوێنـدیە)، دەمو لمووزی بـاریکەو زۆر گەورەنیە، گوێی قوتەو کلکی ئەستوورە، خواردنی بریتیە لەباڵندە، بەتایبەتی مریشک و جووجکە.

٨- **توورگ:** لەکۆمەڵەی رێویەو کلکی ئەســـتوورەو قەپۆزی لەســـەگ باریکترە، هەندێکیان رەنگیان خاکیەو هەندێکیشیان سوورە، بەرۆژ خۆیان لەناو شوێنی عاسێ دەشـــارنەوەو دوای تاریک بوون بەرەوە دەردەکەون و دەســـت دەکەن بەنووزەنووز لەیەک کۆدەبنەوەو خۆیان ئامادە دەکەن بۆ هێرشکردنە سەر مریشک و جووجکە.

٩- **کوڕەبەشـــــە:** گیانلەبەرێکی شـــەوگەڕی خرپنە و لەکەژو کێواندا دەژی ، دەست و پێی کورتن و زۆر قەڵەو و گۆشتنە، پێستەکەی بۆرەو خەتی رەش و سپی بەسەر و نێوچەوانیدا داهاتووە، ســـەری لەچاو لاشـــەکەی زۆر گچکەترە، گۆشـتەکەی دەخورێت و بەتامە، ئەگەر مالاتێک زۆر قەڵەو بێت ئەڵێن (دەرێی کوڕەبەشەیە).

١٠- **دەرەک:** بچووکەو پێســـــتەکەی ســــوورەو تۆخە، لاقەکانی کورتن ، ئەم گیان لەبەرە نەریتێکی هەیە ئەگەر مەترســــیەکی زۆرترســـناکی بۆهـات و زانی گیـانی لەمەترسـیدایە ، ئەوا فسـی بۆگەن دەکات وادەکات ئەوەی لەدوایتی وازی لێبێنی، پێستی دەرەک زۆربەنرخ بوو.

١١- **جورجەکۆر:** گیـانەوەرێکە لەمشـــــک گەورەترەو هەرلەتیرەی مشـکە و رەنگی بۆرە، لانەی لەژێرزەویدایەو بەکـۆمەڵ خـۆڵ دەردەدات، ژیـانـی لەزەوی نەرمـانە، لەکوردەواریدا ئەم کۆمەڵە خۆڵانەی کەجورجەکۆر دەری دەدات ئەڵێن(ئەگەر بتوانێ حەوت کۆمەڵ خۆڵ لەیەک ئاستدا لێبدات چاوی چاک دەبنەوە).

١٢- **بزن مشـکە:** لەپشـیلە گەورەترە و چوارپەای هەیە، پەنجەکانی درێژن و لەدەســتی مندالی ســاوادەچێ، کلکی درێژەو لەدەشت و دەر گوانی بزن دەمژێت و بۆیەش بەو

ناوەنراوە، هەربزنێک بزن مشکە بیمژێ شیرەکەی ووشک دەکات.

١٣- **سـیخوڕ:** گیانلەبەرێکە بەقەد پشـیلەیەک دەبێت، هەموو لەشـی بەتووک و پەڕاموچەی تیژ داپۆشـراوە، رەنگی بۆرەو لانەکەی لەشـوێنی نەرمەلان دروسـت دەکات، ژیانی لەسـەر خواردنی گیا بەندە، پەڕامووچە تیژەکانی بۆبەرگری لەخۆ بەکار دێنی، جاران فەقێکان ئەو پەڕامووچانەیان دەکردە پێنووس.

١٤- **پشیلە کێوی:** جۆرێکە لەپشیلەو جینجرە، لەپشیلەی ئاسـایی گەورەترەو چاوتیژترەو دڕترە، لەدەشـت و دەر دەبینرێت ، گەر مرۆڤ ببینێ رادەکات.

١٥- **سـمۆرە:** بەقەد بێچووی پشـیلەیەو بچووکەو تووکنە، رەنگی مەیلەو سـوور و خاکیە، لەناو دارسـتاندا دەژی، لانەکەی لەنـاو داردا دروسـت دەکـات، حەزی لەگوێزو چەقەلەو بەڕوە.

١٦- **بزنەکێوی:** جۆرێکە لەبزن و بەڵام تووکی زۆر نیە، لەشـاخ و کێودا دەژی، حەزی لەرۆیشـتنی سـەر شـاخ و تاشـەبەردی گەورەیە، گۆشـتی خۆش و بەتامە، جاران لەچیاکانی خۆشناوەتی بوونی هەبوو بەڵام ئێستا نەماوە.

١٧-**شـــوور:** گیانلەبەرێکی گەورەیەو قۆچەکانی گەورەو بەگرێیەو قەدی لێدەبێتەوە، بەقەد گۆلکێکی گەورەدەبێ، جاران لەچیاکانی خۆشناوەتی بوونی هەبوو بەڵام ئێستا بەهۆی راوکردنەوە نەماوە.

١٨-**پڵینگ:** لەکۆمەڵەی پشـــیلەیەو بەڵام چاوتیژو خێرایە لەپەلاماردانداا، لەچیاکانی خۆشـــناوەتی بەرەوە هەبوون بەڵام ئێســـتا تاک و تەرا ماوە، گیانلەبەرێکی گۆشـــت خۆرەو لەچیا دەژی.

١٩ - **بووری بەیانی:** (بەور) جاران لەچیاکانی خۆشناوەتی هەبووەو زۆربە پڵینـگ دەچێ، بەڵام وەکوو پڵینـگ جینجرنیەو رەنگی بۆرە، لەبەیانیان هێرشـی دەکردە سـەر رانە بزن و مەڕ بیە بەم ناوە نراوە، ئێستا نەماوە.

٢٠ - **کەروێشـــکی کێوی:** رەنگیان بۆرەو لەســـەر کلکی سـپیەو لەکەروێشـکی ماڵی گەورەترەلەراکردندا خێرایەو هاوینان لەناو بێســـتانی گندۆرەدا دەبینرێن، زســـتانانیش داری ئەسپیندار سپی دەکات توێکڵەکەی دەخوات.

٢١ - **کیسـەڵ:** گیانلەبەرێکی خڕی توێکڵەدارەو بەرگەکەی رەقەو زۆربەزەحمەت درنــدە زەفەری پێــدەچێ، بەقەد تۆپێکی ئاســـایی دەبێت، هێلکە دەکات و لەژێرگڵ دایدەنێ و نـایچێتەوە ســـەری ، بەڵکوو هەرناشـــیان بینێتەوە،

گیاخۆرەو حەزی لەتووخواردنە، باز ئەگەر راوی بکات لەئاسمانەوە فڕێی دەداتە خوارەوە بۆئەوەی توێکڵەکەی بشکێ دواتر دەیخوا.

٢٢- **رقیاو:** جۆرێکە لەکیسەڵ، بەڵام رقیاو ئاویەو کەم دێتە دەرەوەو کلکی لەکیسەڵ درێژترەو خێراترە.

٢٣ - **ژووشک:** گیانلەبەرێکی دڕکاویەو خڕەو بەقەد تۆپێکی بچووکە، ئەگەر مەترسی بۆهات خۆی خڕدەکاتەوەو هیچ گیانلەبەرێک ناتوانن زەفەری پێببەن، گۆشتەکەی دەخورێ بەڵام بۆسەربڕین بەزەحمەتە ، دەبێ لەناو تەشتێک ئاوی بکەی و بە سووژن لەلووتی رابکەی ئینجا سەری ببڕن، ئەڵێن گۆشتەکەی بۆباداری باشە.

٢٤ - مار: چەند جۆرێکی هەیەوەکوو:

-*عەزیا: ماری لەراددەبەدەر گەورە و ژەهردارەو ترسناکە.

-*شینی گانگێو: جۆرێکە لەمارو مەترسی دارەو زۆر خێرایەو رەنگی مەیلەو شینە، بۆیە بەم ناوەنراوە دەتوانێ بەپێوەدان گا بمرێنێ.

-*هەسپەمار: وەکوو ئەسپ سەری بەرزدەکاتەوەو ترسناکەو ژەهرەکەی کاریگەرەو زۆرخێرایەو وەکوو برووسکە دەردەچێت.

-*مـــاری رەش: ئەگەر رەنگی تەنهـــا رەش بوو ئەوا ترســـناک نیەو ســـەلامەتە بەڵام رەش بێت و بن ســـینگی سوور بێت ترسناکەو ژەهردارەو خێرایە، رەشـی دێزەش ژەهرەکەی ترسناکە.

-*کۆرەوەی بـاو: رەنگی بۆرەو زۆر درێژ نیەو خێرانیە لەراکردندا، لەسـەر رێگا خۆی کۆدەکاتەوەو زۆرمەترسـی دارە.

-*ماری سـەرسـپی: رەنگی بۆرەو زۆرگەورەنیەو سـەری سپیە، ئەم جۆرە مارە خێرایە لەراکردنداو مەترسی دارە.

-*زەردەمار: رەنگی زەردەو وەکوو برووسکە دردەپەڕێت و زۆر خێرایەو ترسناکە.

-*تیرەمار: رەگی مەیلەو زەردەو باریکەو تابڵێی خێرایە، زۆربەزەحمەت دەکوژرێ و زۆرمەترسی دارنیە.

-*ماری ئاوی: رەنگیان مەیلەو سەوز و نزیک لەسوورەو ژیانیان لەناو ئاوەو زۆرمەترســـــی دارنین، هەندێک کەس ئەڵێن ژەهری نیە.

٢٥- **داکەمـــار**: رەنـگـی ســــــەوزێـکـی مەیـلەو بـۆرە و بەقەدەربستێیک دەبێت، ژیانی لەناو جۆگەو شـوێنی نزیک ئـــاوو مێرگە، خواردنی مێش مەگەزە، بەبڕو بلعـــاتچی

ناوبانگی هەیە، ئەگەر یەکێک زۆر بڕوبلعات چیبێ ئەڵێن (بڕوبلعاتی وەداکەمارێ ئەچن).

٢٦- **خەمەگڕوو:** هێندەی داکەماردەبێت بەڵام گۆشــتنترە، لەســـەر بەردی گەورەو شـــاخەکاندا دەبینرێت، ناوەناوە ســـەری لەســـەر بەرد بەرز دەکاتەوە، لەئایینی ئیســـلام کوشـــتنی حەڵاڵ کراوە و بەو هۆیەی گوایە لەکـاتی پێغەمبەر لەغـاری حراٶ دەبن خەمەگڕو لەســـەر ئەشکەوتەکە سەری بەرز کردۆتەوە ئەوەش نیشانە بووە بۆ ئەوە کە پێغەمبەر لێرەیە، بۆیە بەتـایبەتی خەڵکـانی دیندار خەمەگڕوویان دەکوشــتن، بەڵام ئێســتا ئەو نەریتە نەماوە.

٢٧- **مـار میلۆک:** رەنگی بۆرەو خەتێکی رەش بەســـەر پشــتیدا هاتووە، لەدەشــت و دەر دەژی، خواردنی مێش و مەگەزو مێرووی ووردەو بەقەد قولانجەیەک دەبێت.

٢٨- **بۆق:** چەند جۆرێکی هەیە وەکوو:

-*بۆقی ئاســایی: رەنگیان مەیلەو بۆرەو لەشـوێنی نزیک ئاوو مێرگدا دەژن، خواردنیان مێش و مەگەزە.

-*بۆقە شینکە: بچووکن و رەنگیان شینی ئاڵە.

-*بۆقی ســـەوز : گچکەیەو بەهـاران لەنـاو گژوگیـا دەبینرێن.

# جۆرەکانی گوڵ و کروک

بەهۆی هەڵکەوتەی خۆشناوەتی کەبەشێکی دەشتەو بەشێکی دۆڵەو بەشێکی زۆریشی گردۆلکەو بەرزایی و لووتکە و چیاو شاخە، بۆیە هەم کروک و گوڵی دەشتی لێرواوە هەم گوڵ و کروکی کوێستانیشی لێ هەیە، بۆیە لێرەدا هەم پۆلینی جۆرەکانی دەکەین وەهەم ئەو وەرزانەی کە گوڵەکان و کرووکەکانی لێ شین دەبن:

کرووک و گوڵی بەهاران:

١- پەلەزێ: لەبەهاران شین دەبێت سێ پەلکەیە یان زیاترە، رەنگیشیان لەنێوان سپی و وەنەوشەیی یە، رەنگی جوانەو هەروەها دەخورێت و بەتامە، جاران دوای لێکردنەوەی لای بنی کرووکەکەیان دەگرت و دەیان سوڕاند و ئەیان ووت:

پەلەزێ پەلەزێ پەلەزێ

بزێ بزێ بزێ بزێ

وەختی کارۆکەو مەڕۆکان بزێ.

٢- پەلەزێی مێرگان:هەمان شێوەی پەلەزێی ئاسایی هەیە ، بەڵام رەنگیان وەنەوشەیی یەو بڵند تریش دەبن زۆر پێش چاوو جوانترن.

٣- كروك عاجيلە:رەنگيان سپى و ناوەڕاستەكەشيان مەيلەو رەشەو بالايان زۆر بڵند نيە.بۆدەرمانى كوردەوارى بەكاردەهێنرا لەگەڵ چەند جۆرە گيايەك تێكەڵيان دەكرد.

٤- كرووك فەقێ: رەنگيان لەنێوان قاوەيى و وەنەوشەيى يە، بالايان بڵندەو گوڵەكانى لەدواى يەكن بەقەد قولانجەيەك هەڵدەكشێن.

٥- كرووك ماست: كرووك نيسانيشى پێدەڵێن ، لەهەموو جۆرە رەنگێك هەيە، زۆربەيان سێ پەلكەو چوارپەلكەيە، بۆيە ئەم ناوەى لێنراوە كاتى پەيدابوونى ماست شين دەبن.

٦- كنێر:گوڵەكەى زەردەو بۆنى خۆشەو دووجۆرى هەيە، كێوى و ماڵ، مەبەست لەماڵيەكەى لەدەشتايى شين دەبن ، بەڵام كێوى تەنها لەچيا دەڕوێن.

٧- گورە روون: ئەم گوڵە لەشوێنى دەشتايى نيە ، بەڵكوو لەچيا شين دەبێ، گوڵەكەى زەردە، بۆنى خۆشە، بالاى بەرزە بەڵام گوڵەكەى كچكەيە، بۆيە ئەم ناوەى لێنراوە چونكە بەسەر مەشكەيان وەدەكرد و گوايە مەشكەكە رۆنى زياتر دەبێ.

٨- کرووک بوکۆرە: لەبەهـاران دەڕوێ ، لەشـــوێنی دەشـت ، بالآی بەرزەو رەنگی گوڵەکەی سـوورەو چوار پەلکەیە ، بۆیە بەم ناوە نراوە منداڵان بەتایبەتی کچ دەیان کردە بووکۆرە، لەکاتی چنینیدا شـــیرێک دەردەکات لەهەر شـوێنێکی دەسـت بدەی سـووردەبێ ، منداڵان لەبەهاراندا بەشـــیرەکەی نەخش و نیگاریان لەســـەر پشـــتەدەســـت باسکیان دروست دەکرد.

٩- نێرگز: لەبەهاران شین دەبێ پێویست بە باسکردن ناکات.

١٠- ســـووســـن: لەبەهاران شـــین دەبێ، پێویســـت بەباسکردن ناکات.

١١- ســمبل: رەنگی وەنەوشـەیی یە و لەبەهاران شـین دەبێ و بۆنی خۆشـــەو بالآی بەرزە، لەچەند پەلکەیەک پێکدێت.

١٢- شـــلێر: هەموومـان بینیومـانە.دوای چنین و لێکردنەوەی ئەیان ووت:

شلێرێ مەگری مەگری
وێکڕان ئەچینە قەبری
قەبری تەنگ و تارە

تێیدا مشـــــک و مـارە.....هتد، ئیدی هەنـدێ دڵۆپە ئـاو لەچاوەکانیدا دروست دەبوون.

١٣- مێلاق: ئەمەشیان پێویست ناکات باسی بکەین.

١٤- بنەوش: یان وەنەوشـــە: لەبەهاران شـــین دەبێ و لەناوباخچەکاندا هەروەها لەچیاش شـین دەبێ، رەنگەکەی هەربەنـاوەکەیەوە وەیەو تـابڵێی بۆنی خۆشـــەو گەڵێک جـارلەگەڵ چـایە دەکرێ بۆتـام خۆشـــی، هەروەهـا بۆدەرمانیش بەکاریان دەهێنا.

١٥- پەپـوولە: گـولـێـکـی زۆر بـچـووکـی رەنـگ زەرددەردەکات ، گیایەکەشی خۆش و بەتامە.

١٦- گورە هێلکە: رەنگی زەردەو وەکوو هێلکە وایە و بۆنی خۆشە.

١٧- گورە ئەشرەفی:جۆرە گوڵێکە بەهاران شین دەبێ ، بۆنی خۆشە.

١٨- گورەباغ:جۆرێکە لەگوڵی ماڵی لەناو باخچەکانـدا دەیان چاند ، گوڵێکی پێش چاوو جوان و بۆن خۆشە.

١٩- شـــیلانە: بەهاران شـــین دەبێ و چوارپەلکەیە و رەنگی مۆرە و بۆنی خۆشە بەڵام زوو دەوەرێ.

٢٠- جوانە مەرگ: جۆرێکە لە کروکی پـاییزی، دوای کەوتنی بـارانی پەرە لەنـاو بـاخچەکـانـدا دەڕوێ، وەکوو

ســـووســـــن وایە بەڵام ڕەنگیان جیایە لەنێوان ســــپی و بۆرەکەدایە.

٢١- لەیل و پەڕ: گوڵێکە لەهـاوینـاندا لەدەورەی کەپرو سابات دەیان چاندو بۆنی خۆشە.

٢٢- هێرۆ: بـاڵای بەرزەو چەنـد قەدێـک دەردەکـات، گوڵەکـانی جۆرەهــا ڕەنگن، وەبۆ دەرمــانی میللیش بەکاردەهات دوای ووشککردنی گوڵە هێرۆ دەیان هاڕی و لەگەڵ چەند گیایەکی تر تێکەڵاویان دەکرد.

# ناو و جۆرەکانی گیا

-**تۆرکە:** ئەوەیان لەهەموو شـــوێنێک هەیەو پێویســـت بەباســـکردن ناکات. جاران وەکوو دەرمان بەکار دەهێنرا بەتایبەتی بۆ زگ ئێشە.

-**گیا پەرچێوە:** گیایەکی پایزی و بەهاریە بڵند نابێ و بەزەویەوە دەنووسێ ، لەگەڵ تۆرکە دەکوڵێنرێت، بەتام و خۆشـــە. جاران گیا پەرچێوەو خەرتەلەیان تێکەڵ یەک دەکرد تەرەسازیان لێدروست دەکرد.

-**مام دەرزیلە:** بەهاران شـــین دەبێ، نێرکێک دەردەکات بەشـــێوەی دەرزی، بەهەمـــان شـــێوە لەگەڵ تۆرکە دەکوڵێنرێ.

-**مام جێژنە:** وەکوو تەرەو توولە وایە و بەهاران شـین دەبێ ، لەگەڵ تۆرکەو ئەوانی تر دەخورێ.

-**کوڕادە یان قوڕادە:** لەناو زەویەبەراوەکاندا شـــین دەبێ، وەکوو کەوەر وایە، هەم لەگەڵ ساواردەیان کوڵاند هەم لەگەڵ ئەستوورک دەکرێ و تامی خۆشە.

-**گۆرمزە:** گیایەکی کەمێک دڕکاوییە و بەهاران دەڕوێ، لەگەڵ هێلکە دەی کوڵێنن ، هەروەهـا وەکوو دەرمـانی قەبزیش بەکـاردەهێنرێـت، گۆرمزە بەبـاران بڕ نـاوی دەبرێت واتا ئەگەر ســاڵێک گۆرمزە زۆربێت ئەڵێن باران

کەم دەبارێت، گۆرمزە بەگیایەکی زۆر ســـوود بەخش دادەنرێ، جاران ئەیان گووت: کوریکەی گۆرمزە بۆمندال زۆرســـوود بەخشـــەو خێرایی گەشـــەکردنی زیاد دەکات، هەروەهـا ئەیـان ووت دەرمـانی دژە ژەهریشـــەلەنـاو جەستەی مرۆڤ، وەکوو نموونە دەربارەی گۆرمزە ئەیان گێڕایەوە:

کیســـەڵێک دوای ئەوەی مـارێکی مردووی خواردووە، بۆدەرکردنی ژەهرەکەی چۆتە ســـەر بڕکە گۆرمزەیەک و خواردوویەتی.

-*کەڤرۆکەیان گەپرۆکە: لەسەرەتای بەهاردا دەردەکەوێ زۆر بەنرخە، لەشـــوێنی عاســـێ دەڕوێ، دوای کولاندنی لەگەڵ مـاســـت تێکەڵ دەکرێ زۆر بەتامە، ئەم خواردنە زیاتر لەشـــەقلاوە بەکاردەهێنرێت، تەمەنی کورتەو هەرکە شین دەبێ و دەبێ زوو بیپڕێنی ئەگینا زوو زەرد دەبێ و کەلکی خواردنی نـامینێ، جـاران ئەگەر یەکێک دوعـایەکی لەیەکێـک کردبـا ئەیـانوت (رەببی عومرت بەعومری گەپرۆکەی بێت) ، هەروەها دەووترا:

گەپرە بەنانی
گۆشتی بەرانی
گەپرە بەخوێیە
گۆشتی بەرخێیە

گەپرە بەماستی
چێشتێ بەڕاستی.
-*قجیلە: ئەویش گیایەکی بەهاریەو تامی خۆشە.
-*سێبسکورە: بەهاران لەشوێنی دەشتایی دەڕوێ، لەبەر ئەوەی سێ پەلکەیە بۆیە بەم ناوە نراوە، ناوەوەی پەلکەکان زەردن، دوای کوڵاندن لەگەڵ ساوار لێدەنرێت، چێشتێکی خۆشە، هەروەها بۆ دەرمانیش جاران بەکاریان دەهێنا.
-*پێ کۆترۆکە: وەکوو پێی کۆتر وایە و خۆی پان دەکاتەوە بەسەر زەوی، گیایەکە وەکوو ئەوانەی باسمان کردن دەخورێ.
-*سلێرک: لەشوێنی بەرزو چیا شین دەبێ ، بەهاران دەکرێ و زۆر بەتامە بەتایبەتی لەگەڵ ساوار، ئەمە جگەلەوەی کە دەخورێ، هەم وەکوو دەرمانیش بەکاریان دێنا، هەروەها جەویەکەی وەکوو سیکۆتینی ئێستا وابوو کەفەقێکان بۆچاکردن و بەرگ کردنی کتێب دوای ئەوەی کەماوەیەک لەناو ئاویان دەکرد، ئینجا بەکاریان دەهێنا، هەروەها جۆلاو مەسیحیەکانی شەقڵاوە کەکاری کر دروست کردنیان دەکرد، لەکرەکەیان دەداو ئیدی کرەکە رەق دەبوو و قەدەکەی نەدەشکا.

-***کەتیرە:** گیایەکی دڕکاویە بەقەد بستێک لەزەوی بەرز دەبێتەوە، لەناوەڕاستی سەدەی رابردوو هەورامیەکان دەهاتنە خۆشناوەتی ژێر کەتیرەیان دەکێڵاو لەچەند شوێنێک قەدەکەیان بریندار دەکرد، پاش ماوەیەک جەویەکی دەردەکرد، وەکوو ئەوەی لەدارچەقەلە دێتە دەرەوە ، کۆیان دەکردنەوەو دەیان فرۆشت، وەکوو سیکۆتینی ئێستا وابوو دوای نەرمکردنەوەی بۆزۆر شت بەکاریان دەهێنا، بەتایبەتی مەلاو فەقێ بۆبەرگکردن و چاکردنەوەی کتێب بەکاریان دێنا.

-***ترشۆکەی کێوی:** گەڵاکانی زۆرگەورە نین لەدەورەی تەڕاشدا شین دەبن لەمانگی ئادارو نیسان ، تامی ترشە، بۆیە بەم ناوە نراوە.

-***ترشۆکەی دەشت:** ئەمەیان گەڵاکانیان گەورەیە لەدەشت و دەرپەیدا دەبن، گەڵاکانی بۆ ئاپراغ بەکاردەهێنن.

-***خەرتەلە:** بەهاران شین دەبن باڵای بەرزەو قەدەکەی دوای لێکردنەوەی پەلکەکەی بەتام و خۆشە.

-***قەلەندۆر:** گیایەکی دڕکاویەو بەهاران پەیدا دەبێ، وەکوو خەرتەلە پەلکەکەی لێدەکرێتەوەو دەخورێ.

-*قەرەمەشـــەکرۆکە: گیایەکی دڕکاویەو باڵای زۆربەرز دەبێ لەســـەرووی تۆپێکی دڕکـاوی دەردەکـات، دوای لێکردنەوەی دڕکەکان دەخورێ.
-*کوزەرە: لە دەو ئاووکانی و جۆگەدا دەڕوێ.
-*بەندەکە: بەهەمان شـێوە لەدەو کانی و گۆم و جۆگەو رووبار شین دەبێ.
-* **کاردی شـاخی**: ئەم کاردیە لەچیاو شـوێنی عاسـێ دەڕوێ گەڵاکانی پاننو درێژن، بۆدۆلمە بەکاردێ ، دوای ئەوەی ماوەیەک لەبەر ترشی دەکەن.
-***کاردی ریشۆری**: لە دەشـت و دەرو چیا شـین دەبێ و بەرەغبەتە.
-***کـاردی قوڕێ**: کـاردیەکی گەڵا بچووکەو دوای ئەوەی لەناوسـرکەو سـماق دەکوڵێنرێ، لەگەڵ سـاوارو برنج و بەتنیاش دەخورێ.
-***کاردی ریخێ**: هەروەک کاردی قوڕێ وایە.
-***پیرفۆک**: گەڵاکانی سـەوزن و ناوەڕاسـتی هێڵێکی سـپی تێدایە، بنەکەی دوای هەڵکەندنی دەخورێ.
-***پیرەبـاو**: گیـایەکی کورکنە، دوای هەڵکەنـدنی بنەکەی دەخورێ و بەتامە.
-***قاقۆزبەراز**: گیایەکی بەهاریە ، بنەکەی وەکوو سـێوبن عارد وایە دوای سپی کردن دەخورێ.

-*پیرەحورچن: بەهەمان شـــێوەی پیرەباو وایەم دوای هەڵکەندنی دەخورێ.
-*هەندرێشـــە: گیایەکی کوێســتانیە لەمانگەکانی ســێ و چوار دەڕوێ ، تامی خۆشـەو هەروەها وەکوو دەرمانیش بەکاریان دێنا ، وەکوو ســـەوزەش دەخورێ. هەروەها هەندرێشـــە لەگەڵ ماســتیشــدا دەخورا، هەروەک دەیان گووت:
هەندرێشەو ماست خواردنێ میرانە.
-*ســۆریازە: وەکوو هەندرێشـــە وایە ، بەڵام ســۆریازە لەگەڵ ساوار لێ دەنرێ و بەلەزەتە.
-*گـاگۆز: گیـایەکی بەهـاریە، بەتـامە، جۆرێکە لەقەلۆک، وەکوو فاێۆلیاو لۆبیا وابیەو دەنکەکانی خۆشن.
-*قەلۆک خاتوون: خۆشـترین جۆری قەلۆکەو زۆرناسـک و بەتامە.
-*قەلۆک مـار: جۆرێکی تری قەلۆکە قەلیەکەی درێژەو بەقەلۆکی مارناسراوە.
-* پەپوولە: جـۆرێکە لەگیـای بەهـاری ، لەکـاتـی پەیدابوونی گەڵاکانی دەخورێن، پاشانیش دەبێتە قەلۆک.
-* پوونـگ: ئەم گیـایە کەهەمـوو وەرزێـک لەدەو رووبـارو کـانی و ســـەرچـاوەکـانی ئـاودا بوونی هەیە، جـگەلەوەی کەلە چـێشـــت دەکـرێ ، بەتـایـبەتـی

لەخواردنی(دۆین) دەکرا کەتامی خواردنەکە خۆش دەکات، بۆزۆر نەخۆشـــیش بەکـاردەهێنرا، ئەمە جگەلەوەی پوونگیان لەگەڵ دەراو لەســـەر کەپری نووســـتندا دادەنا کەتا ماوەیەک بۆنەکەی دەما و خەوی خۆش بوو.

-***تارین:** ئەمەشـــیان جۆرێکە لەگیاو زۆر بەرز نابێ و لەکاتی لێکردنەوەی شیر دەردەکات.

-***کەرکوخ یان کەرخنکێن:** ئەم گیایە بالآی بەرزەو وەکوو گەنم و جۆ گوڵێک دەردەکات بەڵام بەهۆی ئەو داســـیە درانەی کە هەیەتی لەگەرووی ئاژەڵدا گیردەبێ و گەلێک جار دەبێتە هۆی خنکانی.

-***دۆرین:** جۆرێکە لەگیـای بەهـاری جـاران بۆ دەرمـان پزیشکی میللی بەکاری دەهێنا.

-***گیـا جۆ:** وەکوو جۆ وایەو زۆر خۆرایە واتـا ئـاژەڵ حەزی لێدەکات.

-***قاپ شـــینکە:** زۆر بەرز نابێتەوەو بەهاران پەیدا دەبێ، ژێی قەدەکانی مەیلەو شینە.

-***پیزپیزۆک:** ئەم گیـایە لەمێرگ و شـــوێنێـک کەئـاوە بەردەوامی لێهەبێ دەڕوێ، چەند قەدێکی درێژ دەردەکات ، زۆر چرەو جاران بۆ بەســـتنی شـــتڵی تەماتەو بیبەرو بـاینجـان و تووتن بەکـاریـان دەهێنـاو بەو لاچکە دەیـان بەستن.

-*دەراو: گیایەکی نەرمۆکەیە هەم ئاژەڵ زۆر حەزی لێیەتی و هەم بۆ دانان لەسەر کەپری نووستن بەکاردەهات، وەبۆ کەپری کوندەو ئاوی شەوی بەکاردەهێنرا.

-*گیاحەسیر: ئەمەشیان گەڵاکانی چڕن وەکوو حەسیروایە.

-* شاوێر: گیایەکە تەنها بەهاران پەیدا دەبێ، لەگەڵ تۆرکەو پەپوولەو قجیلە تێکەڵیان دەکردو لەسەر (سێر) ساج دەیان برژاند، بتام و لەزەت بوو.

-*کرتی: گیایەکە لەناو زەوی و لەچیاش شین دەبێ و زۆربەهێزەو بەزەحمەت هەڵدەقەنرێ.

-*گۆنیژ: گیایەکە بەهاران شین دەبێ، بالای بەرزەو بەرێکی وورد دەردەکات، دوای ووشک بوونی جاران لەناو لانکیان دەناو نەرم بوو بۆمنداڵ، هەروەها ئەو بەرەی دەیدا بۆزۆر داوو دەرمان بەکاریان دەهێنا.

-*گیاگێزەر: گیایەکی خۆرایەو ئاژەڵ حەزی لێیەتی ، هەروەها بنەکەشی دوای هەڵکەندنی زۆرخۆشەو لەیەکمان دەبەست و وەکوو فیشەکدان لەملن دەکرد.

-* قەمیش: گیایەکی ترە لەناوچەی خۆشناوەتی رەگەکانی بەهێزن زۆربەزەوی دا دەچێتە خوارەوە.

-*پەمۆگشــتە: گیایەکی بەهاریەو لەزۆر شــوێن دەڕوێ، لاســکەکانی بەهێزن، نێرکێک دەردەکات وەکوو پەمۆوایە، دوای لێکردنەوەی بەرگەکەی زۆر شـــیرین و بەتـام و خۆشە.

-*تاریشک: گیایەکە هەم لە چیا وەهەم لەدەشت دەڕوێ، ئەوەی لەچیـا دەڕوێ هیچ ســـوودێکی نیە و ئـاژەڵیش نایخوا، گەڵاکانی گەورەن، بەڵام ئەوەی لەدەشـــت شـــین دەبێ ئاژەڵ بەگشـــتی حەزی لێدەکات و گیایەکی خۆرایە، کەمێک دڕکاوییەو شـــیری لەقەدەکانی دێت، کەو زۆر حەزی لێ دەکات.

-*سـمرکە: رەنگی سـوورە و وەکوو بژار لەناو شـینایی دەڕوێ.

-*پرپینە: گیـایەکە تـاکوو پـاییز هەیە و لەگەڵ نیس دەخورێ.

-*گورگە: گیـایەکە گوڵەکـانی ســـپی و مۆرن و لەژێر تەمـاتە و تووتن دەڕوێ، گەرزوو هەڵنەکەنرێ ئەوا ئەو رووەکە وشک دەکات.

-*زەنگورە: باڵای بەرزەو لەســەرووی قەدەکانیدا تۆپێکی خڕ دەر دەکات.

-*گیا ســـاردیلە: جۆرێکە لەگیا لەناو شـــینایيدا دەڕوێ، وەکوو بژارە، زۆر بەهێزنیەو ڕیچکەکانی زۆر بەزەویدا ناچێتە خوارەوە و ئاسانە لەهەڵکەندن.

-*تەقتەقۆک: گیایەکی دڕکاویە و بەرێک دەردەکات خڕەو روونە دوای لێکردنەوەی بەنێوچەوانیان دادەدا و دەتەقی.

-*مژمژۆک: لە ژێر تاشـــەبەرد بەهاران دەڕوێ، گوڵێک دەردەکات، کاتێ لێدەکرێتەوە دەیمێژن و ئاوەکەی شیرینە.

-*گیاســـێوەڕە: پنجەکەی گەورەیەو ســـەوزەز گوڵی رەنگاو رەنگ دەردەکات، گیایەکی زۆر خۆرایەو ئاژەڵ بەگشتی حەزی لێیەو بەزۆری لەناو چۆمە سپیندار شین دەبێ.

-*چەور: ئەم گیایە لەکوێســـتانەکاندا دەڕوێ، گیایەکی خۆرایە، هەم بەسەوزی هەم بەووشککراوی، بەزستانان ئاژەڵ بەتەنیاش بیخوا بەرگەی برسیەتی دەگرێ.

-*لاولاوە: جگەلەوەی کەلاولاوەیەک لەدەورەی کەپرو ســـاباتدا دەچێنن بۆجوانی، لاولاوەیەکی تر هەیە کە قەدەکانی درێن و گوڵێکی بچووکی ســـپی دەردەکات ، گیایەکی خۆرایەو هاوینان دەیدەن بەدابەستی.

-*گیابنێشـــت: بالای کورتەو مەیلەو بۆرە ناوگەلاکانی سپین، دوای هەڵکەندنی وەکوو بنێشت دەجووێ.

-***گەنمی کوێژیلی:** گیایەکە باڵای کورتەو جۆرە بەرێکی وورد دەردەکات، کوێشکە دەیخوا، وەکوو گەنم وایە بەڵام ووردە.

-***گیاریشــی:** ریشــیەکانی پان و گەورەن و دەوروبەری خۆی دادەپۆشی و تادرەنگی هاوین دەمینێ.

-***گیاقایش:** گیایەکە پەلک پانەو درێژدەبێ و زۆرخۆی رادەگرێ، بەهێزە بۆیە ناویان ناوە قایش، وەکوو قایش چڕە.

-***زیوان:** گیـایەکی بـاڵا بەرزەو چەنـد قەدێکی درێژ دەردەکات، گوڵێکی مۆر دەردەکات، لەناو گەنم و جۆ شین دەبێت.

-***گلێرە:** لەنـاو گەنم و جۆ دەڕوێ، دەنکەکەی لەگەڵ گەنم تێکەڵ دەبێ کەخڕەو ووردەو رەنگی رەشە.

-***نووســـەکە:** گیایەکە لەناو گەنم و جۆ دەڕوێ، بەرێکی وورد دەردەکـات، بەرەکەی دڕکـێـکـی وورد و نەرمە بەهەرشوێنێک وەبنووسێ بەزەحمەت لێی دەبێتەوە.

-***رووکێش:** گیایەکی پەلک پانەو دەورەی خۆی دادەگرێ، ئەو گەڵایە بۆدەرمـان بەکـاردەهێنرێـت، بەتـایبەتی ئەگەر یەکێک شــوێنێکی ئاودز ببێ یان بۆ هەرێشــنی شــوێنێکی لەش ئەم گەڵا یەیان لەســـەر دادەنا ئیدی بۆماوەیەک کێم هەواکەی دەردەکات و سارێژ دەبێ.

-***بارێزە:** گیایەکە جاران بۆ دەرمان بەکاریان دەهێنا، لەهەندێ شوێن بەپیرۆزی دەزانن.
-***گیا چنار:** گەڵاکانی بەشـــێوەی گەڵای چنارەو باڵاشـــی بەرز دەبێ.
-***گەزگەزۆک:** گیایەکە لەدەو ئاودا دەڕوێ، پەلکەکانی گەورە دەبن و باڵای بەرزە، بەهەرشـــوێنێکی لەش بکەوێ ئەو شـــوێنە دەخورێنێ و ســـوور هەڵدەگەڕێ، جاران بۆ نەخۆشـــی باداری و رۆمـاتیزم ئەو گیـایەیـان بەلەش دادەهێنا و ئەیان ووت بۆباو رۆملتیزم باشە.
-***گیاتەڕەبەن:** پنجی گەورەیەو بەدەورەی خۆیدا پەرت و بڵاو دەبێ، لەگەڵ تورکەو قجیلە دەخورێ.
-***شـــیرکوتک:** باڵای بەرزەو قەدەکانی رەنگیان مۆرەو شیرلەقەدەکانیدا هەیە.
-***ســـۆتکە:** گیـایەکە بەهــاران دەڕوێ، رەنگی مەیلەو رەشەو بۆدەرمان بەکاردەهات.
-***گیاسیرۆک:** رەنگی سەوزەو وەکوو سیر وایە.
-***سۆراو:** بەقەد بستێک لەزەوی بەرز دەبێتەوەو رەنگی سوورە.
-***رازیـانە:** گیـایەکی بـاڵا بەرزە ، بەقەدەر دووبســـت لەزەوی بەرز دەبێتەوەو بەرێکی وورد دەردەکات، بۆزۆر جۆرنەخۆشی وەکوو دەرمان بەکاریان دەهێنا.

جگە لەوانە ئەم جۆرە گیایانەش هەن:
کەرتەشـی، دەرزیلۆکە، زەنگورە، مەندۆک، شـیلم شـاتر، جۆداس، کەردڕ، کەرپووچۆکە، گونە پشیلە، حوشترالوک، گاگۆز، پەڕشـە، گێوژۆکە، دانە قەتێ، بنیشتۆکە، کاوسێنە، پێلەقە، خڕنووک، هەمبـانۆکە، گیـا ئـارۆزە، روکێش، گیابرینە، گیا زەرتک، پسکە، رەشکە، گەرچەک، کوژارک، دمکانە، برایم بۆگەنی، غەربەنگ، ترنجۆک، دۆبەسـەرە، تەونۆکە، سـورناتک، گوێ بەلە، تێروو، سـەپان ترێنکە، دارگەز، چۆغان، تۆسـی، بڕەسـۆرە، دڕکەزی، گۆگەم، پەرۆشـە، چەورۆکە، گیا زەنگورە، کراو قۆزە، نووسەک، گیا پراوە، گلێخەتوورۆکە، سێوەرۆک.

# جۆرەکانی دڕک

-*دڕی: شــوێنێک نیمایی ئاوی لێ بێ شــین دەبێ، زوو پەرەدەســـتێنێ و رەگ دادەکوتێ، زۆریش گەورە دەبێ، پەرت دەبێ و هەر قەدێکی بکەوێتە شــوێنێک زوو گەشــە دەکات، پاییزان بەرێک دەردەکات رەنگی رەشـە و بۆ زۆر دەرمان کاتی خۆی بەکارهاتووە، وەکوو دەڵێن: لەدەرەوە زۆربەنرخە، لەهەندێ شوێن(تووترک)ی پێدەڵێن.

-*زی: دارێی قەد باریکە لەزۆر شـــوێن بەخۆ رســـکی دەڕوێ، هەندێ کەس بۆ پەرژین دەیچێنن، زۆر دڕکاویەو رەگەکـانی بەهێزن زۆر ئـاســـتەمە تـاکوو لەنـاو دەچێ، بەرێـک دەردەکـات وەکوو (خەزێم)وایە، ئەو خەزێمە بۆ دەرمانی کوردەواری بەکاری دەهێنن.

-*لاس: جۆرێکە لەداری دڕکـاوی، گەڵاکـانی ووردن وەکوو گەڵای زەیتوون وایە، لەجیـاتی پەرژین لەدەورو بەری زەویەکان دەیچێنن.

-*قەرەمەســتری: جۆرێکە لەگیا، دڕکاویەبەڵام دڕکەکانی زۆر کاریگەر نین.

-*قەرەمە شــەکرۆکە: جۆرێکە لەگیا، نێرکەکەی زۆربەرز دەبێ، لەســەرووی نێرکەکە گوڵێک دەردەکات و دڕکاویە،

لەناو دڕکەکان شـتێکی خڕی لووسـی هەیە، شـیرینەو دەخورێ.

-*قونجرکە: گیایەکە زۆربەرز نابێتەوەو بەزەویەوەپان و بڵاودەبێتەوە، دڕکەکانی سێ لانەو تیژن.

-*نووسـەک: گیایەکەلەبەهاراندا شـین دەبێ و دواتر هـاوینـان بەرەکەی دەبێتە دڕکی ووردوورد، بەتـایبەتی بەتیسـک و مووی مەڕوو بزنەوە دەنووسـێ، ناوەکەشـی لەخۆیەوە هـاتووە زوو بەجلوبەرگی مرۆڤ و مووی مەڕومالاَتەوە دەنووسێ.

-*خڕنووک: جۆرێکە لەگیا نزیکەی دوو بسـت لەزەویەوە بەرز دەبێتەوە، بەرێک دەردەکات خرشـەو سـوورەو ئاردێکی سپی تێدایە، گەڵاکانی دڕکاویە.

-*تەق تەقۆک: گیـایەکی دڕکـاویەو بەهـاران دەڕوێ، بەرێـک دەردەکـات چەنـد رەنگێکە، بەهـاران ئەو شـتە لێدەکەنەوەو بەنێوچەوانی خۆیانەوە دەیتەقێنن.

-*کەتیرە: گیـایەکی دڕکـاویە، چەنـدقەدێـک دەردەکـات ، نزیکە دووبسـت لەزەویەوە بەرز دەبێتەوە، جاران خەڵکی هەورامـان دەهـاتن قەدەکـانیـان کەمێـک بریـندار دەکردو پـاییـزان دەهـاتنەوە (کەتیـرە)ی دەردەکـردو کۆیـان دەکردنەوەو دەیان فرۆشـتن، ئەو کەتیرەیە دوای ئەوەی

ماوەیەک لەناو ئاویان دەنا بۆچاکردنەوە کتێب بەکاریان دێنا، وەکوو سیکۆتینی ئێستا وابوو.

-*شـــیلان: هەم گوڵی بەهاریەو هەم درکەکانی بەهێزو تیژن، بـاڵای بەرزەو نزیکەی هەنـدێکیـان دوومەتر بەرز دەبنەوە، لەسەرەوەش گوڵێک دەردەکات.

# خوێندن لە حوجرەو مەدرەسەکانی خۆشناوەتی

مزگەوت و حوجرەو مەدرەسەکانی ئایینی لەکوردستاندا مەڵبەندی خوێندەواری و رۆشنبیری بوون، زۆربەی زانایان و شاعیران و نوسەران و کەسایەتییە ناودارەکان و سیاسییە بەناوبانگەکانی کورد، لەمزگەوت و حوجرەی کوردستان پێگەیشتوون، واتا یەکەم سەرهەڵدانی بزووتنەوەی رۆشنبیری لەوێوە چەکەرەی دەکرد و لەوێوە پەرەی دەستاند، خوێندن لەمزگەوت و حوجرە تەنها لەوڵاتی ئێمە پەیڕەو نەکراوە، بەڵکوو تاچەند ساڵێک لەسەدەی رابردوو لە وڵاتە ئیسلامییەکان و عەرەبییەکان بەهەمان شێوە بووە، وڵاتی میسر یەکێک بوو لەو وڵاتانەی کەوا بەلانکەی ئەم بابەتە دادەنرێ، کاریگەری ئەزهەری میسر رەنگدانەوەیەکی زۆری لەسەر مەلا و فەقێ و خوێندەوارانی کورد هەبوو، بەجۆرێک هەندێ مەلای (عەللامە) پەیوەندیەکی راستەوخۆیان لەگەڵ ئەزهەردا هەبووە، هەندێک لەمەلایەکانی کورد چوونەتە ئەوێ و لەوێوە پەرەیان بە خوێندن داوە.

تاکوو ئەمڕۆ مێژوونووسـان ئەوەیان بۆ سـاغ نەبۆتەوە کەئایا بۆیەکەم جار لەمێژوودا لەکوێ و لەناو چ کۆمەڵێکدا خوێندن و نووسین دەستی پێکردووە.

حوجرەو فەقێ لەکوردسـتـان دیاردەیەکی فکری و پەروەردەیی نـاو کۆمەڵگـای کوردەوارییە، بەڵام تـاکوو ئێسـتا تیشـک نەخراوەتە سـەر مێژووی یەکەم حوجرەو مێژووی سـەرهەڵدانی خوێندنی حوجرەو مزگەوت، کەئایا کەی و لەکوێ و چۆن فەقێیایەتی دەستی پێکردووە؟

لەوولا تی ئێمەدا لەسـەدەکانی هەژدەو نۆزدەدا گرنگی زۆر بە خوێـندنی حوجرەو مزگەوت دراوە، فەقێ و مەلا بۆخوێندن ئەزیەت و ماندووبوونی زۆریان چەشـتووە، بەهەژاری و مـانـدووبوونێکی لەرادەبەدەر ئەزیەتیـان کێشـاوە، خوێندن و ژیانێکی کۆڵەمەرگیان بەڕێ کردووە، لەم گونـد بۆئەم گونـد لەو حوجرەو بۆ ئەو حوجرە، پرسـیاریان کردووە کامە مەلا باشـە و کامە گوند خەڵکەکەی نـانـدەرە و دەتوانن راتبە بـدەن، ئەو کـاتیش وابوو خەڵک هەژار بوون و وەکوو ئێسـتا پێداویسـتی مەیسـەر نەبوون، بەڵکوو فەقێ بە (بوخچەیەک)کەبریتی بوو لە هەنـدێ جلوبەرگ و چەنـد کتێبێکی پەرپووت و دەستنووس، لەکۆڵیان هەڵدەدا بەدوای خوێندندا دەگەڕان،

دەگێڕنەوە فەقێیەک ئەوەنـدە حەزی لە خوێنـدن بووە سـوێندی خواردووە کەتاکوو پلەی مەلایەتی بەدەسـت نەهێنێ نەگەڕێتەوە مـاڵەوە، بڕیـار دەدات و دەچێتە ڕۆژهەڵاتـی کـوردسـتـان و لەخـزمەت یەکـێـک لەمەلابەڕێزەکان دەسـت بەخوێندن دەکات ، هیچ بیری بەلای ماڵەوەدا نامێنێ ، دوای ساڵێک نامەیەکی بۆ دەچێ، ئەویش نـامەکە نـاخوێنێتەوەو هەڵی دەگری، دوای ماوەیەکی زۆر و دوای چەند سـاڵێک چەندین نامەی تری بۆ دێن و بەڵام هیچیـان نـاخوێنێتەوە، دوای ئەوەی خوێندن تەواو دەکات و ئیجازەی مەلایەتی وەردەگری ئینجا بیر لەنامەکان دەکاتەوە، سـەیرەکات لەنامەی یەکەم باوکی ئەمری خوای کردووە، دواتر باپیری وپاشـان برایەک و خوشکی مردوون، تەنها دایکی ماوە.

گەلێک جاریش بەهۆی رکابەرایەتی و یەکتر نەخوێندنەوە و یەکتر قبووڵ نەکردنەوە کێشـە دەکەوتە نێوان فەقێکان و موسـتەعیدو مەلا، لەکۆتـاییـدا بوخچەکەی لەملی دەکردەوەو بۆشوێنێکی تر بارگەو بنەی لێدەناوە.

گرنگی خوێندنی مەلاو فەقێ و شـارەزابوون لە زمانی عەرەبی و شەرع و کتێبە فیقهییەکان و لەهەندێ مەدرەسە بیرکاریش دەخوێندرا، هۆکارێکی گرنگ بوو بۆپەرەپێدانی

خوێندن و خوێندەواری ، چونکە هەرچینی مەلا و فەقێ بوون ڕێنمایی خەڵکیان دەکرد بۆکاری چاکە و نەهیکردن لەخراپە، هەر توێژی مەلاکان بوون کە کاری حیسابات و وەرگێڕانی هەربابەتێک بۆ زمانی کوردییان ئەنجام دەدا.
لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم خوێندنی فەقێیەتی لە کوردستان ڕووی لە کزی کرد، دوای جەنگی دووەمی جیهانی ئەم کزی و لاوازییەی زیاتر بەخۆوە بینیوە.
بەڵام لەخۆشناوەتی بە هۆی نەبوونی قوتابخانە و دووری لەشار و نەبوونی ڕێگاوبانی ئۆتۆمبێل ، تاکوو ساڵی ١٩٧٠ خوێندنی فەقێیەتی هەر لەپەرەسەندندا بووە، دوایی بەرەبەرە قوتابخانە و خوێندنگا لە گوندەکان کرانەوە، بۆیە خوێندنی ناو حوجرەو مزگەوتەکان بەرەبەرە ڕووی لەلاوازبوون کرد، ئێستاش تاک و تەرا لەملاولەولا حوجرەماون، بەڵام وەکوو جاران نییە، یان با بڵێین بە شێوازێکی دیکە گۆڕاوە.

# سەرەتای خوێندنی فەقێیایەتی

فەقێ بەهەموو ئەو کەسانە وتراوە کە لەحوجرەو مزگەوتەکاندا دەیانخوێند، بەبێ رەچاوکردنی جیاوازی پلەکانیان، کەبەم شێوەیە قۆناغەکانی خوێندنی جاران پەیڕەو دەکرا (سوختە، مقدمات خوێن، ناسکە مستەعید، مستەعید)ئەم پلانە هەریەکەیان لەبەرانبەر یەکێک لەقۆناغەکانی خوێندنی ئێستادابوو.

یەکەم : فەقێ وشەیەکی عەرەبیە لەوشەی(فقیه یفقه فقیها) وە هاتووە، لەسەر وەزنی (فعیل)ەو ئیسمی فاعیله و بەمانای زاناو تێگەیشتوو دێت، لەرووی زاراوەیی یەوە فەقێ بەواتای زانا دێ بە شتە وردەکارییەکان کەلەژێر هەستی بینینی چاودا نین، بەڵکوو بەبیرو هۆش و زیهن فەرمانە شەرعیەکان دەزانێ وەک عیبادات (نوێژو رۆژوو و زەکات یا یاسای مامەڵەی کڕین و فرۆشتن و نیکاح و تەلاق) ، هەموو ئەحکامە شەرعیەکان و هەروەهاش زانا بەو زانیاریانەش کە پەیوەندیان هەیە بەئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە، وەک زانینی (نەحو و صەرف و بەلاغەو مەنتیق...تاد)فەقێ واتا زانا بەئەحکامە شەرعیەکان و زانینەکانی تریش.

دووەم مەلا:وشـــەی مەلا لە(ملأ  یملأ)ی عەرەبییەوە هاتووە، کە بە کوردی واتاکەی (پڕە) دەگرێتەوە، جالەبەر ئەوەی کە مەلا مێشـک و بیرو هۆشـی پڕبووە لە عیلم و زانســت و شــارەزا بووە لەزانینی هەموو زانیارییە ئایینییەکان ، بەشێوەیەک پڕبووە لە زانیاریە شەرعییەکانی ئـایینی ئیســلام و زانـایە بە هەموو ئومووررو فەرمـانە شەرعییەکانی ، بۆیە پێی وتراوە مەلا.

منداڵ دوای ئەوەی تەمەنی دەگەیشــتە حەوت ســاڵی و بەســەرەوەو تاژمارە بیســتی زانیبایە، ئەوە دەیان ناردە حوجرە یان مزگەوت ، باوکی یان کەسـێکی نزیکی لەگەڵ دەچوو و بەمەلاو فەقێکـانیـان دەگوت(خێرتـان دەگـاتێ کوڕەکەم یـان براکەم یـان ئەو خزمەم دینمە خزمەتتـان تکـایە وەری بگرن )ئەوانیش بەگوێرەی جێگەو رێگە وەریان دەگرت بەمەرجێک گوێ رایەڵ بێت و ســەعی بکات و جەمەدانی ببەستێ و نابێ بەسەری کۆتەوە بچنە حوجرە.

ئینجا ســیپارەیەکیان بۆپاک نووس دەکردو ســەرەتاکەی بەم شێوەیە دەستی پێدەکرد: یافتاح ، یارزاق، یاالله.

یافتاح فەتحم بدەی

یارزاق رزقم بدەی

یاالله تۆفیقم بدەی
پاشان پیتەکانی عەرەبیان بۆدەنووسینەوە کە (ئەلف و بێ) یان پێدەگووت.
ئەلف، بێ ، تێ، سێ، سین شین، ێاد زاد، تێ ، زێ.....هتد.
دوای فێربوونی پیتەکان ، تەحیات و فاتیحەیان فێردەکردن، حەرەکات و سەروبەرو ژێرو مەددەو شەددەیان جوان فێردەکردن، یەکەم جار بەشێوەی(حەجەیی) ی واتا پیت بە پیتیان لێک دەدایەوە دواتر بەرەوانی هەریەکەیان (زلە)گیایەکی لەدەست دەگرت و لەسەر پیتەکانی دادەنا، زلەکەبۆدیاریکردنی پیتەکان بوو، (بسم الله بێ لەژێربی، سین زەنەبیس ، میم لەژێرمی، لامەل فەلا، هێ لەژێرهی، بسم الله).
دوای تەواوکردنی سیپارە دەست دەکرا بەخوێندنی جوزئی عەممە، دواتر جوزئی تەبارەکەو پاشان جوزئی قد سمع الله، دواتر تاکۆتایی قورئانیان خەتم دەکرد.
هەندێک شوێن لەسیپارەو قورئاندا کاتێ کەفەقێ خوێندنی دەگەیشتێ، دەبوایە دیاریەک بۆمامۆستا بهێنێ وەکوو:
کە دەگەیشتنە لامەل فەلا مامۆستا لەبەرانبەردا ئەیگوت:
لامەل فەلایێ
سەرت دەکۆشێ دایێ

بینە تەبەقەی مامۆستایێ.
یان کەدەگەیشتنە سورەتی(نێ):
انه کان توابا
مریشکە رەشێ سەگبابە
لۆماموەستای بکە کەبابە.
یان کە دەگەیشتنە (فی عمد ممددە) ئەیان گوت:
فی عمد ممددە
باوت بەداکێ وەدا
تارۆژێ قیامەتێی بەرنەدا.
هەندێ فەقێش توانای خوێندنیان نەبوو و حەزیشـــیان لێنەبووە، بەڵکوو لەبەر ترســـی مـاڵەوەیـان چووبوونە حوجرە، بەڵام هیچ گرنگییـان بەخوێنـدن نەدەدا، بۆیە کە دەگەیشتنە سوورەتی (عبس وتولی) ئەی وت:
عبس خویندن بەسە
وتولی بوومە مەلا.
دوای خەتمکردنی قورئـان فێری خەت و نووســـینیـان دەکردن، ئینجـا نـامیلکەی (ئەحمەدی)یـان فێردەکردن، ئەحمەدی نامیلکەیەکە و فەرهەنگێکە بەشـــێوەی شـــیعر هۆنراوەتەوە، ئەمەیان بۆفێربوون و راهاتن بوو لەســـەر زمانی عەرەبی، کە بەم شێوەیە دەستی پێ دەکرد:

(راس) سەرە، (عین)چاوە
(بدن) قالبە، (اسم) ناوە
جبین و جبهت تەوێڵە
مکرو کیدو حیله فێڵە.

دواتر عەقیدەی شـێخ سـەمیعیان فێردەکردن کەبەزمانی کوردی بوو ، بەم شێوەیە دەستی پێدەکرد:

ئەوەل ئیبتیدا بەئیسمی الله
پس حمد و سەنا الحمدلله
ئەوجا سەلاوات لەسەر مستەفا
هەم ئال و ئەصحاب هەم تحت العبا.

# قۆناغ و پلەکانی خوێندن

١- سوختە: زاراوەیەکی فارسیە بەواتای سووتاو دێت، بۆیە بەم ناوەنراوە چونکە سوختە ماندوو بوو و سووتاو بوو بەئیش و کارەکانی ناو حوجرەو هێنانی راتبەو خزمەتکردنی موستەعید و پاکڕاگرتنی حوجرە، وەدەبوایە بەیانیان رایەخی مەلاو مستەعیدەکانیش هەڵگرێت و چایە لێبنێ، بۆیە سووتاو بوو، فەقێ ناوی سوختەی لەسەر لانەدەکەوت تاکوو لەخوێندن دەگەیشتە کتێبی(جامی) لەعیلمی نەحوو.

٢- ناسکەموستەعید: دوای خوێندن و تەواوکردنی کتێبی(مەلا جامی) دەبووە ناسکە موستەعید، بۆیە بەم ناوە دەناسرا چونکە سەرەتای موستەعیدی بوو، واتا لەقۆناغێکی ناسکدا بوو، ئیسراحەتی دەکردو ئیش و کاری بەسوختەکان دەکرد.

٣- موستەعیدی ئاخیرماددە: هەرکە دەگەیشتە خوێندنی کتێبی (شرح الشمسیە) یان (جمع الجوامع) پلەی فەقێیەتی دەگۆڕا بۆ موستەعیدی ئاخیر ماددە، واتا دوا کتێب و ماددەی دەخوێند، لەوێڕا ناونیشانی دەگۆڕا، بەویقاربوو، خۆی بەمەلا دەزانی، نوێژەکانی زۆربەی بەجەماعەت دەکردن ، سیواکی بەکاردەهێنا، ردێنی

نەدەتراشی، عەبای دەهاویشتە سەرشانی ، خەنجەری لەبەر پشتێن دەنا، چەند دەرسێکی دەووتەوە.

٤- مەلا: دوای تەواوکردنی تەواوی قۆناغەکان و دوای ئەوەی ئیجازەی عیلمی وەردەگرت ، ئیدی پلەی مەلایەتی پێدەبەخشرا، لێرەدا مەلا ئازاد بوو کە دەرس بڵێتەوە یان نەیڵێتەوە.

٥- مەلای دوازدە عیلم: بەو مەلایانە دەووترا کە زۆربەی کتێبە عیلمی و ئایینی و فیقهیەکانی تەواو دەکردن و دوازدە کتێبی تەواو دەکردن، مەلای دوازدە عیلم کەم کەس توانای تەواوکردنی ئەم پلەیەی هەبوو، چونکە وەک باسمان کرد ژیانی خوێندنی فەقێیەتی قورس بوو و بەکۆلە مەرگی دەژیان، مەلای دوازدە عیلم بەپەنجەی دەست دەژمێردران، وەکوو موفتی حیسابیان بۆدەکردن.

٦- کۆلکەمەلا: بەو کەسانە دەووترا کەبەهۆی هەژاری و قورسی ماددەکانی خوێندن نەی دەتوانی پەرە بە خوێندن بدات لەیەکێک لە قۆناغ و پلەکانی ناوەڕاست یان سەرەتایی لەخوێندن دەکشایەوە، ئەم جۆرانە دەیان توانی سیپارەو هەندێک لەقورئان فێری خەڵک بکەن، بەلام بۆپرسیارەشەرعیەکان سیریان لە پیواز دەرنەدەکرد.

# شەوانی سێشەممە و هەینی

ئەم دوو شـــەوە لەهەموو هەفتەیەک دا پشـــووبوون، فەقێکان لەم دووشـــەوەدا ســـەعی و خوێندنیان نەدەکرد، بەڵکوو لەجیاتی ئەوە خەڵکی بەتایبەتی هەرزەکارو لاوان دوای نوێژی عیشـــا لەحوجرەدا کۆدەبوونەوە، چونکە ئەو کـات رادیۆو تەلەفزیۆن نەبوون، بۆیە حوجرە قەرەبـالغ دەبوون، چینی رۆشـنبیریش تەنها فەقێ و مەلاکان بوون، لەم دووشـــەوە پشـــووەدا جۆرەها گەمەو یاری خۆش دەکران ، یان گەڕەحەیرانیان دادەنا ئەوەی لەو مەدریسەدا مەوجوودبـایە دەبوایە گۆرانیەک یـان حەیرانێـک بڵێ، ئەگەرهات و نەشـــی وتبایە، ئەوا دەبوایە یان تێک وەرانە لەگەڵ گێســـک بکات یان لەناو مەدریســـدا رای دەکرد، هەرلەم دوو شەوەدا شیعر و سروود و گۆرانی دەوتران، ئاشـنایەتی خەڵک لەگەڵ شـاعیرانی کلاسـیکی بۆ حوجرە دەگەڕێتەوە، گەنجە خوێنگەرمەکان بەهۆی ئەم دوو شەوە شـیعرەکانی (ئەحمەدی کۆر و حسـن شـنۆیی و قانیع و وەفـایی و نـالی و حـاجی قـادریـان لەبەرکردبوو، لەبەر ئەوەی بەردەوام لە حوجرەدا هەرباسـی ئەلفوبێ بەرگوێ

دەکەوت ، بۆیە لەکاتی گۆرانی وتنیشــــدا بەپیتەکانیان هەڵدەگوت بەم شێوەیە:

ئەلفەکی ئەن وەلا ئەئەن ئەئلەنی ئەییی ئۆنی
بێیەکی بەن وەلا بەبەن بەبلەنی بەییی بۆنی
تێیەکی تەن وەلا تەتەن تەتلەنی تەییی تۆنی
سێیەکە سەن وەلا سەسەن سەسلەنی سەییی سۆنی
جیمەکی جەن وەلاجەجەن جەجلەنی جەییی جۆنی
حێیەکە حەن وەلا حەحەن حەحلەنی حەییی حۆنی.

تادوایی، گەلێک جار فەقێکان دەســتی یەکتریان دەگرت و شاییان دەکرد.

# ئەرێ دەرێ بابەی فەقێیان

زۆربەی زۆری شـــەوان فەقێکان لەکاتی ســـەعیکردندا (ئەرێـبـابەیـان) دەووتەوە لەگەڵ ســـەعـی کــردن، ووشەی(ئەرێ) بۆبانگ کردنە، حەرفی نیدایە، بەرانبەر (یا) ی عەرەبی ، وشـــەی باب واتـا دەرگا، پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ(انا مدینە العلم وعلی بابها) واتا من شـــاری زانســـت و زانیاریم و عەلیش دەرگایەتی، فەقێ لەکاتی دەرس لەبەرکردن یان گوتنەوەی دەرســـەکانی رابردووی گەرشتێکی بەبیرنەهاتبایەوە ئەوا هاواری بۆ ئیمامی عەلی دەکردو ئەرێ بـــابە مەبەســـتەکەی وایە(ئیمـامی عەلی یارمەتیم بدە)، ئەم ئەرێ دەرێ بابەی فەقێیان بەشـــەو تێکەڵ دەبوو لەگەڵ شـنەبای شـەو و چریکەی شـالوورو بولبوول، ئـاوازێکی پڕجۆش و خرۆشـــی بەو نـاوە دەبەخشـــی، جاری واهەبووە کچ لەبەر دەنگی خۆشـــی فەقێیان تاکوو بەیانی خەو نەچۆتە چاوی.

# داهاتی حوجرە

هەروەک لەپێشـــوودا باســـمان کرد فەقێیایەتی بەقۆناغی سەخت و دژواردا تێپەڕیوە، ئەویش بەهۆی دەست کورتی و نەداری و هەژاری فەقێ بووە، بە قۆناغی زۆر ناخۆشدا پلەو قۆناغەکانی خوێندنیان دەبڕی، داهات و مەســـروفات لەحەجرەدا بەم شێوەیە بوو:

١- خواردنی رۆژانە: ماڵەخواپێداو و دەوڵەمەندەکان رۆژانە(راتبە) یـان دەدا بە حوجرە، راتبە بریتی بوو لەقاپێک خواردن لەگەڵ نـانێک ، فەقێ و ســـوختەکان دەچوونە بەردەم ماڵە دەوڵەمەندەکان ئەیان ووت:راتبێ رەحمەت و لێبی، ئەوانیش چی خوا بەقســـمەتی کردبایە بۆئەم ژەمە ئەوا دەیان دایە فەقێکە، زۆرجاریش فەقێ و کچی خاوەن ماڵ لەم راتبەیەدا پەیوەندیان پەیدا دەکردو خۆشەویستی لەنێوانیاندا دروست دەبوو، دوای بردنەوەی راتبە بۆحوجرە هەموو راتبەکان کۆدەکرانەوەو بەیەکەوە دەیان خوارد.

٢- ســـەبارەت بەچایە ئەوا دەوڵەمەندەکان شـــەکرو چایان بۆدەکڕین و لەحوجرەشـــدا ســـەماوەری تایبەتی

خۆیـان هەبوو، گەلێک جـاریش یەکێک پـارەی پێدەدان بۆکڕینی شەکرو چایە.

٣- لەزۆربەی گوندەکان حوجرە چەند پارچە زەوی و بـاخچەیەکی وەقفی هەبوو، کەبە (عـاردی فەقێیـان یـان باخچەی فەقێیان)مەشهووربوو، بەروبووم و داهاتی ئەو زەوی باخچانە کۆدەکرانەوەو دەیان فرۆشـتن، هاوینانیش فەقێکان لە(عاردی فەقێیـان) تەمـاتەو بـامیەو بـاینجـانیـان دەچاندن و بەشی هاوینەی دەکردن.

٤- راتبەی تـایبەتی: یەک دوو فەقێ لەکـاتی وەبەر هاتنی بەرووبووم دەچوونە سـەر جۆخینان، یان مشـتاغی تووتن، بەناوی هەم خێرو هەم زەکات، بەرووبوومەکەیان کۆدەکردەوەو دەیان فرۆشت بۆمەسرووفاتی حوجرە.

٥- جومعـانە: چەنـد فەقێیەک دەچوونە لای خـاوەن مەڕومالات ، بەتایبەتی لەوەرزی هاویندا جومعانە دەکرا، ئەو کۆمەڵە فەقێیە داوای جومعـانەیـان دەکرد، خـاوەن مێگەلیش بەقەدەر ئیمکان یارمەتی دەدان، چەند گیسـک و کاوڕی پێدەدان، تـاکوو ژمـارەیەکی زۆریان کۆدەکردەوە و دەیان هێناوە و دواتر دەیان فرۆشتن.

٦- ئیسـقـات: ئەگەریەكێـك لەگونـد مردبـایە ، ئەوا ئیسـقاتیان بۆدەكرد، بەشـی زۆری ئیسـقاتەكە بۆ حوجرە تەرخان دەكراو بۆخێری مردووەكە دەیان دایە فەقێكان.

٧- مەلایەتی مـانگی رەمەزان: ئەو فەقێیـانەی كە پلەی خوێندنیان باش بوو ، دەیان توانی مەلایەتی بكەن تەنها بۆمـانگی رەمەزان، چونكە هێشـتـا ئیجازەی مەلایەتیان وەرنەگرتووە، وەدەیـان توانی بـانـگ بـدەن و جەمـاعەت بكەن و ووتاری رۆژی هەینی بخوێننەوە، ئەوا دەچوونە ئەو گونـدانەی كەمەلایـان نەبوو، بۆمەلایەتی مـانگی رەمەزان دادەمەزران، ئەم مەلایەتیە كاتیە باگراوەندێكیش بوو بۆمەلایەكە كەدوای تەواوكردنی خوێندن بەیەكجاری ببێتە مەلای ئەو گونـدە، بـانگدان و جەمـاعەت و نوێژی تەراویحی بۆدەكردن لەگەڵ خوێندنەوەی ووتـاری هەینی ووتـاری رۆژی جەژن، وەرۆژی جەژنـیش زەكـات و سـەرفیترەی وەردەگرت و دوای تەواو بوونی جەژن دەگەڕایەوە بۆ حوجرەو دەستی دەكردەوە بە خوێندن.

# حوجرە و مەدرەسەکانی خۆشناوەتی

مەدرەسەو حوجرە لەزۆربەی گوندەکانی خۆشناوەتی هەبووە، گچکە یان گەورە ئەمەیان دەگەڕێتەوە بۆتواناو کارامەیی و زیرەکی ئەو مەلایانەی کە ئیدارەی حوجرەو مەدرەسەکانیان داوەو بلیمەتی زیرەکی مەلاش پێوەربووە بۆ زیاتر کۆبوونەوەی تالیب عیلمەکان و فەقێکان لەدەوری ئەو مەدرەسەیە، بەپێی وتەی زانای بەناوبانگ مامۆستا مەلا عبدالکریمی مودەریس کەلەکتێبی (تاریخ علمائنا فی خدمه العلم والدین) دا دەڵێ خۆشناوەتی یەکەم شوێن بووە کەمەدرەسەی ئایینی لێکراوەتەوە و لەلایەن کوڕەکانی (عبدالله ی کوڕی ئیمامی عومەر)(ر.خ) لەسەرەتای سەدەی یەکەمی کۆچی پاش ئەوەی کوڕەکانی عەبدوڵلای کوڕی ئیمامی عومەر دێنە کوردستان، یەکەم جار لەگوندی (باشوورە) لەدەشتی هەریر نیشتەجێ دەبن، هەروەک لە کتێبەکەی مامۆستا دا هاتووەلەلاپەڕە ٤٩٥ الباشوره قریه فی قضاء شقلاوه من اعمال اربیل استوطنها اولاد عبدالله بن عمر الخطاب (رضی الله عنهم) ، اول عصر الفتح الاسلامی ، الباشوره بیت علم وفضل ودین واحترام ، وهم اقدم اهل العلم فی العراق لان جدهم

اتی الی العراق وسکن فی قریه الباشوره فی زمن عبدالله بن عمر الخطاب (ر.ض).

بەم شێوەیە دەردەکەوێ کە گوندی باشووره یەکەم جێگا بووه کە زانست و زانیاری لەسەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام تیادا خوێندراوە، بۆیە دەتوانین گوندی باشووره بەیەکەم شوێنی خوێندن و پەرەپێدانی زانستی ئیسلامی دابنێین چونکە خوێندنی زانستە ئیسلامییەکان لەباشووره سەری هەڵداوەو دواتر پەلی هاویشتووه بۆ شوێنەکانی تر.

# جۆرەو مەدرەسەکانی خۆشناوەتی بەم شێوەیە بووە:

١- مەردەســـەی زیــارەت: زیــارەت دوو گــونــدی خۆشــناوەتین، یەکێکیان کەوتووەتە بناری چیای ســەفین، لەرۆژهەڵاتی (پیرمام) ئەوەی تریان کە گوندێکی گەورەترە و کەوتۆتە بنـاری چیـای پیرمـام لەرۆژئـاواوە، مـانـای (زیـارەت) پێدەچێ لەوە هـاتبێ کە گۆڕی پیـاو چـاکێکی لێیەو خەڵک ســـەردان و زیارەتی کردبێ، زیارەتی دۆڵی ئاژگە گوندێکە لەبورای مەدرەســـەدا چەندین مەلاو زانای بلیمەت و بەتوانای لێهەڵکەوتوون، سەردەمێک مەدرەسەی ئەو گوندە بۆتە شـــوێنی خوێندنی چەندین مەلاو فەقێ، لەئاســـتێکی بەرزدا زیارەت پێگەی خوێندنی هەبووە، ئەم زانـاو مەلایـانە رۆڵیـان هەبووە لە پێگەیـانـدن و پێدانی ئیجـازەی عیلمی بەمەلاکـان، ئەم زاتـانەی لای خوارەوە یەک لەدوای یەک خزمەتیـان بەزانســـت و زانیـاری و خوێندن کردووە:

-*شێخ مستەفا زیارەتی: یەکێک بووە لەزاناپایەبەرزەکانی ســـەردەمی خۆی، یاســـین العمری لەکتێبی(غایە المرام) دا دەڵێ( عەللامەی زانست لەسەردەمی خۆی، هیچ مەلا نەی

دەتوانی مناقەشـــەی عیلمی لەگەڵ بکات، ئەدیبێکی بلیمەت و بەتوانا بەجۆرێک لەو ســـەردەمەدا نموونەی کەم بووە، لەساڵی ١٧٨٣ زایینی ئەمری خوای کردووە.

-*صـبغە الله مسـتەفا زیارەتی:شـێخ عوسـمان سـەنەد لە(مطالع السـعود) دا دەڵێ:والی بەغدا(دادود پاشـا) سـاڵی ١٨٣١ قـوتـابـی و فەقـێـی مەلا یـبـغە الـلە بـووەو کتێبەکانی(اصول الدین و اصول الفقه وتەفسیری بەیزاوی )لەلای ئەو خوێنـدوەو لەو چەرخەدا دانیـان بەو مەلا نـاوداره هێنـاوە، هەروەهـا دەڵێ:من ئەو نـامەیەی داود پاشام بینیوە کەبۆ مامۆستاکەی ناردووەو تیایدا سوپاس و ستایشی ئەو زاتەی کردووە.

-*مەلاعبدالرحیم زیارەتی کەبە مەلازادەی ئەشـــعەری بەنـاوبـانـگ بووە:بەبیرمـان دێنێتەوە(ابن البیطـار) لە(حلیە البشر) داو دەڵێ:زانستی بەرزو ئەخلاقی بەرزو رەووشت و زانیـاری لەو ســـەردەمەدا تەنهـا قـابیلی ئەوبوو، ئەوزانســـتەی ئەو هەیبووکەم کەس درکی پێدەکردلەناو کورد، هیچ هونەرو پرسـیارێک لەلای ئەو ئاسـتەم نەبوو، بەڵکوو درکی بەهەموو شتێک دەکردلەتەواوی زانستەکانی ئەو سەردەمە.

مەلافەنـدی هەولێریش دەگێڕێتەوەو ئەڵێ:بـاپیرەگەورەم (ئەبابەکرمەلا عوسـمان و مەلا محمدی خەتێ قوتابی ئەو بوونەو ئیجـازەی مەلایەتیـان بەمۆری مەلا عبـدالرحیم وەرگرتووە.

-*مەلا محمد عبداللەزیارەتی: ئەو زاتەش یەکێک بووە لەو زانـاو مەلایـانەی کەلەو سـەردەمەدا نـاوبـانگی دەرکردووەو چەنـدین کەس لەلای ئەو خوێنـدوویەتی، یەکێک لەو نـامـانەی کەبۆوالی بەغـد(دادود پـاشـای ) نووسیوە لەلاەین عباس عەززاوی پارێزراوبووە.

-*مەلا محمدی زیارەتی: یەکێک بوولەزانا بەرزەکان ، یاسـین عمری دەڵێت: (مەلامحەمەدی زیارەتی کوردی، زانـایەکـی دەگـمەن و بەتـوانـای کـوردبـووە، لەشـاری(عەقرونەفتی) خوێندوویەتی و لەسـاڵی ١٧٨١ کۆچی دوایی کردووە.

٢ -مەدرەسەی بێتواتە

ئەم مەدرەسـەیە لەگوندی بێتواتە بوونی هەبووەو چەند نەوەیەک لەبنەماڵەیەک مەلایەتیان کردووەو خزمەتی دین و نەتەوەو رۆشـنبیری نـاوچەکەیـان کردووە ئەوانیش بریتین لە:

-*مەلاداود مەلاعبدالله مەلاحســـین: باپیرە گەورەی مەلا عبدالله بووە، مەلاو زانایەکی پڕ زانســـت و زانیاری بوو، تەمەنی گەیشـتە ١١٢ سـاڵ، کەچی هەربەردەوامیش بووە لەســـەر عیلم و دەرس ووتنەوەو خوێنـدنەوەی کتێـب، لەتەمەنی ٨٢ ســاڵی بەدەســتی خۆی کەخەتێکی جوان و شـــاشـــی هەبووە قورئـانی پیرۆزی نووســـیوەتەوە، هەرلەبێتواتە ئەمری خوای کردووەو لەوێش نێژراوە.

-*مەلا شـێخ محمد مەلا داود: جێگرەوەی باوکی بووە لە مەلایەتی، لەسەر کێشەیەک کەلەگەڵ دمراستی گوند پێک نەهـاتوون چۆتە گونـدی (زێوە) ، لەو گونـدەدا کوڕێکیـان دەبێ ناوی عبداللەی دەکەن لەسـاڵی ١٨٨٩ دوای سـاڵێک بەفەرمــانی (شـــێخ نەبی مــاویلی) دەچێتە گونــدی (کونەفلووســـە) لەســـەر داوای خەڵکی ئەم گوندە ماڵەکەی دەباتە کونەفلووســـــە، چونکە نـاو و نـاوبانگی لەچاکە و پیاوەتی زیرەکی دەرکردبوو، هەرلەو گوندەشـــدا کۆچی دوایی دەکات، لێرە بەولاوە بوونەتە کونە فلووسەی.

-*مەلا محمدامین مەلا شـــێخ محمد: دوای مردنی باوکی لەکونەفلووســـە بۆخوێندن دەچێتە شـــەقڵاوە، لەلای مەلا عوسـمان ئەفەندی کەبە موفتی ناسـرابوو کتێبەکانی (علم الاداب و کتاب الخیالی) لەوێ تەواو دەکات، دواتر دەچێتە

رواندزلەلای مەلا محمدامین خەیلانی کتێبەکانی (تشـــریح الافلاک و برهــان الکلنبوی) دواتر چەنـد شـــوێنێکی تر دەگەڕێ بۆخوێندن تاوای لێدێ دەبێتە مەلایەکی دوازدە عیلم لەســـەر داوای (عبدالقادر دەبباغ) لەمزگەوتی ئەوان دەبێتە مودەریس و وتارخوێن، هەموو ســـاڵێک چەند مەلایەک ئیجازەی عیلمی لەلای ئەو وەردەگرن ، تـا لە ژیاندا مابوو (٥٧) مەلا لەســـەردەســـتی ئەودا ئیجازەی مەلایەتیــان وەرگرتووە، ســـاڵی ١٩٤٠ کۆچی دوایی کردووە.

٣ -مەدرەســـەی شـــەقڵاوە: ئەم مەدرەســـەیە ناوبانگی زۆری دەرکردووە، بۆیە لەزۆربەی شـــوێنەکـان فەقێ چوونەتە شەقڵاوە و پەرەیان بەخوێندن داوە، تاماوەیەکی زۆر مامۆستا مەلا عوسمانەفەندی دەرسی وتووەتەوە و ئیجازەی عیلمی لەشەقڵاوە بە مەلاکان بەخشراوە، دواتر مەلا تەهـای شـــەقڵاوە پەرەبەو مەدرەســـەیە دەدات و جێپەنجەی دیـارە، دواتر (مەلامەجیدی گڕاوی) لەهەموو خۆشـــناوەتی نـاوبـانگی لە پیـاوچـاکی و مەلایەتی دەرکردبوو، ئەویش خزمەتێکی لەرادده بەدەری بەبواری خوێندن و فەقێ و مەلایەتی کردووەو پیاوێکی ناســـراو بوو.

٤ -مەدرەسەی باليسان: لەسەردەستی مەلا مستەفا سۆرانی ئەم مەدرەسەيە كراوەتەوە و ماوەی سی ساڵ تەدريس لەباليسان كراوە، لەزۆرلاوە تاليب عيلمەكان هاتوونەتە باليسان و پەرەيان بەخوێندن داوە، چەند مەلاو زانای ناوداری كورد لەوێوە خوێندنيان تەواو كردووە و ئيجازەی عيلميان وەرگرتووە، كور و نەوەكانيشی هەمان رێچكەيان گرتووەو بەردەواميان بەخوێندن داوە، نەوەكانی (شێخ عمرو شێخ مەلامحمدو شێخ نجم الدين و شێخ عەلی و شێخ ابراهيم و شێخ ئەبوبەكر) هەموويان هەم شێخ بوون و هەم مەلا و مامۆستای ئايينی بوون، لەبواری رۆشنبيريشدا سەرقافلەبوون.

٥ -مەدرەسەو حوجرەی هەرتەل: ئەم گوندە بەلانكەی عيلم و زانست و زانياری لە بورای ئايينی و بيركاری و رۆشنبيری دادەنرێت، كە باس لە هەرتەل دەكرێت ئەوا بێگومان خوێندنی ناو مزگەوت و حوجرەمان دێتە پێش چاو زۆربەی زۆری مەلاكانی كوردستان قەرزاری مەدرەسەی ئەو گوندەن، مامۆستا مەلا فتح اللەی هەرتەلی مۆمێكی داگيرساوبوو بۆعيلم و زانياری دەوروبەری خۆشناوەتی رۆشن كردبوەوە، مەلا فتح الله هەرتەلی هەرچەندە لەجەستەدا گەورەنەبووە، بەڵام دنيايەك عيلم

و رۆشـــنبیری بەخشـــییە وڵاتەکەی، مەدرەســـەی هەرتەل ناوبانگی دەرکردبوو، ئەم زاتە پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ جامیعەی ئەزهەردا هەبوو، پێم وایە مەردەســـــەی هەرتەل هیچی کەمترنەبوو لە ئەزهەر و هـــاوشـــــــانی یەکتربوون، کتێبخانەکەی مەلا فتح الله شـــوێنێکی ئەمین بوو بۆ هەڵگرتنی دەســـــتنووس و بەرهەمی ئەو کـاتی نووســین وەکوو شــیعرو ئەدەبیات، تاماوەیەکی زۆر لەو شـــوێنە تەدریس کراوە و ئیجازەی عیلمی ئەو کات تەنها لەوێ دەبەخشرا بە مەلایەکان.

٦ -مەدرەســەیخەتێ: مەدرەسـەی ئایینی لەم گوندەدا زۆر کۆنە، هەرلەبنەمـــاڵەی (مەلا محمـــدی خەتی)کە بەمەلای خەتێ دەناسرێ، هەرکە ناوی ئەو پیاوە دێت ئەوا یەکسەر ئیمارەتی ســۆرانمان دێتەوە یاد، چونکە مەلا محمد موفتی (پاشـــــای کۆر میرمحمـد)بووە، هەرچەنـدی مێژوو زۆر زوڵمی لێکردووە، بەڵام ئەو کتێبە تایبەت نیە بۆئەم بابەتە، بۆیە هەڵیـدەگرین بۆ بـابەتێکی دیکە، مەلامحمـدی خەتی ماموەســـتایەکی دیاری نێو گەلی کوردە و رۆڵێکی باشـــی گێڕاوە لەفێرکردن و دەرس ووتنەوە، تائێسـتا نەزانراوە چ ساڵێک لەدایک بووە، وای بۆ دەچن لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەدا بووبێت، کۆچی دواییشـی بۆ ناوەڕاسـتی سـەدەی

نۆزدە دانراوە، کوڕ و نەوەکـانیشـــی بریتی بوون لە مەلا(عبـداللە مـحمـد خەتـی و مەلا عبـدالفتـاح مەلا مـحمود.....هتـد).کە ئەوانیش کەکـاروبـاری حوجرەو مەدرەســـەی ئایینی خەریک بوونەو جێپەنجەیان دیارە، دواتر بنەمـاڵەی مەلایـانی خەتێ کەلەســـاڵی ١٩١٦ دا هـاتوونەتە خەتێ و مەلا عبداللە یەکێک بووە لەو زاتانەی کەوا پەرەیان بەزانست و زانیاری داوەو ماوەی شـەست ســـاڵ تەدریس لەخەتێ ئیـدامەی هەبووە، دواتر مەلا ئیبراهیم مەدرەســەکە وەردەگرێت و دواتر مەلا بهائەدین و مەلا ئەحـــمەدو مەلا صــــادق ، بەردەوام دەبــن لەدەرســوتنەوە و لەمەدرەســەی خەتێ ئیجازە دراوە بەو مەلایانەی کە قۆنـاغی خوێندنیان تەواو کردووەو گەلێک ســاڵ ئاهەنگی ئیجازەدان لەخەتێ ســازدەکرا، کەچەندین مەلاو کەســایەتی بانگهێشـت دەکران ئاهەنگی ئیجازەدان دەستی پێدەکرد.

٧ -مەدرەسەی سکتان: مەلاعبداللە سکتانی سەرپەرشتی ئەو حوجرەیەی دەکردو لەسـکتان عیلم و زانیاری پەرەی پێدەدرا، وانە قورســـەکـان و کتێبە دەگمەنەکـان لەوێ دەخوێندران.

٨ -مەدرەسەی توتمە: بۆماوەی سی ساڵ دەرس ووتنەوە لەو مەدرەسەیە ئیدامەی هەبوو، لەسەر دەستی مامۆستا(مەلائەحمەدی توتمە) چەندین فەقێ لەزۆرشوێن روویان لەتوتمە دەکردو دەیان خوێند، ئەم مەدرەسەیە تاکوو ساڵی ١٩٧٣ بەردەوام بوو، مەلائەحمەد جگەلەوەی مامۆستابوو خەمخۆری فەقێکانیش بوو، لەدابینکردنی کتێب و مەسرووفاتی ناوحوجرە، ئەم زاتە ساڵی ١٩٧٧ چووەوە بەردلۆڤانی خوا.

٨ -مەدرەسەی بێراوە: لەلایەن مامۆستا مەلا ئیبراهیمی بێراوە سەرپەرشتی دەکراو وەکوو مامۆستایەکی بەتواناو بلیمەت دەرسی دەووتەوە، لەزۆربەی شوێنان فەقێ روویان لەو گوندە دەکرد، بەتایبەتی لە گوندەکانی دەشتی هەولێرو کوردستانی رۆژهەلآت و شوێنەکانی تر.

٩ -مەدرەسەی شێخ مەموودیان: لەلایەن مامۆستا مەلا عبدالله شێخ مەمودی سەرپەرشتی دەکرا، وانە قورس و گرانەکان لەوێوە دەووترانەوە، چونکە مامۆستا مەلا عبدالله شارەزایی تەواوی هەبوو لەعیلمی فیقهو ئاداب و مەنتیق.

١٠ -مەدرەسەی هیران: جگەلەوەی بنەماڵەی کاکی هیران بنەماڵەیەکی ئایینی بوون و تەکیەو خانەقای تایبەتی

خۆیـان هەبوو، چەنـدین مریـد و دەروێش لەو تەکیەیە خزمەتیان دەکرد، تاکوو نیوەو شـەو کۆڕی زیکرو تەهلیل و دەفەلێـدان بەردەوام بوو، ئەم بنەمـاڵیە بنەمـاڵیەکی نـاندەرو خـاوەن دیوەخـان بوون، چەنـدین زانـای بەنـاو بانگیان هەیە، لەبواری مەردەسەو حوجرەشدا جێپەنجەیان دیارە، مەدرەسـەی کاک مسـتەفا لەهیران ناوبانگی هەبوو و لەزۆر لاوە فەقێ روویان تێدەکرد بەمەبەستی خوێندن.

١١-مەدرەســــەی بالوکاوە: بالوکاوەیان (بلاروکاوە) یان (باروکاوە) لەسـالانی سـەدەی رابردوو مەدرەسـەی دینی لێبووەو لەلایەن مامۆسـتا مەلا (مســـتەفا) بەڕێوەبراوە، پێدەچێ ئەم مەدرەســـەیە لەســـاڵی ســـیەکانی ســـەدەی رابردوو هەبووبێ، هاوینانیش هەرلەماڵی خۆیەوە دەرسی بە فەقێکـان وتۆتەوە، دواتر چۆتە هەولێر لەمزگەوتی ناجیەخان کە ئێستا پێی دەڵێن مزگەوتی ئەوقاف دەرسـی وتۆتەوەو دواتر چۆتە بەغـداو هەرلەوێش کۆچی دوایی کردووە.

١٢-مەدرەســـەی ئارماوان: ئارماوان وەک هەر گوندێکی تری خۆشـــناوەتی مەدرەســـەو قوتابخانەی ئاییني لێ هەبووە، وەک بـاس دەکەن دوومەدرەســـەی ئـایینی هەبووەو پەروەردەو زانســتی ئیسـلامی تیادا خوێندراوە،

ئەو مامۆستایانەی کە کەپێشەواو ووتارخوێن و دەرسیان تیادا پێشـــکەش کردووە بریتی بوونە لە (مەلا مەجید و مەلا ئەبوبەکری بیرێژی).

جگە لەو مەدرەســـەو حوجرانەی بـاســـمـان کردن لە گوندەکانی سماقوڵی و قەلاسنج و زێوەو گەرۆتەو چیوەو بێلینگەو میررۆســـتەمەو گڕاو و ناودارۆکان و بیرۆکان ...هتد مەدرەســەی ئایینی هەبووەو بەهەمان شـێوەی ئەو مەدرەســـانەی کە باســـمان کردن ، بەشـــدار بوونە لە پێگەیـانـدنی مەلا و مرۆڤی خوێنـدەوار، وەچەنـدین کەســـایەتی هەرچەندە زۆریشـــیان نەخوێندووە تەنها قورئـانیـان خەتم کردووە، هەڵســـاون بە فێرکن و خوێندەوارکردنی کۆمەڵێک کەس ، نمونەشمان وەکوو(مەلا خدری حافز)ی شێخ وەسانی هەرچەندە نابینا بووە بەڵام نزیکەی پەنجـا کەســـی لەگونـدەکەی فێری قورئـان و خوێندەواری کردووە.

# وەرگرتنی ئیجازە

دوای تەواوکردنی هەموو مەنهەج و کتێبەکـان و دوای ئەوەی موسـتەعیدی ئاخیر ماددە لەخۆی دڵنیا دەبوو، کە دەتوانێ مەلایەتی بکات و کێشەکانی خەڵک چارەسەربکات و وتاری رۆژانی هەینی و جەژن بڵێتەوە و لەفیقهـــ و شـــەرعدا لەو پەڕی ئامادەباشـــیدایە و دەتوانێ دەرس بڵێتەوە و ئـامـادەیی تەواوی وەرگرتووە، ئەوا لەلایەن مامۆسـتای تایبەت کەمۆری خۆیان هەبوو و موعتەریف بوون بەکاری ئیجازە دان، دەسـت دەکرا بەئامادەکاری ئیجـازەدان ، یەکەم جـار داوای لەو مەلایە دەکرد کە ئیجازەی مەلایەتی پێببەخشـێ، مەلاش دوای ئەوەی دڵنیا دەبوو کەوا ئەو موسـتەعیدە شـیاوی ئەوەیە ئیجازەی بداتێ، ئەوا بڕیاری دەداو دەست دەکرا بەئامادەکاری.

یەکەم جار داوا لە دەوڵەمەند و خواپێداوەکانی شـار یان گونـد دەکرا کەهـاوکـاری حوجرە بکەن بۆ کـاروبـاری ئیجازەدان ، هەم لەکڕینی جلوبەرگی شـیاوی مەلایەتی و مەندیل و مێزەرو مەسـروفاتی رۆژی ئیجازەدا، دواتر بەنامە مەلاو فەقێکانی گوندو شـارەکان ئاگادار دەکران کەوا لە فلانە بەروار ئیجازەی مەلایەتی بەفلانە موستەعید دەدرێ و تکایە ئامادەبن. چەند ژنێکی بەدەسـت و برد و

خۆبەخشـــــانە بۆئەم ڕۆژە خۆیـان تەرخـان دەکردو هەڵدەســـتان بەئامادەکردنی خواردن، دوای ئامادەکردنی پێـداویســـتییەکـانی ڕۆژی ئیجـازەدان و دوای ئەوەی مێوانەکان ئامادە دەبوون ، یەکەم جار دەســـت دەکرا بە شــــەکراو خواردنەوەو ئەو فەقێیـانەی کەدەنگیـان خۆش بوو، یەکێک چەند ئایەتێکی لە قورئانی پیرۆز دەخوێندەوە، ئینجا دەســـت دەکرا بە ئاهەنگەکەو شـــایی و ســــروودو گۆرانی دەســـتی پێدەکرد، دەروێش و ســـۆفیش ناوەناوە (حەبیبی عالەم محمد صـلوات) یان لێدەدا، پاشـان وتاری بەرنـامەی ئیجازەدان دەخوێندرایەوە، دوای تەواو بوونی ئەمـانە مـامۆســـتـای ئیجـازەدەر یـان خۆی نـاوەڕۆکی ئیجازەکەی دەخوێندەوە یان دەی دایە دەســـت مەلایەکی تر، ئەمەشـــیان یان ئەوەتە لەبەر پیری بەســـاڵاچوونی مامۆستایەکە بوو یاخود لەبەر پایەبەرزی و عیلم زانستی مەلا ئیجـازە دەرەکە بووە، ئەمەشـــیـان ڕێزلێنـان و نەوازشـــێکی تایبەت بوو بەرانبەر مامۆســـتا پایەبەرزو بەتەمەنەکان، موســـتەعیدەکەش لوبەرانبەر مـامۆســـتا بەرێـزو حـورمەتەوە و مـلـکەچ ڕاوەســــتـاوە، دوای خوێنـدنەوەی ئیجـازەکە (جببەی) مەلایەتی دەکرایەبەرو مێزەری ســـپی مەلایەتیـان بۆ دەبەســـــت و ئینجـا موســـتەعیدەکە دەســـتی مامۆســـتای ماچ دەکرد و دوایی

بەهاوڕێیەتی یەکێک لە مامۆســـتاکان بەڕێزەوە بەناو هەموو مەلا فەقێکاندا دەگەڕاو تەوقەو دەســـت ماچکردنی دەســـت پێدەکرد، تاکوو دەگەیشـــتەوە لای مامۆســـتای ئیجازەدەر، ئینجا سێ جار دەستی مامۆستای ماچ دەکرد، پاشـــان مامۆســـتای ئیجازەدەر هەندێ ئامۆژگاری موســـتەعیدەکۆنەکەو مەلایە نوێیەکەی دەکرد و پێی دەووت (تۆلەمەولا بوویتە مەلا و دەبێ ئەو پەیامەی کەخوێندووتە و وەرت گرتووە بەئەمانەتەوە بیگەیەنی بە کۆمەڵانی خەڵک و دەبێ هەمیشـــە رێز لە ئایینی پیرۆزی ئیســـلام بگری )، دوای ئەمە هەندێ وتاری تر لەلایەن هەندێ ئامادەبوو دەخوێندرایەوە، پاشان دەست دەکرا بە ئاهەنگەکە کەبریتی بوو لە گۆرانی سروود و شانۆگەری پێشـــکەشـــکردن، وەکوو شـــارەزایانی بواری شـــانۆ باس دەکەن یەکەم ســـەرهەڵدانی شـــانۆی کوردی لەحوجرەدا ســـەری هەڵـداوە، دوای تەواو بـوونـی ئـاهەنـگەکەو گەڕانەوەی میوانەکـان هەرکەســـە بۆشـــوێنی خۆی ، مەلانوێیەکە یـان دەگەڕا بۆمەلایەتی یـان پێش ئیجـازە وەرگرتن وەکوو گرێ بەســـتێک لە گونـدێک ئەنجامی دابوو، دەبووە مەلا نازناوی مەلایەتی بەسەردا دەسەپا.

# مەلا بەناوبانگەکانی خۆشناوەتی

١-ئیبراهیم عبداللە خەتی:

نـاوی ئیبراهیم کوڕی مەلا عبـداللە یە، کـاتی خۆی ئەو بنەماڵەیە لەناوچەی (سـنگوڕە)چوونەتە گوندی (دەرگەڵە) پاشـــان چوونەتە گوندی (کونەفلوســـە)ئینجا هاتوونەتە گوندی (خەتێ)، ساڵی ١٨٨٤ لەگوندی خەتێ لەدایک بووە، قورئانی پیرۆز و کتێبە ســـەرەتاییەکانی تەواو کردووە، مـاوەیەک لەلای مەلا عبـدالفتـاحی خەتێ خوێنـدوویەتی، ئینجا چۆتە بالیســـان لەلا شـــێخ تەها پەرەی بەخوێندن داوە، دواتر چۆتە رواندز لەخزمەت مەلا ئەســـعەدەفەندی خەیلانی خوێنـدوویەتی لەکۆتـاییـدا چۆتە(گرتـک)لای مەلا عبداللەی ئادەم کۆتایی بەخوێندن هێناوە.

دوای وەرگرتنی ئیجـازەی مەلایەتی لەگونـدەکەی خۆی خەتێ دەســـتـدەکـات بە ووتنەوەی دەرســـی ئـایینی لەحوجرەی خەتێ وانە دەڵێتەوە تـاکوو ســـاڵی ١٩٥٧ ئەمــری خــوا دەکــات ئەو مەلایــانەی کەلەلای ئەو خوێندوویانە بریتین لە:

مەلا ئەحمەدی توتمە، مەلا تاهیر سووسـەیی، مەلا عومەر تەرجـانی، مەلا محـمـدی قیرژەیی، مەلا مەســـعودی

ئاشـــۆكانی، مەلاجەمیل كاوانی، مەلاعەلی ســـۆفی، مەلا بهائەددینی برازای، مەلا یادقی كوڕی و چەندانی تر.

٢-ئیبراهیم بێراوەیی(زەكی زادە):

نـاوی ئیبراهیمە كوڕی مەلا نەجمەددین، كوڕی مەلا ئیبراهیم، كوڕی مەلا یاسـین، كوڕی مەلا ئیبراهیم، كوڕی رەســـوولی زەكیە، ســـاڵی ١٩٢٩ لەگوندی (بێراوە) ی خۆشـــناوەتی لەدۆڵی بالیســـان لەبنەماڵەیەكی مەلازادە لەدایـك بووە، بەڕەچەڵەك دەچێتەوە ســـەر بنەمـاڵەی (رەســـوولی زەكی)زانای بەناوبانگی كورد لەرۆژهەلاتی كوردستان، سەرەتا لەلای باوكیەوە دەنرێتە بەر خوێندن، دوای ئەوەی كتێبە ســـەرەتـاییەكـان لەلای بـاوكیەوە دەخوێنێ، ئینجا روودەكاتە بالیسان و لەلای مامۆستا(شێخ عومەربالیســـانی)پەرەبە خوێندن دەدات، دوایی دەڕواتە گوندی هەرتەل، لەلای مامۆسـتای پایەبەرز(مەلافتح اللەی هەرتەلی) دەخوێنێ، پاشـــان چۆتە گوندی(كۆڕێ) دوای مـاوەیەك دەچێتە (هەڵەبجەو بیـارە)، لای مـامۆســـتـای پـایەبەرزی كورد(مەلا عبـدالكریمی مـدرس)مـاوەیەكی زۆرلەوێ دەمـێـنـێـتەوە، زۆربەی زانســـتەكـان زۆرســـەركەوتوانە دەبڕێت و دەگەڕێتەوە گونـدەكـانی دەشتی هەولێر، دواجار دەچێتە كۆیەو لای مامۆستا (مەلا

مەعسووم) لەمزگەوتی کاک نووری ساڵی ١٩٥١ ئیجازەی مەلایەتی بەپلەیەکی زۆر باش وەردەگریَ.
مامۆستا شارەزاییەکی بێوێنەی لەزانست و شەرع و فتوای ئاییندا هەبووە، بەجۆرێک هەرچی کێشەی قورس و پرسیاری شەرعی ئاراستەی ئەو کراون و زۆر بوێرانە چارەسەری پێویستی بۆ کێشەشەرعیەکان دۆزیوەتەوە، بەهۆی هەڵوێستی کوردانەوە چەند جارێک ماڵی لیَ تێک چووەو نەفی کراوە، مامۆستا جگەلەکاروباری ئایینی لەنووسینی شیعردا دەستێکی باشی هەبووەو شارەزایی لەشیعری کلاسیکدا هەبووە، لەژێر نازناوی (غەمگین)شیعری نووسیوە، لەپارچە شێعرێکیدا کەبۆ مامۆستای پایەبەرزی کورد(شێخ محمدی بالیسانی)هۆنیویەتیەوە دەڵیَ:

سەلامی من دەبا رێزبیَ ، لەرێگای چوونی بەغدایە
لەبۆئوستادی موکەڕڕەم، لەزانیندا بیَ هاوتایە
بەناوی موحەممەدە، بەڵام موتابیقی موسەممایە
دڵە هەستە بڕۆبۆلای، نیەمەنعت لەهەرلایە
مەترسیَ بۆدەترسێی؟تۆلەبۆلیقای خودایە
رێگەت روون و کەبیَ چەوتە، نیەئیللا تەجەللایە
مەڵیَ من بیَ کەس و کارم، هەمووعالەم بۆت سەودایە

لەبالیسان هەتا بەغدا، هەمووحازرو موهەییایە
بەغەیری وان ژمارناکرێ، ئەوەش هەر رەحمی خودایە
دەبا دڵێک قرار بگرێ، دائیم لەزیکری مەولایە
(غەمگین)دائیم لەخەیاڵت بێ، بێ هۆش و شێت و شەیدایە
مەڵێ وانیە بەڵێ وایە، مەگەربڵێن ئیفتیرایە.

لەبەرەبەیـانی رۆژی ٢٠٠٤/٤/١٢ لەشـــاری هەولێر بۆدواجار ماڵئاوایی کردو ئەمری خوای کرد.

٣-ئەبوبەکر محمد میررۆستەمەیی:

نـاوی ئەبوبەکر کوڕی محمـدە، خەڵکی گونـدی(میر رۆسـتەمە)یە کەدەکەوێتە نێوان هەریرو شـەقڵاوە، لەبەر ئەوەی باری کردووە بۆ گوندی(سـارتکە)هەرووتیان بۆیە لەخۆشـناوەتی زیاتر بە مەلا ئەبوبەکری سـارتکەیی ناسـراوە، مامۆسـتا لەزانایانی سـەدەی سـێزدەی کۆچیە، مەلا خزر ئەفەندی کتێبی (شرح المکالع) بۆ نووسیوەتەوە. زانـایەکی بەرزو بەتوانـا بووە، بۆیە پـاشـای کۆرە بردوویەتیە لای خۆی و کردوویەتی بەمەلای خۆی لەزۆر کارو بواردا راوێژی پێکردووە، کتێبەکانی (اسـتعارە و وچع)گەورەترین بەڵگەن بۆگەورەیی ئەو زاتە کەتـا ئێسـتاشـی لەگەڵدابێ لەمەدرەسـەو حوجرەی کوردسـتان ئەو کتێبانە سـەرچاوەن بۆخوێندنی فەقێکان، لەبەغداش

ئەو کتێبانە خوێندراون و شـــەرحیان لەســـەر کراوە، زۆربەی زانســـتەکانی لەلای مەلا(عبدالرحمن جەلی)تەواو کردووە، مامۆستا زۆر جار سەفەری هەولێری کردووەو چۆتە لای مەلا بەنـاو بـانگەکـانی هەولێرو برادەرایەتی لەگەڵ مەلا ئەبوبەکرەفەنـدی کـچـک مەلای هەولـێردا هەبووە، تـائێســـتـا بەرواری کۆچی دیـار نییە، تەنهـا ئەوەندەنەبێ کە لە ساڵی ١٢٣٣ ک لەژیاندا بووە.

دانراوەکانی بریتین لە:

١-خلاصه الوضع:مەلا عبداللەی شێخ مەمووندی شەرحی لەســـەر کردووە، هەروەهـا مەلا عبـدالرحمن قەرەداغی شـــەرحی لەســـەر نووســـیوەو ســـاڵی ١٨٥٦ ز تەواوی کردووە.

٢-نهایه الوسع: ئەمە شەرحی خۆیەتی لەسەر دانراوێکی خۆی.

٣-بیان البیان: مەلا عبداللەی شـــێخ مەموندی شـــەرحی کردووە، یوســـف ســـەنان بەغدادی شـــەرحی لەســـەر کردووەو ناوی ناوە(تاج البیان) مەلا ســـەید عبدالکریمی هەورامی حاشیەی لەسەر داناوە.

٤ -حاشیە لەسەر سەیلەکووتی سەر شەڕحی شەمسیە لەزانستی مەنتیق.

٤-ئەبوبەكر شـــێخ تەها باليســـانی:ناوی ئەبوبەكر كوڕی شـێخ تەهای باليسـانیە، سـاڵی ١٩٢٩زدوای مردنی باوكی لەدايك بووە، ســـەرەتا لەلای شـــێخ عمری برای دەســـتی بەخوێندن كردووە، پاشـــــان چۆتە خەتێ و دوایی چۆتە توتمەلەلای خـاڵی مەلا ئحمەدی توتمە خوێنـدوويەتی، دواتـر لەهەرتەل لەخـزمەت مەلا فەتـحـولـلای هەرتەلـی ئيجازەی وەرگرتووە، مەلايەتی لەگوندەكانی باليســـــان و تـوتـمەو زێنەو نـواوەكـردووە، دواتـر گـوازراوەتەوە بـۆ مزگەوتی براگەورەكەی شێخ عومەر لەهەولێر، لەبەرواری ٢٠٠١/٩/٨ كۆچی دوایی كرد.

٥ -ئەحمەد عبدالله توتمەيی:

ناوی ئەحمەد كوڕی عبدالله كوڕی محمدە، ســـــاڵی ١٩٠٧ لەگونـدی توتمە هـاتۆتە دنيـاوە، لەبنەمـاڵەيەك چـاوی هەڵێناوە كەمەلازادە بوونەو بـاوك و باپيری مەلا بوونە، قورئانی پيرۆزو كتێبە ســـەرەتاييەكانی ســـوختەيی لەلای مەلا عبـداللەی بـاوكی كەحـافزبووە خوێنـدووە، چۆتە باليســـان و لەلای شـــێخ تەها باليســـانی بەردەوامی داوە بەخوێندن، دواتر چۆتە گوندی خەتێ لەلای مامۆســتا مەلا ئيبراهيمی خەتی خوێنـدوويەتی، ئينجـا چۆتە هەولێرو لەمزگەوتی دەباغ لەلای مامۆســـتا مەلا عەبدوللای بێتواتە

درێژەی بەخوێندن داوە، پاشان بارگەی لێناوەو هاتۆتەوە خۆشناوەتی و چۆتە خزمەت مەلا فەتحوڵڵای هەرتەلی و دواقۆناغی خوێندنی لەوێ تەواو کردووەو هەرلەوێش ئیجازەی عیلمی وەرگرتووە، بۆمەلایەتی کردن ماوەیەک لەگوندی بالووکاوە بووەو پاشان گەڕاوەتەوە گوندەکەی خۆی بۆتە مەلای گوندو حوجرەی دامەزراندووەو دەستی بە تەدریس کردن کردووە، تاکوو مانگی پێنجی ساڵی ١٩٧٧ کۆچی دوایی کردوگەڕایەوە بەردلۆڤانی یەزدانی مەزن.

٦-ئەحمەد ئیبراهیم خەتی: ناوی ئەحمەدە کوڕی مەلا ئیبراهیمی خەتییە، ساڵی ١٩٣٦ لەگوندی خەتێ لەدایک بووە، لەلای مەلا ئیبراهیمی باوکی نراوەتە بەر خوێندن، زۆربەی کتێبەکانی لەلای باوکی خوێندووە، پاشان دەچێتە گوندی هەرتەل و لەلای مامۆستا مەلا فەتحوڵڵای هەرتەلی ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێ، دوای مردنی باوکی لەساڵی ١٩٥٧ لەگوندەکەی خۆی لەگەڵ مامۆستا مەلا بەهائەددین خەتی بەردەوامی بە مەدرەسەی خەتێ دەدات، ئینجا ماوەی نۆساڵ لەگوندی(هەرووتە کۆن) بەمەلایەتی دەمێنێتەوە، پاشان ماوەی ساڵێک دەچێتە گوندی(نێوە) ، دوای ئەوەی کێشەیەک لەنێوان دووبنەماڵەی ئەو گوندە

دروســــت دەبێ، دەچێتە گوندی (بناویە)، دواتر ئەچێتە گوندی(ئالانە) ، تاکوو مانگی شەشی ١٩٨٠ کۆچی دوایی دەکات.

٧-ئیسماعیل عبدالقادر سووسەیی:

ناوی ئیسماعیل کوڕی مەلا عبدالقادری کوڕی مەلا مەعروفە، لەدەوروبەری ساڵی ١٨٩٢ لەگوندی سووسەی دۆڵی سماقوڵی خۆشناوەتی لەدایک بووە، زاتێکی هێمن و نەرم و لەسەرخۆبووە، لەمەسائیلی دین و دنیا شارەزا بووە، ئاقڵمەند بووە بۆئیشی ئاڵۆزو گرێ کوێرەو کارە سەختەکان خەڵک پرس و رایان پێدەکرد،

خوێندنی لەسەرەتاوە لە (جدیدە)ی بەڕانەتی لەلای مەلا حسینی ئاشۆکانی بووە، دوایی چۆتە بنەسراوە ی گەورە لای مەلا ئەحمەدی ئاشۆکانی، ماوەیەک چۆتە(قەراسنج)لای مەلا شێخ حسین سوورچی، لەوێ چۆتە بەحرکە لای مەلا عوسمانی شەوەکی، هەرلەوێ ساڵی ١٩٢٣ ز (جهه الوحده)ی مەنتیقی نووسیەوە، پاشان چۆتە (قازیخانە)لای مەلا عوسمانی خورمەڵە، لەوێ ساڵی ١٩٢٤ ز قزلجی سەر تەێریفی نووسیەوە، ئینجا چۆتە هەولێرو لەخزمەت شێخ مستەفای هەولێر کۆتایی بەخوێندن هێناوە، ساڵی ١٩٣٢ ئیجازەی وەرگرتووەو

مەلایەتی لەسێبیرانی گەورە کردووە پاشان چۆتە پیرزین، لەمەدرەســەی پیرزین دەرســی وتۆتەوە، ســاڵی ١٩٥٠ لەپیرزین کۆچی دوایی دەکات و نجم الدینی کوڕی جێی دەگرێتەوە، بۆتە مەلا لەمزگەوتی عەقید حەیدەر، ســاڵی ١٩٩١ کۆچی دوایی دەکات.

٨- ڕەسول ئەحمەد گڕاوی:

ناوی ڕەسـول کوڕی مەلا ئەحمەدە، کوڕی مەلا ڕەسـوڵی گڕاویە، ساڵی ١٨١٣ ز لەهەولێر لەدایک بووە، لەلای چەند مەلایەک لەهەولێرو دەوروبەری خوێندووە، زۆر شـوێن گەڕاوە، پاشان بۆتە مەلا، لە مەدرەسەی باوکی لە قەڵاتی هەولێر دەرســی داوەتەوە، ســاڵی ١٨٩٤ کۆچی دوایی کردووە، دووکوڕی مەلای لەدوای خۆی بەجێهێشــتووە بەناوەکانی مەلا سەلیم و مەلا عبدالرحمن.

مەلا ســەلیمی کوڕی ســاڵی ١٨٨١ ز هاتۆتە دنیاوە، لەگوندی عەزەی دەشــتی هەولێر مەلا بووەو دەرســی وتۆتەوەو ساڵی ١٩٤٦ کۆچی دوایی کردووە.

٩-صادق محمد شەقڵاوەیی: ناوی صادقە، کوڕی محمدی کوڕی ڕەســوڵی کوڕی عبداللە بەگە، ســاڵی ١٨٨٥ لەشــەقڵاوە لەدایک بووە، لەشــەقڵاوە دەســتی بەخوێندن کردووە، دوایی چۆتە(بجیل) لای مامۆســتا شـێخ حســین،

پاشــن گەڕاوەتەوە شــەقلاوەو لەلای مامۆســتا مەلا تەها ئوێول و بەلاغەو مەنتیق و ریازیاتی خوێندووە، پاشــــان چۆتە هەولێرو لەخزمەت شــێخ مســتەفای نەقشــبەندی شــــەرعەت و کەلامی خوێندووە، ئینجا ئەچێتە لای مەلا ئەفەندی ، ئوسترلاب و شەرحی مەواقیفی تەواو کردووەو لەوێ مــاوەتەوە تــاکوو ئیجــازەی وەرگرتووە، ئینجــا گەڕاوەتەوە شەقلاوەو لەمزگەوتی گەورەی شەقلاوە بۆتە مەلا، دەســـتی کردووە بەدەرســــوتنەوە، ئەچێتە کۆیەو بەشــــدار دەبێ لە تـاقیکردنەوەی ووتـارخوێنی و پێش نوێژی و پلەی بەرز بەدەسـت دێنێ، مامۆسـتا زمانەکانی عەرەبی و فارســی و بەرەوانی زانیوە، چەندین پەراوێزی لەســـەر ئەو کتێبــانەی کە خوێنـدوویەتی نووســــیوە، وەچەندین ئیجازەی بەمەلایان داوەولەسـاڵی ١٩٦٣ کۆچی دوایی کردووە.

١٠ -صــــالح عمر گڕاوی:ناوی صــــالح بوو، کوڕی مەلا عومەری کوڕی مەلا ئەحمەدی گڕاویە، لەگەڕەکی قەڵاتی هەولێر چاوی بەدنیا هەڵێناوە، لەســـاڵی ١٩٢٣ حاشــیەی مەلا حەمزەی ســەر(سـعداللەی گەورەی)نووســیوەتەوە، ساڵی ١٩٤٣ ئەمری خوای کردووە.

١١-صبغەالله مستەفا زیارەتی: ناوی صبغەاللەیە، کوڕی مەلا مستەفایە، خەڵکی گوندی زیارەتی مەلازادانە، یەکێک بوو لەزانا هەڵکەوتووەکانی سەدەی سێزدەی کۆچی، لەبەغدا دەرسی داوەتەوە، داودپاشای والی بەغدا تەفسیری بەیزاوی لەخزمەت خوێندووە، عبدالرحمان پاشای بابان زۆر ڕێزی لێناوە، ئیجازەی مەلایەتی لەمەلا ێالح ئەفەندی حەیدەری وەرگرتووە، خۆشی دەرسی بەمەلا عبدالرحمن ئەفەندی ڕۆژبەیانی و مەلا عبدالرحیمی زیارەتی داوەوەلەساڵی ١٨٥٣ ز کۆچی دوایی کردووە.

١٢-تەها شەقڵاوەیی: مامۆستا مەلاتەها یەکێک بوو لە زانا بەناوبانگەکانی خۆشناوەتی، ئیجازەی مەلایەتی لەخزمەت مەلا ئەبوبەکری ئەفەندی کچک مەلای هەولێری وەرگرتووە، بەردەوام خەریکی وانەوتنەوە و جێبەجێکردنی کاروباری مەلایەتی بووە، چەندان مەلای بەناوبانگ لەسەردەستی مەلاتەها ئیجازەی مەلایەتیان وەرگرتووە، لەوانە (مەلا مستەفای هیرانی ساڵی ١٩٣٦ ئیجازەی وەرگرتووە، مەلایاسین دێرەیی، مەلا تەها مەلا یاسین ، مەلا حوسێن باشوورەیی، مەلا مستەفای بالیسانی ، مەلا ئەحمەدی یۆفی، ووسوو بەحرکەیی و مەلائەبوبەکری هیرانی).

لەدەوروبەری ساڵی ١٩٤١ کۆچی دوایی کردووە، چەندین حاشـــیەو پەڕاوێزی هەن، لەســـەر (تشـــريح الافلاک)و حاشیەی(منە)، لەکۆتایی نووسیویەتی(یاتاها).

١٣-تاها عەلی بالیســانی: ناوی تاهایە، کوڕی شـێخ عەلی، کوڕی شـێخ عیســای، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی مســتەفای، کوڕی عیســایە، ئەم بنەماڵەیە دەگەڕێنەوە ســەر بنەماڵەی پیر خدری شاهۆیی، لەڕۆژهەڵاتەوە هاتوون و سەرەتا لە گونـدی مەلەکـان گیرســـــاونەتەوە، دواتر بەیەکجـاری هاتوونەتەبالیســان، لەدەوروبەری ســاڵی ١٨٧٨ لەبالیســان لەدایـک بووە، قورئـانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە ســـــەرەتاییەکانی تەواو کردن، پێ بەپێ و قۆناغ بەقۆناغ مەرحەلەکانی خوێندنی بەخێرایی بڕین، تاســـــەرکەوت و گەیشـــــتە پلەی بەرز، ئیجـازەی مەلایەتی وەرگرت و لەبالیســـــان بووبەمەلا، دەســـــتی کردبە دەرس دانەوەی فەقێیان و خزمەتی ئایینی پیرۆزی ئیســـلامو مامۆســـتاو تەریقەت، بۆپەرەپێدانی زانیـاری پـاکســـــازی دەروونی تەریقەتی نەقشـــبەندی لەشـــێخ ئەبوبەکری هەرشـــەمی وەرگـرت، تـاکـوو شـــێـخ ئەبـوبەکـر ئەمـری خـوای کردهـاتووچۆی خـانەقـای هەولێری دەکرد، دواتر شـــێخ محمدامینی کوڕی لەجێ داندرا، دوای ئەو شـــێخ عبداللەی

کوڕی، دوای ئەو شێخ مستەفای لە شوێن داندرا، جارێک لەگەڵ شێخ مستەفای نەقشبەندی بۆ ئیرشاد چۆتە قەراج، پاشان شێخ تەها بۆنوێ کردنەوەی تەریقەت چۆتە بیارەو لای شێخ نجم الدینی کوڕی شێخ عمر، دوای مردنی شێخ نجم الدین، دەچێتە لای شێخ علاۆ الدینی برای ، ماوەیەک لەبیارە دەمێنێتەوە و شـــێخ دەیکاتە مدرس، ئینجا ئیزن لەشێخ وەردەگرێ و دەگەڕێتەوە بالیسان.

دوای گەڕانەوەی بۆبالیسان مەدرەسـەیەکی ئایینی گەورە دادەمەزرێنێ کەلەناوچەی خۆشـــناوەتی دەنگ دەداتەوەو تـالیب عیلمەکان لەزۆر شـــوێنی کوردســـتان روولەو مەدرەســـەیە دەکەن و دەبێتە مەڵبەندێکی گەورەی عیلم و زانســـت، لەســـەر دەســـتی شـــێخ تەها چەندین مەلای بەنـاوبـانـگ ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرن، لەوانە(شـــێخ مســـتەفای نەقشـبەندی، مەلا ئەحمەدی ئاشـۆکانی ، مەلا رەشـیدی موکریانی، مەلا ئەحمەدی توتمە، مەلا ئیبراهیمی دۆرەبەکرەیی، مەلاصــادقی ماویلی، مەلا عبدالقادری کانی دەربەنـدی، شـــێخ عبدالکریمی ئۆمەراوە، مەلا فتح اللەی هەرتەلی، مەلا محمدی مەخموری، مەلا ئەحمەدخدرووەرتی، مەلا عبـداللەی ســـکتـانی، مەلا عمری تەرجـانی، مەلا ئیبراهیمی خەتێ، مەلا ئەبوبەکری کۆیی، شـــێخ عەلی

کوڕی، شــێخ عمری کوڕی، شــێخ محمدی کوڕی، مەلا عوسمانی دۆلەزەی).
ســـالّی ١٩٢٨ زایینی بەهۆی رووخـانی خـانووەکەی لە بالیسان ، کەوتە ژێر خانووەکەی و ئەمری خوای کرد.
١٤ -تاهیر ئەبوبەکر سووسەیی: ناوی تاهیرە کوڕی مەلا ئەبوبەکری کوڕی مەلا مەحمموودە، خەڵکی (ســووســە)ی خۆشــناوەتییە، ســـالّی ١٩٠٥ ز لەگوندی حەســـارۆک هاتووەتە دنیا.
لەخزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، کەباوکی کۆچی دوایی کرد چووەتە لای مەلا ئیســماعیلی ئامۆزای، دوایی چۆتە(خەتە)لای مەلا ئیبراهیم، ماوەیەک چۆتە بنەسراوەی گەورە، لای مەلا ئەحمەدی ئـاشــۆکـانی، ئینجـا چۆتە گوندی(ســەران)لای مەلا عبداللە، دوایی چووەتە بالیســان لای شـێخ تەها، دواتر چووەتە مزگەوتی حاجی قادردەباغ لەهەولێرلای مەلا محمدامینی کونەفلووســـەیی، لەو کاتە بۆدەرسـی(فەرائیز)هاتووچۆی مزگەوتی شـێخ مسـتەفای نەقشـــبەنـدی دەکرد، لەلای مەلا عبـدالرحمـانی بەگزادە، پاشان ئیجازەی لە مەلا محمدامین وەرگرت.
لەو شـــوێنانە مەلایەتی کردووە(گۆڕەشــێر، کەندارەقەل، سـەرگەڕان، پیرڕەش، سـووسـە، پاشـان چۆتە هەولێر بۆتە

مەلای مزگەوتی حاجی محمد قاســم لەگەڕەکی ئیســکان، لەوێ فەقێی هەبوون.
لە١٩٨٤/٤/٦ ئەمری خوای کردووە، دوای مردنی مامۆستا، مەلا خالیدی کوڕی جێی گرتۆتەوە، ئەویش لە١٩٩٢/١٢/٢٢ ئەمری خوای کردووە.
١٥-عبدالرحمان رەسوڵ گڕاوی: ناوی عبدالرحمانە کوڕی مەلا رەسووڵی کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا رەسولی کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی مەلا ێالحی کوڕی مەلا یوسفی کوری مەلا عومەرە، خەڵکی گونـدی گڕاوە ســـــاڵی ١٨٨٨لەدایک بووە.
ساڵی ١٨٩٥ز دەستی بەخوێندن کردووە، چەندین شوێن گەڕاوە وەکوو: (قوتـابخـانەی ئەحمەدیە لەهەولێر، چۆتە رواندزلای مەلا ئەســعەدەفەندی، دوایی گەڕاوەتەوە گڕاو، ئینجا چۆتەوە هەولێر لای مەلا رەشـــید لەقەلات، دواتر چۆتە خـانەقـا لای مەلا ئەحمەدی زەلام، ئینجـا چۆتە تەرجان لای مەلا حوســێن توحفەو فەرائیزی خوێندووە، ساڵی ١٩٣٦ چۆتە کەرکوک لەوێ لەبەرواری ١٩٣٦/٦/٢٤ ئیجازەی وەرگرتووە.
بۆ مەلایەتی گەڕاوەتەوە هەولێر لە قوتابخانەی ئەحمەدیە کراوەتە مـدرس، ســـــاڵی ١٩٤١گەراِوەتەوە کەرکوک

تەریقەتی قادری لەلایەن شێخ جەمیلی شێخ علی تاڵەبانی وەرگرتووەو کراوەتە خەلیفە، ســـــاڵی ١٩٦٠ز بۆتە مـامۆســـتای پەیمانگەی ئایینی لەهەولێر لە ١٩٨٢/٨/١٩ کۆچی دوایی کردووە.

١٦-عبدالرحیم صالح زیارەتی

نـاوی عبـدالرحیمە کوڕی مەلا صـــــالحی کوڕی مەلا ئیبراهیمە، یەکێک بوو لە فەقێکانی شـــێخ ئەبووبەکری هەرشـەمی ، زۆر شوێن بۆ خوێندن گەڕاوەساڵی ١٩٢٢ ز کۆچی دوایی کردووەو لە ژێر گومبەتی شـــێخ جەعفەر لەزیـارەت نێژراوە، مەلا مەزهەر کوڕی ئەو زاتە بووە، کوڕی ئەویش مەلا قاســـــمە کە ئێســـتا لەژیاندا ماوەو مەدرەســـەی ئایینی هەیەو چەندین فەقێی هەنە، کاروباری مەلایەتی جێبەجێ ئەکـات، زاتەکی خوانـاس و دڵپـاک و ئەهلی تەریقەتەو زۆر شتی عەجایبی لێدەگێڕنەوە.

١٧-عبدالرحیم مەلازادە زیارەتی

مامۆستا عبدالریم ناسراوە بە مەلا زادەی شافیعی، خەڵکی گونـدی زیـارەتە کەکەوتۆتە خـوار (ســـــەربەن)بەلای باکوورەوە، لەو دۆڵەدا یەکەم گوندی خۆشناوەتیە، زاتێکی بەدین و روولەخوابووە، لەهەموو زانستێکدا بەتوانا بووە، دانراوی زۆر بووە بەلام نەماون.

مەولانا خالیدی شارەزووری کتێبی(تەهزیب ئەلمەنتیقی)لەگەڵ پەراوێزەکانی لەخزمەت ئەو زاتە خوێندووە، هەروەها مەلا ئەبوبەکری باپیری مەلا ئەفەندی هەولێر و مەلا محمدی خەتێ موفتی سۆران ، فەقێی ئەو مامۆستایە بوونە، وەکوو باس دەکرێ ئەو بنەماڵەیە بەرەچەڵەک دەچنەوە سەر پێشەوا (جەعفەری تەییار)برای حەزرەتی عەلی، پێدەچێ لەدوای ساڵی ۱۸۰۱ ز ئەمری خوای کردبێ.

۱۸-عبدالله ئیسماعیل سکتانی

ناوی عبداللەیە، کوڕی مەلا ئیسماعیلی کوڕی خەلیفە محمدی کوڕی مەلا عبداللەیە، ساڵی ۱۸۹٦ز لەگوندی ماویلیان سەربەرواندزهاتووەتە دنیا.

لەلای باوکی دەستی بەخوێندن کردووە، دوایی چووەتە بالیسان لای شێخ تەها، وەبۆخوێندنی ریازیات و فەلەک چۆتە کۆیە لای مەلا بەهائەدین، ساڵی۱۹۲۱ز چۆتە گراولای مەلا عبدالله پاشان لەسەر قسەی باوکی چووەتە هەولێر لای شێخ مستەفا نەقشبەندی تاساڵی ۱۹۳۱ لەوێ ماوەتەوە و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووەو گەڕاوەتەوە بۆ گوندەکەی خۆی سکتان، لەوێ دەستی کردووە بەدەرس دانەوەی فەقێیان، بەشێک لە فەقێکانی بریتی

بوون لە(مەلا شـێخ عمری بالیسـانی، مەلا شـێخ محمدی بالیســـانی، مەلا وەیســـی رۆســـتی، مەلا عبدالقادری دەربەنـدی، مەلا عبـدالعزیزهیرانی، مەلا کـاک علی هیرانی)وەچەندانی تر.

مـامۆســـتـا لەســـاڵی١٩٤٥ز کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی (پاش گەروو)لەسکتان نێژراوە.

١٩-عبدالله سۆر هەرتەلی

مامۆســـتا مەلا عبدالله رەنگی دەموچاو و ریشـــی ســـۆر بووە بۆیە بەو نـاوە نـاوزەدکراوە، یەکێک بووە لەزانـاو مەلایە باش و بەناوبانگەکانی ســـەردەمی خۆی، بەداخەوە مێژوو و بەرواری لەدایک بوون و مردنی وونە، لەگوندی هەرتەل لەدایک بووە، بۆخوێندن چەندین شـــوێن گەڕاوە، ئەوەندەی دەربارەی مەلایەتی زانراوە تەنها ئەوەندەیە لە گوندی(شـــیرە)مەلابووە، دیارە ئەو کات وەکوو ئێســـتا دووگونـد نەبووە، بەڵکوو دووگەڕەک بووە، گەڕەکی سەرێ و خوارێ، کەچی ئێستا (شیرەی سەرێ و شیرەی خوارێ)یە، لەو گوندە مەلابووەو فەقێی هەبوونە، فەقێکانی لەهاویناندا چوونەتە گەڕەکی ســـەرەوەبۆ زســـتانانیش لەگەڕەکی خوارێ دەرســـیـان خوێنـدووە، لەوانە(مەلا محمدی چیوەیی، مەلا عبدالله فەرهادی).

٢٠-عبدالله خدر شێخ مەموودی

نـاوی عبـداللەیە کوڕی خـدرە، خەڵکی گونـدی شــێخ مەموودیـانی ســەربە هەریرە، بەرواری لەدایک بوونی دیـارنیە، لەلای مەلا ئەبوبەکری مـیر ڕۆســتەمەیی خوێندوویەتی لەگوندی(ســارتکە)ی هەرووتیان، ئیجازەی لەوێ وەرگرتووە، بۆتە مەلای گونـدەکەی خۆی، دوایی لەســەر داوای میرانی بایزبەگ نێردراوەتە شــەقڵاوە بۆ دەرس ووتنەوە، دواتر گەڕاوەتەوە گوندەکەی.

ماوەیەک چۆتە بەغدا گوێی لەدەرسی مەلا محمدی فەیزی زەهـاوی ڕاگرتووە، لەشــوێنێکی بابەتێکی ڕەق و ئـاڵۆز زەهاوی ماوەیەک وەســتاوە، شــێخ مەموودی تەنها یەک قســەی لێکردووە، بـابەتەکە ڕوون بووەوەو حەل بوو، زەهاوی بەرچێری پەســتەکی شــێخ مەموودی گرت و بۆلای خۆی ڕای کێشــاوەو پێی گوتوە(ئێســتا مەلا چاکی کوردان تەنیا من و تۆینە)واتا بالەنێوانمان دەرنەچێ.

هەروەهــا ئەڵێن شــێخ مەموودی چۆتە ئەســتەنبۆل بۆبڕینەوەی مووچە، بۆتـاقیکردنەوە نـاردوویـانەتە لای ســەرۆکی زانایان، ئەویش کتێبێکی پێداوە، ســێ ڕۆژ مۆڵەتی داوەتێ بۆ خوێنـدنەوە، دواتر بـانگکراوەو پلەی هەرەبـاشــی وەرگرتووەو دەرچووەبە(مـدرس) جوببەو

مەندیل و عەبایان پێبەخشـــیوە، بەڵام ئەو هیچ کەیفی پێنەهاتووەو هەناسەیەکی هەڵکێشاوەو گوتوویەتی(خۆزگە لەجیاتی ئەوە ئێســتا لەســەر گووفەکی شـێخ مەموودیان بامە)، هەرچەندە کردوویانە نەماوەتەوەو گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان.

چەندین دانراوی هەبوون لەوانە(روچە الاژکیاء)و (خلاصە الوضــع)، مامۆســتا ســاڵی ١٨٤٨ لەشـێخ مەموودیان مەلا بووە، دوای ئەو بەروارە ئەمری خوای کردووە.

٢١-عبدالله عبدالکریم گڕاوی

نـاوی عبـداالەیەکوڕی عبـدالکریمی کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی عبداللەیە، لەگوندی (گڕاو)ی نزیک ســـــەری رەش لەدایک بووە، بۆخوێندن چەند شـــوێنێکی کوردســــتان گەڕاوە، تا قۆناغی ســــوختەیی بڕی، ئینجا چۆتە بەحرکە لای مەلا عوســمانی شــەوەکی، ماوەیەک لەهەولێربووە، دوایی چۆتە مزگەوتی قەڵات لای مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی، پاشـــان چۆتە رواندزلای مەلا ئەســـعەدەفەندی خەیلانی، لەوێ ئیجــازەی عیلمی وەرگرتووە، دواتر گەڕاوەتەوە گڕاو و مەدرەســـــەی فەقێیانی نوێ کردۆتەوەو ناوبانگی مەلایەتی رۆیشـــتووە، لەشـــوێنی دوورەوە فەقێ بۆلای چوونە، لەوانە جەنابی شێخ مستەفای نەقشبەندی هەولێر،

مەلا عبدالرحمانی بەگزادە، ئەڵێن مەولانا خالیدی نەقشبەندی لەشارەزوور هاتۆتە گڕاوماوەیەک دەرسی لەلای باپیری ئەو مەلا عبداللەیە خوێندووە، مامۆستا لەبەرواری ساڵی ١٩٢٩ کۆچی دوایی کردووە.

٢٢-عبدالله محمدامین بێتواتی

ناوی عبداللەیە کوڕی مەلا محمدامینی کوڕی مەلا شێخ محمدی کوڕی مەلا داودی کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی مەلا حوسێنە، ساڵی ١٨٩١زهاتۆتە دنیا، بەچەند نامیلکەیەکی سەرەتایی دەستی بە خوێندن کرد، لەتەمەنی ١٢ ساڵیدا دەستی کردبە خوێندنی(مغني) ماڵیان بارکردووە بۆ هەولێر، ئینجا چووەتە بەحرکە لای مامۆستا مەلاعوسمانی شەوەکی، دوایی گەڕاوەتەوە هەولێر، لەمزگەوتی حاجی قادر لەگەڵ فەقێکانی باوکی خەریکی خوێندن بووە، هەروەها دەرسی بەفەقێکانی لە خۆی بەرەژێری دەدا، تاساڵی ١٩٢١ز ئیجازەی مەلایەتی لەباوکی وەرگرت، کراوەتە پێش نوێژ و دەرسبێژ لەمزگەوتی حاجی قادر، ووتارخوێن لەمزگەوتی شێخی چۆلی، فەقێکانی باوکی و خۆی لەدەوری کۆبوونەوە، تاقمەکی بەڕێدەکردن چینێکی تر جێگای دەگرتنەوە،

ئەوەی نووسراوە تاساڵی ١٩٥٥ز ١٢٥ ئیجازەی مەلایەتی بەمەلایەکان داوە.

دانراوەکانی بریتین لە(نادی الاسلام فی علم الکلام، الجهاد فی التقلید و الاجتهاد، الوسـیله، الصـیام، طلاق الاکراد، تحقیق الاسـلام، المدفع الرحمانی فی الرد علی القادیانی، المنحه الوهبیه فی شـرح الاراده الجزئیه لمولانا خالد الشهرزوری).

کۆچی دوایی ساڵی ١٩٦١زئەمری خوای کردووە.

٢٣ -عبدالله محمد توتمەیی

ناوی عبداللەیە کوڕی مەلا سـید محمدی کوڕی سـید قادرە، خەڵکی گوندی(توتمە)ی خۆشـناوەتیە، سـاڵی ١٩٢٩ هاتۆتە دنیا، تەمەنی پێنج سـاڵان بووە کەباوکی ئەمری خوای کردووە، بۆخوێندن ناردیانە لای (شـێخ محمدامینی زیخـان)ئەویش زاتەکی خێرخوازبووەو هێتیمی بەخێوکردوون، دەسـتی کردبەخوێندن چووەتە گوندی زێوە لای مەلا عبداللەی هەرتەلی، لەوێ چووە خەتێ لای مەلا ئیبراهیم، دوایی چۆتە رواندز لای مەلا عبدالکریم ئەفەندی، پاشـان چووەتە هەولێر لەمزگەوتی حاجی قادر لای مەلا عبداللەی بێتواتە، کۆتـایی بەخوێندن هێنا و ئیجازەی وەرگرت.

بووەتە مەلا لە گونـدی هەرمـک، دواتر چووەتە دەراش، لەوێ چوەتە گۆمەشـــینی قەراج، ماوەیەکیش مەلابووە لە گەزۆک، پاشان گەڕاوەتەوە توتمە، دواتر چووەتە شاوێس ســالی ١٩٥٣ز چووەتە خورماڵ، لەســالی ١٩٥٦ چووەتە چەمـچەمــاڵ، ســــالی ١٩٦١ گەڕاوەتەوە هەولـێر لە قوتـابخـانەی ئاییني قەڵات دەرس داوەتەوە، پێش نوێژ و وتـارخوێن بووە لە مزگەوتی حەمـامچی لەتەیراوە، دوایی چووەتە مزگەوتی حـاجی بەکری زێڕینگەر لە گەڕەکی ئیسـکان، خورەوشـتی پیاوێکی رووخۆش و دەمبەپێکەنین و حەزی لە تێکەڵاوی دەکرد و گران و بوێربوو، نووسـەر و شــــاعیربوو، بەکوردی و عەرەبی شـــیعری دانـاوە، نازناوی(عاجیز)بووە، (ئەی ســەییدی ســەرداری من، ئەی مەحرەمی ئەســـــراری مـن) یەکێکە لەشـــێعرە هەرە ناودارەکانی شــاعیر، بەجۆرێک ئێســتاشـی لەگەڵ بێ ئەو شیعرە لە کۆڕ و یادەئاییـنییەکاندا دەوترێتەوە.

لە کاتی وتارخوێندنەوەی رۆژی هەینی لە ناکاو تووشـــی نەخۆشـــییەکی کوشـــندە هاتووە و وتارەکەی پێ تەواو نەکراوە و بانگی مەلا ئیســــماعیل میکـایلی کردووە بۆ خوێندنەوەی وتاری هەینی، بردوویانەتە نەخۆشـــخانەی

هەولێر و دواتر بۆ مووسـڵ، لەوێ لەرۆژی ٢/٥/١٩٦٧ ئەمری خوای کردووە و تەرمەکەیان هێناوەتەوە هەولێر.

٢٤-عبدالعزیز مستەفا هیرانی

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی کاک مستەفای(صافی) کوڕی عبدالله سانی کوڕی کاک علی کوڕی کاک مستەفای کوڕی کاک عبداللەی کوڕی شێخ سلیمانە، ساڵی١٩١٨ز لەهیران هاتۆتە دنیاوە، لەخزمەت باوکی دەستی کردبە خوێندن، دوایی چووەلای مەلا تەیب، پاشان چۆتە سکتان لای مەلاعبدالله، دوایی چووە بالیسان لای مەلا شێخ تەها، ماوەیەک چووەتە سەران لای مەلا عبدالله، پاشان چووە کۆیە لای مەلا محمدی جەلیزادە، لەوێ مایەوە تاکوو ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، گەڕایەوە هیران چەند ساڵێک لەمەدرەسەی هیران دەرسی داوەتەوە، پاشان چۆتە هەولێرو لەمزگەوتی حاجی عبدالله حەمامچی لەتەیراوە لەوێش فەقێی هەبوون، بەردەوام بووە لەخزمەتکردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، تاکوو ساڵی ١٩٨٣ ز کۆچی دوایی کرد.

٢٥-عبدالفتاح محمود خەتی

ناوی عبدالفتاحە، کوڕی مەلا محمودی کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی عبدالرحمانی کوڕی ئەحمەدی کوڕی

ئیسماعیلی کوڕی شێخ سلیمانە، دەوری ساڵی ١٨٦٨ز لەگوندی خەتە چاوی بەدنیا هەڵێناوە، دەستی بەخوێندن کردووە لە پلەی موستەعیدی چووەتە بیارە، لای مەلا عبدالقادر، چوار ساڵان مایەوە، لەو ماوەیە (شرحی مواقیف)ی خوێند کە هەشت بەرگە، شەرحی مەواقیفی هەموو لەبەر کرد، دوایی چووە پێنجوێن لای مەلا عبدالرحمان، دوایی چووە کۆیە لای مەلا عبداللەی جەلی، پاشان چووەتە هەولێر لە مزگەوتی قەڵات خوێندوویەتی، لای مەلا عمرەفەندی، دوایی مردنی مەلا عمرمەلا ئەبوبەکری کوڕی ئیجازەی بە مەلا فەتاح داوەو گەڕاوەتەوە خەتێ، ماوەیەک لەوێ مەلا بووە، ماوەی حەوت ساڵ چووەتە دیبەگە دیسان گەڕاوەتەوە خەتێ.

بەشێک لە فەقێکانی بریتی بوون لە: شێخ مستەفای نەقشبەندی، مەلا صالحی کۆزەپانکەیی، شێخ عبدالکریمی ئۆمەراوە، مەلا ئیبراهیمی خەتێ، مەلا فتح اللەی هەرتەلی.

مامۆستا مەلافەتاح لەدەوروبەری ساڵی ١٩٢٣ ز کۆچی دوایی کردووە.

٢٦-عبدالقادرمحمد سکتانی

ناوی عبدالقادرە کوڕی محمدی کوڕی عبدالقادرە، ساڵی ١٩٢٧زلە گوندی سکتان بەوەلەد بووە، لای باوکی دەستی

کردووە بەخوێنـدن، دوایی چووەتەلای مەلا ئەحمەدی پلکزای، دواتر چۆتەلای مەلا عبدالرحمانی سـریشـمەیی، پاشـان چۆتەلای مەلایادقی شـەقلاوە، دواتر چۆتەرواندز مـاوەیەکی زۆر لەخزمەت مەلا عبـدالکریم ئەفەنـدی ماوەتەوە، پاشـــان چۆتە رۆســتێ لای مەلا ئەحمەد، مـاوەیەکیش لەبیارە لەخزمەت مەلا عبدالکریمی مـدرس دەرســی خوێندووە، گەڕایەوە رواندزو وازی لەخوێندن هێنـا، بووە مەلای دەرگەڵە، دووبـارە گەڕایەوە بیـارە دەســتی بەخوێنـدن کردەوە، هەرلەبیـارەش ئیجـازەی مەلایەتی وەرگرت، ســاڵی ١٩٦١ بەبڕیاری مەلامســتەفا بـارزانی کرایە مەلای گەلاڵە و بەڕێوەبەری پەیمـانگەی ئیســلامی و ئەندامی لیژنەی فتوا، ســاڵی ١٩٧٠ کرایە ســەرۆکی لیژنەی قازیەکانی شــۆڕش، دوای نســکۆی شــۆڕش دوورخرایەوە بۆ(المســیب)چوارســاڵان لەوێ مـایەوە، مـاوەیەک چووە بەغـدا، دواتر گەڕایەوە قەزای صـدیق، سـۆرانی ئێسـتا، پاشـان گەڕایەوە هەولێر کرایە پێش نوێژ و وتـارخوێن لەمزگەوتی شــێخ عبـداللەی نـاوبـازاڕ و ئەنـدامی لیژنەی فتوا لە یەکێتیی زانـایـانی کوردستان.

٢٧-عبدالمجید سەعید هەرتەلی

ناوی عبدالمجیدە، کوڕی مەلاسـەعیدی کوڕی مەلا خدرە، سـالّی ١٨٩٤زلە گوندی هەرتەل هاتووەتە دنیا، دەسـتی کرد بەخوێندن قۆناغی سـوختەیی تەواوکرد، لە قۆناغی موستەعیدی ماوەیەک لای مەلا شـێخ تەهای بالیسـانی و ماوەیەک لەلای مەلا ئیسماعیلی ماویلی و ماوەیەک لەلای مەلا فتحواللەی هەرتەلی بووە، پاشـان چووە مزگەوتی حـاجی قـادردەبـاغ لەهەولێر لای مەلا محـمـدامینی کونەفلوسـەیی مـاوە تـائیجـازەی وەرگرت، بووەمەلا لە بێلینگە چەند سـالێک لەوێ مەلا بوو، پاشـان باری کردبۆهەرتەل، لەوێ دەرسـی دەدایەوە، مەلامسـتەفای بێلینگە و مەلا محمدامینی وەرتی و مەلاعەلی ئال مدرس فەقێی ئەو بوون، لەسالّی ١٩٨٤ ز کۆچی دوایی کردووە.

٢٨-عبدالمجید عبدالله گڕاوی

نـاوی عبـدالمجیـدە، کوڕی کوڕی مەلا عبـداللەیە کوڕی مەلاعبـدالکریمی کوڕی مەلا عبداللەی گەورەیە، سـالّی ١٩١٦ ز لەگونـدی گڕاوی بنـاری سـەری رەش لەدایک بووە، لەخزمەت بـابی دەسـتی بەخوێنـدن کردووە، لەقۆنـاغی سـوختەیی بـابی کۆچی دوایی کردووە، لەمەدرەسـەی ئەم شـوێنانە خوێندوویەتی(خەتێ، بالیسـان،

هیران، شـــەقڵاوە، بـاتـاس، روانـدز)، لەلای ئەم زاتـانە خوێندوویەتی(مەلا ئیســماعیل نـاقیێ، مەلا عوســمـان دۆڵەزەیی، مەلا عبـداللەی تەرجـانی، مەلا عبـدالعزیزی شـیلەخەنی)، پاشـــان چووەتە هەولێر لەمزگەوتی شــێخ مسـتەفا نەقشـبەندی، ماوەی ســێ ســاڵان لەوێ بووە و ســـاڵی ١٩٤٠ز ئیجـازەی وەرگرتووە، بەڵام هێشـــتـا خوێندنەکەی تەواونەکردبوو، بۆیە ســـاڵی ١٩٤١ز چووە کەرکووک لای مەلا ئەحمەدی حەکیم، تاکوو سـاڵی ١٩٤٥ لەوێ مایەوە ئینجا ئیجازەی وەرگرت.

یەکەم شـــوێن کە مەلایەتی لێ کرد (تۆبزاوە)بوو، چەند سـاڵان لەوێ دەرسـی داوەتەوە، دوایی کرایە پێش نوێژ و وتــارخوێن لەمزگەوتی حــاجی مەحموود لەکەرکووک، پاشـان هاتە شـەقڵاوە لەمزگەوتی (میرانی عوسـمان بەگ)، لە ساڵی ١٩٨٥لە مەسیف حوجرەی مزگەوتی دروستکردن و خانووی بۆ مامۆستایان دابین کرد بەناوی (مەدرەسەی گڕاو)دەستی بەدەرسدانەوە کرد، بەخۆی بەزۆری دەرسی (توحفە و بەیزاوی)دەدایەوە، بە(ئالقە)جگە لەفەقێکان چەند مەلایەکیش لەو دەرسە دادەنیشتن.

بەشـــێک لەفەقێکانی بریتی بوون لە (مەلا عبدالصـــمدی رێدار، مەلاعبدالرحمانی شـــەمشـــوولەیی، مەلا صـــالحی

گردەســـۆری، مەلا محەمەدی ئازیانەیی، شـــێخ جەلالی بەرزنجی، مەلا عبـدالرحمـانی کەلاری، مەلا عومەری باوەفەتی، مەلا عوسمانی لاسەیی و...هتد).

دووجار سەفەری حەجی کردووەلەساڵکانی ١٩٤٦و١٩٦٩.

ســێ مانگی زســتانان دەچووە بەغدا، لەتەکیەی خالیدیە دەمایەوە، ژووری تایبەتی هەبوو، مەلایان و خوێندکاران و رۆشــنبیرو نووســەران دەورەیـان لێدەدا، وەعزو ئامۆژگاری و ووتاری بۆدەدان، ئەوانەی لەکوردســتان دەچوون لەلای دەمـانەوە، یـارمەتی دەدان، بەتـایبەتی نەخۆشەکان کەدەچوونە بەغدا.

مـامۆســتـا زانـایەکی مەزن بوو، ڕێزی خەڵکی دەگرت، خەڵکیش ڕێزیان لێدەنا، قســەی خێری دەکرد، قســەی دەرۆیشــت، یارمەتی هاوڵاتیانی دەدا، بەتایبەتی بۆمەلاو فەقێ قەڵەمی لەکاربوو، لەلای کاربەدەســتان نامەی رەت نەدەکرایەوە.

لەبەرواری ٢٠ی مـانـگـی ســەفەری ١٤١٥ک ١٩٩٤ز لەنەخۆشــخـانە هەولـێر ئەمری خـوای کـردوو لە گۆڕســتـانەکەی پێش مزگەوتەکەی مەســیف بەخـاک سپێردرا.

٢٩-عەلی تەها بالیسانی

نـاوی عەلیە، کوڕی شـــێخ تەهـای کوڕی عەلی کوڕی عیسـای کوڕی ئەحمەدی کوڕمسـتەفای کوڕی عیسـایە، ساڵی ١٨٩٣ زلەبالیسـان چاوی بەدنیا هەڵێناوە، لەخزمەت بـاوکی دەســتی بەخوێنـدن کردووە، مـاوەیەک لەلای موسـتەعیدەکـانی بـاوکی خوێنـدوویەتی، دوایی چۆتە دیبەگە، لای مەلا عبدالفتاحی خەتێ، گەڕاوەتەوە بالیسان ، ئینجا چۆتە سـلێمانی لای شـێخ عمری قەرەداغی، چۆتە کەرکوک لای مەلا رەزای واعیز، گەڕاوەتەوە بـالیســـان خزمەت باوکی ســالی ١٩٢٩ باوکی کۆچی دوایی کرد، ئەویش چووە لای مەلا ئەبوبەکرە فەنـدی هەولێرمـایەوە تاکوو ئیجازەی وەرگرت.

گەڕایەوە بالیسـان دەسـتی کرد بەمەلایەتی، سـاڵی ١٩٦١ چۆتە هەولێر بووەتە مەلا لەمزگەوتی سـیتاقان، سـاڵی ١٩٧٣ ز کۆچی دوایی کرد.

٣٠-عەلی عبدالله بیتواتی

ناوی عەلیە کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی مەلا محمدامینی کونەفلووسـەیە، نازناوی(ئال مدرس)ە، سـاڵی ١٩٢١ ز هاتۆتە دنیا، لەخزمەت باپیری دەستی بەخوێندن کردووە، لەکتێب جامی چووەلای مەلا عبدالقادری سـوریچژەی

لەمزگەوتی خۆیـان لەهەولێر، دوایی چووە بێلینکە، لای مەلا عبـدالمجیـدی خـاڵی، مـاوەیەک چووە دارەبەن لای مەلاخدری دەشتی، گەڕایەوە هەولێر ماوەیەک چووە لای مەلا صـــالحی گۆزەپانکەیی، هاتەوە لای باوکی و کۆتایی بەخوێندن هێنا، ســـاڵی ۱۹۵۳ز ئیجازەی وەرگرت، دوایی کرایە پێش نوێژ لەمزگەوتی موفتە و وتـارخوێن لەمزگەوتی شێخی چۆلی. مامۆستا بەشداری لەشۆڕشی ئەیلوول کرد و کرایە ســــەرۆکی یەکێتیی زانایان، دوای تێکچوونی شـــۆڕش گەڕایەوە هەولێر، مـاوەیەک رژێم دووری خســـتەوە پاشـــان گەڕایەوە هەولێر، لەبەرواری ۲۰۰۰/٤/۸ ئەمری خوای کرد.

۳۱-عەلی محمد مامەجەلکەیی

مەلا عەلی مـامەجەلکەیی یەکێـک لەو نووســـەر و کوردیزانانەیە، زۆرکەم ناســـراوە، لەبەرانبەردا ناوبراو خزمەتێکی زۆری زمـان و فەرهەنگی کوردی کردووە، بەڵام بەداخەوە تائێســـتا بەرهەمەکانی رووی چاپیان نەدیوە، بۆیەشە ناوی وەک سەربازی ون دەخەملێندرێ.

مامۆســـتا مەلاعەلی کوڕی محمدی کوڕی شـێخ محمدە، لەساڵی ۱۹۱۷ ز لە گوندی مامەجەلکەی سەربە شەقڵاوە هاتووەتە دنیاوە، ســـەرەتا لەگوندی ماوەران لای مەلا

عبدالوهابی حەیدەری خوێندوویەتی، پاشـــان لای زۆر لە لەگەورە زانایانی سەردەمی خۆی وەک شێخ عبدالحمیدی ئەترووشــی و مەلا ئەســعەدی خەیلانی لەگوندی وەردە خوێنــدوویەتی و دواتر لەلای مەلا عبــداللەی شـــێخ عبدالصـــمدی ســـەران لێ بۆتەوە، بۆیە لەگوندی ئاکۆیان پێشنوێژی و دەرسبێژی دەکات و دواتر گوندەکەی خۆی و پاشـــان دەبێتە ئیمامی ســەربازی تاســاڵی ١٩٤٣، دوای ئەوەی لەپیشەکەی دەردەکرێ لەساڵی ١٩٤٧ دەبێتە واعیز بۆ بارزانیە کۆچپێکراوەکان لەگوندی شـــانەدەر، دواتر لەســـاڵی ١٩٦٠دەبێتە مامۆســـتای ســـەرەتایی لەگوندی قەراســـنج، پاشـــان بۆ مەخمورو خالێ دەگوازرێتەوەو لەوێوەش بۆ شـــارەبان و دارەمان و تۆبزاوەلەکەرکەک، لەســـاڵی ١٩٧٧ خانەنشـــین دەکرێ، تادواجار لەرێکەوتی ١٩٨٧/١٢/١ کۆچی دوایی دەکات، بەداخەوە تالەژیان بوو هیچ بەرهەمێکی چاپکراوی خۆی نەبینی.

ناوبراو کۆمەڵێک بەرهەمی لەدوای خۆی جێهێشـــتووە وەکوو:

١-وشەبەندی زمانی کوردی کە بریتیە لەچل هەزار وشە.

٢-فێرکەری ئینگلیزی و کوردی لاتینی نوێ.

٣-راڤەی وشەکانی قورئانی پیرۆز.

٤-گاڵە و رێزمانی کوردی.
٥-تەرازووی هۆنراوە.
لەگەڵ چەندین نووسین و کتێب کەدیارنەماون.
٣٢-عمر تاها بالیسانی
ناوی عمرە کوڕی مەلا شـــێخ تاهایە کوڕی عەلی کوڕی عیسـای کوڕی ئەحمەدی کوڕی مستەفای کوڕی عیسـایە، سـاڵی ١٩١٠ لەبالیسـان چاوی بەژیان هەڵێناوە، لەخزمەت شـێخ تەهای باوکی دەسـتی بەخوێندن کردووە، سـاڵی ١٩٢٩ بـاوکی بەکـارەســـاتێک کۆچی دوایی کرد، دوای مردنی باوکی چووەتە هەولێر لە مزگەوتی قەڵات لای مەلا ئەبوبەکرە فەندی درێژەی بەخوێندن داوە، تاکوو سـاڵی ١٩٣٢ ئیجـازەی وەرگرتووە و دوای وەرگرتنی ئیجـازە گەڕاوەتەوە بالیسـان و لەمەدرەسـەکەی خۆیان دەسـتی کردووە بە مەلایەتی و دەرســـدانەوە و جێبەجێکردنی ویردەکانی تەریقەتی نەقشـبەندی، سـاڵی ١٩٥٢ چووتە هەولێرو لەگەڕەکی ســـیتاقان مزگەوت و مەدرەســـەی ئایینی دروست کرد بەناوی(مزگەوتی شێخ عمر بالیسانی) مـاوەیەک بەڕێوەبەری قوتـابخـانەی ئـایینی بوو لە مزگەوتەکە.

بەشـــێک لە فەقێکانی بریتی بوون لە(مەلا شـــێخ محمدی برای، مەلا شـــێخ ئەبووبەکری برای، مەلا عومەری گۆڕەشـــێری، مەلاســـەعید نواوەیی، مەلا ئەنوەر شـــەمشـــولەیی، مەلا عبداللەی فەرهـادی، مەلا عەلی خەرابەدراوی، مەلا شێخ عبداللەی گردەسۆری، دواتەمەنی وازی لەدەرس دانەوە هێنا، تەنیا خەریکی خواپەرسـتی و ئامۆژگاری خەڵک بوو، لەرووی نووسـین و شـیعرداناندا دەسـتێکی باڵای هەبوو ، کتێبی شـیعری چاپکراوی هەیە بەناوی(رێگای راستی ژین، بۆدنیاو دین)

شـــێخ عومەر لەبەرواری ١٩٨٩/٤/١٩ ئەمری خوای کردووە لەژوورێکی تەنیشـــت مزگەوتەکەی بەخـاک سپێردرا.

٣٣-عیسا ئەحمەد خۆشناو

ناوی عیســـایە کوڕی ئەحمەد کوڕی میکایلە، مدرس و موفتی شـافیعیەکان بووە لە کەرکوک، دوای سـاڵی ١٧٨٥ کۆچی دوایی کردووە.

دانراوەکانی بریتی بوون لە:

١-تەفسیری سوورەتی الاخلاص بەتورکی.

٢-تەفسـیری سـوورەتی الفتح پێشـکەشـی بە سـولەیمان پاشای والی بەغدا کرد.

٣-تەفسیری قورئانی پیرۆز لەسوورەتی مریەم تاسوورەتی الناس.

٣٤-عیسا هەرتەلی

مامۆستا مەلا عیسا خەڵکی گوندی هەرتەلە سەر بەناحیەی بێتواتەی سەربەرانیە، یەکێک بوو لەمەلاو زانا بەناوبانگەکانی خۆشناوەتی، هەر لە گوندەکەی خۆی ماوەیەکی زۆر مەلا بووە دەرسی بە فەقێیان داوە ئیجازەی عیلمی لە موفتی بەغدا محمد فەیزی وەرگرتووە، سەبارەت بە بەرواری لەدایک بوون و کۆچی دوایی هیچ زانیاریەک نییە.

٣٥ -فائیزعبدالله بێتواتی

مەلا فائیز کوڕی کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی مەلا محمدامینی کونەفلووسەیە، ساڵی ١٩٣١ز لە گەڕەکی عەرەبی هەولێر لە دایک بووە، ساڵی ١٩٣٧ ز چووەتە بەر خوێندنی پەرەوەردەیی، ساڵی ١٩٤٦ لەسەرداوای باوکی خوێندنی پەرەوەردەیی جێدەهێڵێ و لەخزمەت باوکی دەست دەکات بەخوێندن، ساڵی ١٩٥٥ز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە و ساڵی ١٩٦١ کەباوکی ئەمری خوادەکات جێگەی باوکی دەگرێتەوە و دەست دەکات بەتەدریس و پێشنوێژی و کاروباری مەلایەتی، ساڵی ١٩٧١ کراوەتە

بەڕێوەبەری پەیمانگەی ئایینی مزگەوتی حاجی قادردەباغ، دواتر کراوەتە بەڕێوەبەری پەیمانگەی ئیســلامی هەولێر، پاشان پەیوەندی بەشۆڕشی ئەیلوولەوە کردووە و سالی ١٩٧٥ گەڕاوەتەوە مزگەوتەکەی خۆیان لەهەولێر.
سالی ١٩٩٠ لەنەخۆشخانەی موصل کۆچیدوایی دەکات و دەیهێننەوە هەولێر لەگۆڕستانی شێخی چۆلی دەنێژرێت.
٣٦-فتح الله محمد هەرتەلی
ناوی فتح الله بوو کوڕی محمدی کوڕی عەلیە، ســـالی ١٨٩٥ز لەگوندی هەرتەلی خۆشـــناوەتی هاتووەتە دنیا، دەســتی کردووە بەخوێندن، کە قۆناغی ســوختەیی بڕیوە چووەتە بێتواتە، لای مەلا نەبی حەیدەری خوێندوویەتی، مــاوەیەکیش چۆتە خەتێ و لای مەلافەتــاحی خەتێ خوێندوویەتی، هەروەها (ئوصــول)و(کەلام)ی لەلای شـێخ تەهای بالیســانی تەواوکردووە، پاشــان چۆتە کۆیەولای جەنــابی مەلامحمــدی جەلی ، لەوێ مــاوەتەوە تــاکوو ئیجــازەی وەرگرتووە، گەڕاوەتەوە گونــدەکەی خۆی (هەرتەل)و پەرەی بەعیلم و زانســـتی ئایینی داوەو تاکوو وای لێهــاتووەکەنــاوی مەلافتح اللەی هەرتەلی نــاوبــانگی دەرکردووە، هەرچەندە بەجەســتە بچووک بەڵام پڕلە عیلم و زانســـت و مەعریفەت، زۆربەی مەیەکانی ســـەدەی

رابردوو لەژێردەستی ئەو زاتە خوێندنیان تەواو کردووەو بوونەتە مەلا وەکوو(مەلایەعقووبی تالشی و مەلاعبدالصمدی سوێسنی و مەلامحمدی هەرتەلی و مەلائەحمەدی تاژانی و مەلاعبدالرحیمی تالشی و مەلا ئەحمەدی توتمەو مەلاعبدالقادری شێخ وەتمانی و مەلامحمودی دووگرتکانی و مەلارەسولی عاللاوەیی و مەلائەبوبەکری شەرکان و مەلاعلی حاجی تۆفیق و مەلامستەفای هیرانی و...هتد).

سالی ١٩٤٦ز مامۆستا مەلا فتح الله کۆچی دوایی دەکات و دەگەڕێتەوە بەر دلۆڤانی خوا.

٣٧-محمد ئەبوبەکر شەقلاوەیی

ناوی محمدبووە، کوڕی ئەبوبەکری شافیعی، خەڵکی شەقلاوەبووە، ساڵی لەدایک بوونی دیارنیە، زاتێکی بەرزو بەتواناو لەخواترس بووە، لەزانستی (ئەقلی)دەستێکی باڵای هەبووە، چۆتە شام و لە دیمەشق گیرساوەتەوە، لای شێخ علی داغستانی فەرموودەناس خوێندوویەتی، دوای تەواو کردنی خوێندن کراوەتە پێش نوێژلەمزگەوتی (ئەمەوی)، لەقوتابخانەی سلیمان پاشا دەرسی داوەتەوە، هیچ دنیاداری نەکردووە، بەڵکوو تەواوی ژیانی بۆ خزمەتی ئایین تەرخان کردووە، ئەوەی شایانی باسکردنە

بەپێی چووەت حەج ، ئەو پیاوە دیندارە لە ســـاڵی ١٧٧٥ز کۆچیدوایی کردووە و لە گۆڕســـتانی(الصـــالحیە)بەخاک سپێردراوە.

٣٨-محمدئەحمەدخەتی(مەلای خەتێ)

ناوی مەلا محمد کوڕی مەلائەحمەدی کوڕی عبدالرحمانی کوڕی ئیســـماعیلی کوڕی شـــێخ ســـلیمانە، ســـاڵی ١٧٨٥زلەگوندی خەتێ هاتۆتە دنیا، ئەو بەرەبابە بەشـــێ سێمان لەبەر شێخ سلیمانی باپیرە گەورەیان بەناوبانگن، گۆڕســـتانەکەش بەشـــێخ ســـێمان ناودەبرێ و لامەکە حەزفکراوە.

سەرەتای خوێندنی لەلای چەند مەلایەک و چەند شوێنێک خوێندوویەتی، وەکوو مامۆســـتا ابن ئادەمی بالەکی و ئەبوبەکری میررۆســـتەمەیی و مەلا عبدالرحیمی زیارەتی و لەدواقۆناغدا چۆتە لای مەلا عبدالرحمانی رۆژبەیانی ولەوێش ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە؟

زانایەکی بەرزو بەتوانا بووە ، پســـپۆڕی هەموو جۆرە زانستەکان بووە، ساڵی ١٨١٥ز محمدی پاشای رواندز ، لەبەر زیرەکی بەتوانایی ئەو زاتە کردوویەتی بەموفتی سۆران، زانایانی ئەو سەردەمە سەلماندوویانە کەمەلای خەتی مامۆســـتای هەموویان بووە، شـــێخ مســـتەفای

نەقشبەندی لەزنجیرەی مەلایان بەئەوپەڕی ڕێزەوە ناوی دێنن، شـێخ ئیبراهیم فەسـیح لەکتێبی(عنوان المجد)دەڵێ(مەلای خەتێ مامۆستای زانایان بووە، دەستی بالآبووە لە وردەکاری زانستی)، مامۆستا مەسعود محمد دەڵێ(زانیاری مەلای خەتێ هێندە قورس و بەسـەنگن بەهیچ تەراوو و میزانێک نایێنە کێشان).

چەندین مەلا لەسەر دەستی ئەو پێگەییوون، وەکوو(مەلا ئەحمەدی بالەکی، مەلاحسـینی پشـدەری، مەلائەحمەدی ڕەمکی، مەلا محمدی هەرشەمی، مەلا ئەحمەدی نۆدشەیی، مەلا عبداللەی جەلی، مەلا عمرەفەنـدی خەیلانی، مەلا ئەسعەدی جەلی، حاجی قادری کۆیی).

لەسـەرفەرمانی محمدپاشـای ڕواندز مەلامحمد چووەتە بەغداو بۆ لای داودپاشـا، ئەویش زۆر ڕێزی پیاوانی ئـایـیـنـی گـرتـووە، بەتـایـبەتـی مەلای کـوردی زۆر خۆشـویسـتوون، بۆیە زۆر ڕێز وحورمەتی دەگرێت، دوورنییە هۆی ئەو سـەفەرە پێکهـاتنێکی نهێنی بووبێ لەنێوان داودپاشـاو مەلای خەتی بۆجیابوونەوەی سۆران لە دەوڵەتی عوسـمانی، حکومەتی عوسـمانیش درکی بەوەکردبێ، بۆیە بەفەرمانی دەوڵەتی عوسمانی داودپاشا لادەبرێ و علی ڕەزای لەجێدادەنرێ، کەدژی محمدپاشـای

رواندز بووە، هەرئەو عەلی رەزایەش بوو دەوڵەتی عوسمانی هاندا بۆلەناوبردنی ئیمارەتی سۆران.

بەداخەوە مێژووی ئەو پیاوە شێوێندراوەو بەخۆفرۆش و فتوادان کەئەوەی دژی دەوڵەتی عوسمانی شەڕبکات کافردەبێ لەکەدارکرا، ئەم مێژوو شێواندنە تائێستاش کێشەکێشی لەسەرەو مێژوونووسان دابەشی دووبەرەبوونە، هەندێکیان پێیان وایە کەبەڵێ راستەو مەلای خەتی فتوای داوە کە شەڕکردن لەبەرانبەر دەوڵەتی عوسمانی کارێکی نەگریسەو دروست نییە شەڕ لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیدا بکرێ، تەنها بەڵگەش کەلەبەر دەستیان دابێ نووسینەکەی حسین حوزنی موکریانییە لەکتێبی میران سۆران ، بەرەکەی تریش پشتگیری لە مەلای خەتێ دەکەن و پێیان وایە ئەوەی حسین حوزنی باسی دەکات راست نییە و لەسەر کێشەیەکی موڵکداری ئەو بوختانەی بۆ هەڵبەستووە، وەکوو باس دەکەن پاشای کوڕە هێندە پیاوێکی بێدەستەڵات نەبوو کەسێک کەخۆی بیکات بە لێپرسراوی فتوای ئیمارەتی سۆران و لێی یاخی ببێ ، ئەگەر وابوایە زوو لەناوی دەبرد، هەروەها دوای مردنی میر محەمەدی رواندزی مەلای خەتێ گەڕاوەتەوە گوندەکەی، چەندان ریشسپی و پیاو ماقوولی رواندز

بەدوای دادێن مەلا خەتێ دەبەنەوە رواندز، ئەگەر ئەو مەلایە رابردووی ئەوەنـدە خراپ بووبێ و ئیمـارەتی سـۆرانی رووخاندبێ چۆن خەڵکی رواندز بەدوای دا دێن جـارێکی تـر دەیبەنەوە روانـدز؟ لە لایەکی تـریش شـەڕکردنی ئیمارەتی سـۆران بۆ ماوەی دەسـاڵ لەدژی ئەو هۆزو عەشـیرەتانەی کەنۆکەری دەوڵەتی عوسـمانی بوون بەئـاگاداری مەلای خەتێ بووە، ئەی بۆ ئەو کـاتە فتوای نەدەدا کەشـــەڕکردن لەگەڵ دەوڵەتی عوســـمانی حەرامە؟ ئەمـانە و دەیـان پرســـیاری تر خۆیـان قووت دەکەنەوە.

جگە لەوەی دەمڕاســـتی میرمحمد بوو بەردەوامیش بووە لەســـەر دەرســـدانەوە، هاوینان چۆتە شـــەقڵاوە لەوێ دەرسـی داوەتەوە، زسـتانانیش گەڕاوەتەوە رواندز، تاکوو رۆژی شـەممە پاش نیوەڕۆی سـاڵی ١٨٦٠ مامۆسـتا مەلا محمدی خەتێ کۆچیدوایی کردو لەگۆڕستانی (گەردەگەرد) بەخاک سپێردرا.

دانراوەکانی:

١-حاشیە لەسەر تەفسیری بەیزاوی

٢-حاشیە لەسەر جمع الجوامع.

٣-حاشیەلەسەر تحفە المحتاج.

٤-رساله العلم.

وەچەندین کتێب و نووسینی تری فەوتاون.

٣٩-محمدامین شێخ محمد کونەفلوسەیی

نــاوی محمــدامینە کوڕی مەلا شـــێخ محمــدی کوڕی مەلاداودی کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی مەلا حوســـێنە، ســـاڵی ١٨٦٦ز هاتۆتە دنیا، باپیری لەبێتواتە دانیشـــتووە، باوکی چۆتە زێوە، پاشان لەسەر داوای شێخ نەبی ماویلی چۆتە کونەفلووسە.

خوێنـدنی لای بـاوکی دەســـتی پێکرد، پـاشـــان چۆتە شـەقڵاوەلای مەلاعوسـمانە فەندی موفتی ئاداب و خەیاڵی خوێند، دوایی چۆتە رواندزتشـــریح گەلەنبەوی بورهانی لای مەلا محمــدامینی خەیلانی خوێنــد، چووە شـــێخ مەمووندیان بەشـــی بەیانی متەوەل و عەقائیدی دەوانی لای مەلا عبداللەی شـــێخ مەمووندی خوێند، ماوەیەکیش لای مەلا سەعیدی هیرانی بووە، چەند مانگێک دەگەڕێتەوە کونەفلووسـە، ئینجا دەچێتە کۆیە لای مەلا عبداللەی جەلی ئـیـجــازە وەردەگــرێ و دەگەڕێـتەوە لای بــاوکـی بـۆ دەرســـــدانەوە و فەتوادان و جێبەجێکردنی کـاروبـاری مەلایەتی، پـاش ســـاڵێک بـاوکی کۆچیـدوایی دەکـات، بنەماڵەی حاجی عبدالقادر دەباغ لەهەولێر داوایان لە شـێخ

ئەبوبەکری هەرشـــەمی کرد مەلایەکی باشــیان بۆ بنێرێ، ئەویش بەدوای مەلا محمدامینی دا نارد و چووە هەولێر، کرایە پێشـــنوێژ و مـدرس لەو مزگەوتە، فەقێ روویـان تێکرد، لەدوور را دەهــاتنە لای، تـاقمەک دەبووە مەلا چینەکی دیکە دەهات، ئەوەی دیارەو نووســـراوە لەژیانی خۆیدا٥٧ ئیجازەی مەلایەتی بەمەلایەکانی ئەم وڵاتەداوە.

لەرۆژی هەینی ساڵی ١٩٤٠ز کۆچی دوایی کرد.

٤٠-محمدامین قەراسنجی

ناوی محمدامینە خەڵکی گوندی قەراســـنجی بناری چیای ســـەفینە ســـەر بەقەزای شـــەقڵاوە، زانـایەکی بەرزی ســـەردەمی خۆی بووە، محمد صـــالح ســـەهروەردی لەکتێبی(لب الالباب)دا دەڵێ:(شـێخ محمد تەهای شـێروانی کە زانایەکی ناسـراو بووە لە ١٩٣١ز کۆچیدوایی کردووە، یەکێک بوو لە فەقێکانی ئەو زاتە.

٤١-محمد زیارەتی

مامۆســـتا مەلا محمد خەڵکی گوندی زیارەتی مەلازادانە، ئەو گوندەی کۆتا گوندی خۆشـناوەتییە، کەوتووەتە دۆڵی ئـاژگە و زرگوێز، ســـاڵی ١٧٢٠ زهـاتووەتە دنیـاوە، مێژوونووس یاسـین عمر دەڵێ: مامۆسـتا زانایەکی بەرزو پایەدار بووە، لەزانستەکان شـارەزا بووە، لەشـاری ئاکرێ

موفتی بووە و دەرسی داوەتەوە، ساڵی ١٧٨٢ ز لەئاکرێ وەفاتی کردووە.

٤٢-محمد تاها بالیسانی

ناوی محمدە کوڕی شێخ تەهای کوڕی عەلی کوڕی عیسای کوڕی ئەحمەدی کوڕی مستەفای کوڕی عیسایە، ساڵی ١٩١٧ز لەبالیسان لەبنەماڵەیەکی شێخزادەی بەناوبانگ لەدایک بووە، لەلایەن شێخ تەهای بابیەوە دەستی بەخوێندن کردووە، ماوەیەک چۆتە لای شێخ عمری برای، دواتر چۆتە کۆیەلای مەلا عبدالقادری کانی دەربەندی، ئینجا چۆتە توتمە لای مەلا مستەفای بالووکاوەیی، لەو شوێنانەش خوێندوویەتی(خەتێ، شیرە، هەرووتەکەون)پاشان چووەتە هەولێر لەمزگەوتی حاجی قادر، لەکۆتاییدا لەلایەن شێخ عومەری برایەوە ئیجازەی وەرگرتووە.

یەکەم جار لەناوچەی هەڵەبجە بووەتە مەلا، دوایی بەفەرمانی کاکی گەڕایەوە هەولێر لەمزگەوتی شێخ عومەربالیسانی بووبە وتاربێژ، پاشان لەگەڕەکی تەیراوە مزگەوتێکی دروستکرد بەناوی بالیسانی لەوێ دەرسی دەوتەوە، ساڵی ١٩٦٥ کرایە پێشنوێژ و وتارخوێن لەمزگەوتی گەورەی کۆیە، ئینجا بوو بە مودەریس

لە(کوبەیســە)ی ســەر بە رومادی، ســاڵی ١٩٧٠ گەڕایەوە بەغدا و لە مزگەوتی (مصـــرف) مایەوە لەکۆتاییدا چووە مزگەوتی(حســن البارح) لە(ســبع ابکار)ی بەغدا، تادوایین ژیانی لەو مزگەوتە مایەوە، شێخ محمد بالیسانی پیاوێکی زاناو نووســەرو رۆشــنبیرو ئەدیب بوو، لەبەغدا پیاوێکی خۆشــەویســت لەبەر چاوان بوو، هەڵوێســتەکانی بەرانبەر بە گەلەکەی و خەڵکی هەژارنەگۆڕو مـاڵەکەو حوجرەی مزگەوتی حســن البارح هەمیشــە جمەی دەهات لەخەڵک ، یارمەتی ئەو خوێندکارانەی دەدا کەدەچوونە بەغداو لەوێ کـارئـاســـــانی بۆ دەکردن بۆ جێگـای مـانەوەو لەهەموو روێکەوە یارمەتی دەدان.

لەڕێکەوتـی ١٩٩٥/٤/٢٥ لەبەغـدا کـۆچـی دوایـی کـردو لەگۆڕستانی گەیلانی بەخاک سپێردرا.

دانراوەکانی

١-کیف تحج وکیف تعتمر.

٢-اللطف الخفی نظم عقائد النسفی

٣-القول الوفی فی شرح اللطف الخفی

٤-النصائح المفیده

٥-القول الحصین فی تفسیر سوره یاسین

٦-القول المنصف فی تفسیر سوره یوسف

٧-تفهيم الامه فی تفسير جزء عم

٨-القول المبارک فی تفسير جزء تبارک

٩-ثمن ماء الكوثر

١٠-هذا شعری وهذا شعوری

١١-هذا رايی وهذا مذهبی

١٢-اقول هذا

١٣-دەنگی دەروون تەفسيری سورەتی نوون

١٤-چرای رووناکی بۆ رێگەی پاکی

١٥-رۆڵە پەروەری

٤٣-محمد تاها باليسانی

ناوی محمد تاهايە، کوڕی يەحيای کوڕی سليمانی کوڕی محمدە، لەساڵی ١٧٢٣ لەباليسان لەمانگی مەولودکاتێک باوکی لەمزگەوت بووەو خەريکی خوێندنەوەی مەولود خوێندنەوە بوونە ، ئەو کاتەی مەولود خوێن دەڵێ(پێغەمبەر د.خ پێی دەڵێن محمد و تەها و ياسين)لەو کاتەدا يەکێک هەواڵ دەداتە باوکی کەخوا کوڕێکی پێداون، بۆيە هەرلە مزگەوت ناوی دەنێن محمد، بەڵام دەبێ بەنازناوی تەها ناوببرێ، چونکە مامێکی بەناوی محمد لەژيان دايە، ئەوکاتی ئەگەر يەکێک لەخزمە نزيکەکان بەهەر ناوێک بووبێ نابوايە ناوی زيندوانی لێبنێن، زياتر

بەشێخ تەهای بالیسانی بەناوبانگ بووە، لەزۆربەی گوندەکان شوێنی عیبادەت و خواپەرستی هەبووە و ئێستایش شوێنەکان هەربەناوی شێخ تەها ناودەبرێن، پیاوێک بووە هەموو ژیانی گەڕیدەیی بووە، چۆووتە شام و حیجاز و میسر و وڵاتی رافیدەین و لە دیمەشق کۆچیدوایی کردووە، باپیرە گەورەی شێخەکانی بالیسانە و کاتی خۆی لە رۆژهەڵاتی کوردستانەوە هاتوونەتە ناوچەکە و یەکەم جار لەمەلەکان نیشتەجێ بوونە دواتر بەیەکجاری هاتوونەتە بالیسان.

٤٤-محمد عبدالله زیارەتی

ناوی محمدە کوڕی عبداللەیە، خەڵکی گوندی زیارەتی مەلازادانە، زانایەکی زیرەک و بەتوانا بووە کتێبی(چەغمین)ی لەلای مەلا یەحیای مزووری خوێندووە، لەدەرسی مامۆستا حاڵی بووەو گوێی لەباسی(شەعیریە)راگرتووە، نامیلکەیەکی لەسەر ئەو باسە نووسیوە، سەرەتایەکەی بە(الحمدلله الزی اقام السموات بامرە)دەست پێ دەکات، پێشکەشی بەداودپاشا کردووە هەروەها (توحید الصانع ، ببرهان التمانع) داناوە و ئەویشی پێشکەش بە داود پاشا کردووە.

٤٥-محمدقادر هەرتەلی

ناوی محمدە، کوڕی مەلا قادری کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی مەلا محمدی کوڕی مەلا حەسەنە، ساڵی ١٩١٠ ز لەگوندی هەرتەل هاتۆتە دنیا.

لەخزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە لای مەلا شێخ ئەحمەدی وەرتی، دوایی چۆتە زێوە لای مەلا عبداللە، پاشان چووەتە کەرکووک لای مەلا تاهیرەفەندی، گەڕاوەتەوە هەرتەل لای مەلا فتح اللە، لەکۆیە لەمزگەوتی بایزاغا لای مەلا بەهادین ئیجازەی وەرگرتووە.

بووە مەلا لە وەرتێ، دوایی چووە زێوە، ماوەیەک لەدەراش بووە، ئینجا گەڕاوەتەوە هەرتەل و ماوەی بیست و پێنج ساڵ لەهەرتەل ماوەتەوە و دەرسی داوەتەوە، پاشان چۆتە هەولێر بۆتە مەلای مزگەوتی ناو بازاڕ.

ئیجازەی بەو مەلایانە داوە(مەلا ئەحمەدی مەلا ئیبراهیمی خەتی، مەلاصادق مەلا ئیبراهیم خەتی، مەلا عبدالباقی هەرتەلی، مەلا عەلی هەرتەلی، مەلا شێخ عبداللەی زیخان.

٤٦-محمد مستەفا قیرژەیی

ناوی محمدە کوڕی فەقێ مستەفایە، ساڵی ١٩١٧ ز لەگوندی قیرژە لەدایک بووە، دەستی بەخوێندن کردووە، دوای تەواوکردنی قۆناغی سوختەیی چۆتە قەراسنج، لای

مەلا محمدامین، دوایی چووەتە ســـکتان لای مەلا عبدالله، پاشان چۆت باتاس لای مەلا شەریف، ئینجا چۆتە هەولێر لەمزگەوتی شێخ مستەفاو هەرلەوێش ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە.

بۆتە مەلا لەقیرژە، ماوەیەکی زۆر لەوێ ماوەتەوە، پاشان باری کردووە بۆ ســـێبیرانی گەورە، چەند ســـاڵێک لەوێ دەرســـــی داوەتەوە، پاشـــــان چۆتە هەولێرو تووشـــــی نەخۆشـــــیەکی کوشـــــندە بووەو لەبەرواری ٢٠٠٧/١٠/٧ کۆچی دوایی کردووە.

٤٧-مستەفا بالیسانی

مامۆســـتا مەلا مســـتەفای خۆشـــناو لە گوندی بالیســـان لەدایک بووە، مێژووی لەدایک بوون و مردنی دیارنییە، یەکێک بووە لەزانایانی ســـەدەی دوازدەی کۆچی، لەکتێب و مەنهەجی دەرســـــی ئایینی شـــــارەوزاییەکی تەواوی هەبووە، لەزانســـــتەکانی ئاییندا دەســـتێکی باڵای هەبووە، لەلای مەلا صـــبغە اللەی مـــاوەرانی خوێنـــدوویەتی و پێگەیشتووە، لەمەدرەسەکانی موصل دەرسی داوەتەوە، مێژوونووس(عصـــام الدین عمر) دەنووســـێ(مامۆســـتا مەلا مســـتەفا بالیســـانی مامۆســـتای من بووە و من لەســـەر

دەستی ئەو پێگەیشتووم، وەبەئەو پەڕی ڕێزەوە باسی ئەو مەلایە دەکات.

٤٨-مستەفا زیارەتی

مامۆستا مەلا مستەفا خەڵکی گوندی زیارەتی بناری چیای سەفینی خۆشناوەتیە، ساڵی ١٧١٨ز هاتۆتە دنیا، زانایەکی زیرەک و وردبین بووە، یاسین عمری مێژوونووس لە(غایە المرام)دا دەڵێ(پسپۆڕی ناسراوی چەرخی خۆی بوو، هیچ شەریعەتزان و بوێژێک ئاوقاتی ئەو نەبووە و هیچ کەسێک خۆی لەقەرەی ئەو نەداوە، محمدامین عمری لە(منهل الاولیأ)دەڵێ من لەماوەران بەخزمەتی گەیشتم ، بەزۆرزان و زیرەک هاتە پێش چاوم. مامۆستا ئیجازەی لەمەلا صبغەالله ئەفەندی وەرگرتووە، ناوبراو لە ساڵی ١٧٨٣زکۆچی دوایی کردووە.

٤٩-مستەفا عبدالله هیرانی(صافی)

ناوی مستەفایە، کوڕی کاک عبداللەی کوڕی کاک عەلی کوڕی کاک مستەفای کوڕی کاک عبداللەی کوڕی شێخ سلیمانە، لەبەرەبابی میر مەحمەریە، کاتی خۆی شێخ سلیمان میر بووە، پاشان وازی هێناو تەریقەتی قادری لەشێخ تەهای بەتلیسی وەرگرت، دەستی کردووە بە ئیش و کاری تەریقەت، صافی کەنازناوی شاعیریەتی ساڵی

١٨٧٣زلەدایک بووە، لەلای باوکیەوە دەســـتی بەخوێندن کردووە، بۆخوێندن چەند شــوێنێک گەڕاوە وەکوو(کۆیە، هەولێر، رواندز، ســەران، ئۆمەرگومبەت، لاجان، پەســوێ، سابڵاغ، )چەند ساڵێک لەلای باوکی قازی محمدی پێشەوا خوێندوویەتی، شــارەزایی لەزمانەکانی (کوردی، عەرەبی، فارســی، تورکی)هەبووە، دوای ئەوەی باوکی ئەمری خوا دەکات دەبێتە جێنشینی باوکی.

صافی جگە لە مەلایەتی دەستێکی باڵای هەبووە لەشیعر نووسیندا، جگە لە کوردی شیعری بەزمانەکانی عەرەبی و تورکی و فارسی هەیە، وەک خۆی دەڵێ:

خۆی کوردیە(صــافی)لەهەوای عەشــقی توو ئێســتێ
کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی بووبە ئەشعار

شیعرەکانی بەشێکیان دڵدارین، ئەوانی تر ئایینین، شیعرە ئایینییەکانی جگە لەمەدحی پێغەمبەر زۆربەی بە شــێخ عبدالقادری گەیلانی هەڵگوتووە، دیوانە شیعریەکەی ساڵی ١٩٥٣ز چــاپکراوە و جــاریکی تر لەســـــاڵی ٢٠٠٤ز بەلێکۆڵینەوەی محمد مەلا مســـتەفا هیرانی لە هەولێر چاپکرایەوە.

لەبەرواری ١٩٤٢/٢/١٢ بەیەکجاری ماڵئاوایی لە دۆســتان و مریدان کرد، لەگۆڕســـتانی شـــێخ ســلیمان بەخاک

سپێردرا، کەئەشکەوتێکی ئەستکارە، تایبەتە بەو بنەماڵەیە، گۆڕەکەشی لەپێشدا خۆی بۆخۆی هەڵیکەندبوو.

٥٠-مستەفا فازیل بالیسانی

مامۆستا مەلا مستەفا ناسراو بوو بە (فازیل)یەکێک بوو لەمەلایە باشەکانی خۆشناوەتی، لەبالیسان لەگەڕەکی(میرووسیان) دەرسی بە فەقێیان دەداوە، کە میرانی رەشیدبەگ سەرپەرشتی مەدرەسەکەی دەکرد، دوایی کرا بە واعیز لەشەقڵاوە، پاشان چووەتە هەولێر لەگەڕەکی سیتاقان نیشتەجێ بوو، هاتووچۆی خانەقای شێخ مەزهەری دەکرد، لەوێ لەگەڵ مەلایان لەلای مەلا شەریف دووشیوانی کۆدەبوونەوە بۆ وتوویژ لەسەر بابەتی شەریعەت.

مامۆستا زۆر بەزمانی عەرەبی سەرسام بوو، بۆیە زۆر جار بەکوردی پرسیاریان لێدەکرد ئەو بەعەرەبی وەڵامی دەدانەوە.

٥١-مستەفا فەقێ ئەحمەد توتمەیی

ناوی مستەفایە، کوڕی فەقێ ئەحمەدە، کوڕی عەزیز، کوڕی ئەحمەد کوڕی زبیرە، لەساڵەکانی ١٨٧٠ لەگوندی بالووکاوە(توتمە)لەدایک بووە، چووەتە بەر خوێندن ماوەیەک لەلای مەلا عبداللەی توتمە خوێندوویەتی، زۆر

شـــوێن بۆ خوێندن گەڕاوە، مـاوەیەک چووەتە نـاوچەی هەورامــان ، ئینجــا چووەتە رۆژهەڵات و نەگەڕاوەتەوە تـاکوو دوای پێنج ســــاڵ وون دەبێـت و بەمەلایەتی دەگەڕێتەوە، لەبـالووکـاوە دەبێتە مەلاو دەســـــت دەکـات بەدەرس دانەوەی فەقێیـان، هـاوینـان لەکەپری مـاڵی خۆی لەســەر (کانیێ قولەتێنێ) دەرس دەڵێتەوە، زســتانانیش لە حوجرەی گونـد دەرس دەڵێتەوە، تـاکوو ســــاڵی ١٩٢٠، چەندین مەلای ئەو ســەردەمە لەلای ئەو دەخوێنن، یەکێک لەوانە شــێخ محمدی بالیســانی بووە، دوای ئەو بەروارە دەچێتە هەولێرو لەمزگەوتی (ناجیەخان)کەئێستا مزگەوتی ئەوقافی پێدەڵێن، دەگیرســێتەوە، ماوەیەک لەوێ دەبێت و لەوێش پیشــــەی هەر دەرس دانەوە دەبێت، تاکووســـاڵی ١٩٤٣نەخۆش دەکەوێـت و دەیبەنە بەغـداو لەوێ ئەمری خوا دەکــات و هەرلەوێش دەینێژن، کەواو ســــەڵتە و مەندیلی بۆ خێزانەکەی دێننەوە.

ئەمە بەشـێک بوو لە زاناکانی خۆشـناوەتی، دەشـێ زۆری تریش مابن، لە دەستکەوتنی هەر سەرچاوەیەک لەوبارەوە بێگومان ڕەگەڵیان دەخەم.

# راوکردن لە خۆشناوەتی

چونکە بەشێکی زۆری سروشتی خۆشناوەتی بریتییە لە چیای سەخت و عاسێ، بەشێکیشی بریتیە لەدەشت و دۆڵ، بۆیە جۆرەها گیانلەبەر و باڵندەی کێوی بوونیان هەیە، جارانیش خەڵک هەژار بووە، لەبەر ئەم هۆیە حەزی کردووە کەماوەماوە خواردنێکی چەور بخوا، لەهەموو شوێنێکیش وایە کە کۆمەڵێک کەس خەریکی راوکردنن، هەم وەکوو نەریتێک و خولیاو ئارەزوێک زۆربەی ژیانیان لەراوکردن بردووەتە سەر، ئەمە تایبەت نیە تەنها بە خۆشناوەتی بەڵکوو لەناو زۆربەی هۆز و تیرەکان گرنگییان بەراوکردن داوەو تاکوو ئێستاش خەریکی راوکردنن، هەرچەندە لەلایەن حکومەتەوە راوکردن بەفەرمی قەدەغەیە، بەڵام قەدەغەکان هێندە گوێی پێنەدراوەو بێترس ئەو کارە دەکرێت، هەندێ راوکردن کاتی خۆی بەهۆی بەنرخی پێستەکەی دەکران، وەکوو راوە رێوی و دەرەک و پرینگ و ئەوانی تر، هەندێکیش هەربۆخۆشی، جۆری راوکردنیش یان بەتەڵە یان داو یان بەکار هێنانی چەک، کاتی خۆی چەک هەر هەبووە، بەڵام فیشەک کەم بووە، زۆربەی زۆری گوندەکانیش خاوەن

مێگەلە مەڕو ماڵات بوون، لەوەرزی زســـتاندا مێگەلەکان لەئەشـــکەوتدا دەکران، وەک شـــوێنی حەوانەوەی مەڕو مێگەل و وڵاخی بەرزە لە ئەشـــکەوت دەکران، کە وەرزی هاوین دادەهات ئەو زبڵەی لە ئەشـــکەوتەکان بەجێدەما، زبڵەکە بەهۆی مانەوەی لەئەشـــکەوت کەڕوێکی ســـپی وەکوو کەف دەردەدات، ئەم کەڕوەیان کۆدەکردەوە واتە کەفە ســـپیەکە، بۆماوەیەک دەیان کوڵاند، دوای ئەوەی جۆرە چەوریەک ســـەر ئاوەکە دەکەوت ، چەوریەکەیان لەناو ئاوە کوڵاوەکە دەردەهێنا، دواتر وشکیان دەکردەوە، دوای وشـــک بوونەوە ماددەیەکی وردی لێدەردەچوو، وەکوو باررووت زوو گڕی دەگرت، ئەم باررووتە(تێزیان) پێدەگوت، وەکوو ئەیان وت(ســـەنگەران لێ وەگوێزی، لەتفەنگێ نەبڕی تێزی).بەشـەکەی تریشیان لەگەل مشکی داری بی تێکەڵ دەکرد، دواتر بەشـــێوەیەک راوکەرەکان هەڵیان دەگرت، هەرکاتێک پێویست بوایە لەکاتی راوکردن لەگەڵ هەندێ وردە ســـاچمە تێکەڵیان دەکرد و لەناو قەوانی تفەنگەکەیان دەکرد و دەیان تەقاند. ئەم باررووتە بۆ جۆرە تفەنگەکانی(ماوزەڕو تفەنگە رەشـکەو جامبێزار) بەکـاریـان دەهێنـا، گەلێـک جـاریش بەهۆی بەهەڵە

تێکەڵکردنی تێز و مشـکی لەکاتی تەقاندن زیانی لەراوکەر داوە و دەموچاوی سووتاندووە.
چیاکانی سـەفین و بەنەباوی و هەورێ و شۆپە و ماکۆک و سەربار و شاخی سوور و زەرتکان و ئاراسن ، ئاژەڵی کێوی وەکوو(پڵینگ و بەورو هەرس و گورگ و رێوی و توورگ و بەرازوکەفتیارو بزن و نێریە کێوی و شووری) زۆر لێ هەبووە، ئاژەڵە دڕندەکان جێگەی مەترسـی بوون بۆ سـەر گیـانی راوکەرەکـان، بۆیە دەبوایە راوکەر کەدەچـووە راوکـردن دەبـوایە هەمـوو حـیسـاب و بەرەنگـاربوونەوەی لەگەڵ ئـاژەڵە دڕنـدە کـان کردبـایە، جاران بۆپشـت بەسـتن و بۆبەرگری کردن لە گیانلەبەری دڕندە زیاتر خەنجەربەکاردەهات، زۆربەی زۆری خەڵک خەنجەری دەبان و هەرەباشیان لەبەر پشتێن دەناو ، هەم جوانیەکی بەمرۆڤ دەبەخشـی، هەم بۆبەرگریکردن ئاسـانتربوو، هەرکاتێک یەکێک هێرشـی بۆ هێنـابا خەنجەرئـامـادەبوو و یەکسـەربەکـاری دەهێنـا، وەکوو ئەیانوت(خەنجەربرایە، تفەنگ ئامۆزایە)مێژووی راوکردن پڕیەتی لەکارەسـات و لەناوچوونی راوکەرەکە و چەندین راوکەر بەدەسـتی نێچیرەکەیان لەناو براون یان خوراون، چەندین نموونە هەیە لەخۆشـناوەتی لەکاتی راوکردندا

گیانلەبەری درندە کوشـتوویەتی یان مار پێوەی داوە، یان لەکاتی راوکردندا تفەنگیان لەدەست دەرچووەو هاورێکەی کوشتووە.

من لێرەدا راوکردنەکان دابەش دەکەم بۆ راوی چەند گیان لەبەرێک:

١-راوی هەرس: بەهۆی ئەوەی ورچ(هەرس) ئـاژەڵێکی درندەیە و زۆرجار بووەتە رێگر لەهەندێ کارداو زیانی بۆ خاوەن مێگەلەکان هەبووە، بۆیە راوی ورچ کە گەلەک ترســـناک بووە، بەڵام هەندێ جار مرۆڤی وا لێ کردووە کە هەرچۆنێک بێ بەرەنگاری ببنەوە، نموونەمـان زۆرە چەندان چیرۆک لەو بوارەدا گوێبیســـت بووینە، کەهەرس چۆن هێرشــــی بۆمرۆڤ کردووە و چەندین جار مرۆڤی تێک شـــکاندووەو کوشـــتوویەتی، بۆلەناوبردنی هەرس بەتەنیا بەکەسـێک نەدەکرا، بەڵکوو دەبوایە چەند کەسـێک رێک بکەون و پلانێک دابنێن ئینجا هێرشــــی بۆببەن، ئەو چیرۆکـانەی کەبـاون لەنـاوچەکە زۆربەیـان بە(خەنجەر) هێرش کراوەتە سەر هەرس، بەشێوەیەک کەسێک بە لباد دەستی خۆی دادەپۆشی و کە هەرس هێرشی بۆکردووە دەمی خۆی لێک کردۆتەوەو کابراش دەســتی خۆی لەناو دەوی هەرس شــۆرکردۆتەوەو بەدەســتەکەی تریش یان

ئەوانەی لەگەڵ ی بوونە بەخەنجەر کەوتوونەتە گیانی و کوشتوویانە، لە زۆربەی گوندەکان ئێستاش لە چیاکان (کونە هەرس) ماون کە ورچ لەو کونانە ژیاوەو خۆی حەشارداوە، کەشوێنێکی قوولەو تاریکەو کەم کەس توانیویەتی بچێتە ژوورەوە، هەندێ جاریش بەچەک کوشتوویانە، یان بەرەوە سەگ هێخستوویانەو دواتر کوشتوویانە، کوشتنی هەرس تەنها یەک سوودی هەبوو، ئەویش بەهۆی ئەوەی جاران (ێابوون و تایت و پاککەرەوە)نەبوون، بۆیە دوای کوشتنی هەرس ، بەزەکەیان بۆ پاککردنەوەی جلوبەرگ و پێداویستی تر بەکارهێناوە، پێستەکەشیان وەکوو شانازیەک لەماڵەوە پاراستووە و خۆیان پێهەڵداوەتەوە.

٢ -راوەبەراز: بەهۆی ئەوەی جاران چیاکان چڕوپڕبوون لەدارو بار، بەجۆرێک کەوا مرۆڤ نەی دەتوانی رێ بکا لەچیا، داربەڕوو و دارمازی و کرۆسک و چەقەلە کیوی و دارەبەن و گێوژ بەشێوەیەک پاڵیان دابووە یەک کەس نەی دەتوانی دوری پەنجا مەتر کەشف بکات، بۆیە ئەم هۆیە بووبووە پاڵنەرێک کەوا بەراز لەناو ئەو لێڕەوارە بحەوێتەوە و خۆی حەشاربدا، ئەمە وای کردبوو کەوا رێژەیان زۆرببێ و نەدەتوانرا دەرەقەتیان بێن، هەروەها

چەکیش بەم شـێوەیە نەبوو بۆ لەناوبردنیان، بۆیە ســاڵ وەســاڵ هەرلەپەرەســەندن و زیادبووندا بوون، خەڵکی خۆشــناوەتیش ژیانیان لەســەر جوتیاری بوو، هەموو گونـدێک رەزی دێمیـان هەبوو، بەرازیش حەزی لەترێ خواردن و تێکدانی رێزە مێو و تێکدانی گەنم و جۆو برنج و نۆک و نیســک بوو، بۆیە دەبوایە بۆپـاراســتنی بەرووبوومیان پاســەوانی لە رەزو گەنم و جۆو برنج و نۆک و نیســکەکەیان بکەن، بۆپاراســتنی رەز شــەو دەچوونە سـەر دارێکی بڵندی ناو رەز، کاتێ کەرەوەبەراز هێرشــیان دەکردە ناو رەز، خاوەن رەز یان پاســەوان دەیـکردە هــاوارهــاوارکردن، چونکە لەدەنگی گەورە دەترســێ، یان تەنەکەیان لێدەدا، ئەگەر ئەوەیان نەکردبایە بەراز ئاژەڵێکی زۆر خۆرە ئەوەی دەیخوارد رێزەمێوەکانی تریشی تێک دەدان، بەرازەکانی خۆشناوەتی زۆر گەورەن نێرەکەیـان کە (ئێکـانە) ی پێدەڵێن هێندەی جوانەگایەک دەبێمێیەکەشــی (مــالۆس) ی پێـدەڵێ~ن لەنێرەکە گچکەترە، بۆیە راوە بەراز لەخۆشــنــاوەتی بـاوبوو، مەبەستەکەش بۆزیاتر پاراستنی رەز باخ و واریدات بوو، راوی بەراز راوێکی خۆشـە، ئەگەر یەکێک زۆر سـوعبەت چی و گـاڵتەجـاڕبێ ئەڵێن(دەرێی راوەبەرازە)، چونکە

لەکـاتی راوکردنی دەبێتە پێکەنین و کەیف و رابواردن، راوەبەراز بەزۆری بەســەگ دەکرا، چەند ســەگێک دوای راوکەر دەکەوتن و کە راوکەردەگەیشتە بەراز خاوەنەکەی دەنگی ســـەگەکەی دەداد ئەی وت(تۆی هیزە هەلەلۆیها) ئیدی ســـەگەکە دوای بەرازەکە دەکەوت، بەراز نـاتوانێ ئاوڕ لەپشـــتەخۆی بداتەوە و هەروەها بەراز کۆئەندامی نێرینەی لەبن کلکیەتی بۆیە ســەگەکە ئەو شـوێنەی بەدەو دەگرت و بەری نەدەدا تاکوو دەی هێخست، دوای ئەوەی کەبەرازەکەیان دەکوشـت هەردوو گوێی بەرازیان دەبڕین و لەملی ســـەگەکەیان دەکرد، ئەوە نیشـــانە بوو کەئەو ســەگە بەرازی گرتووە، هەندێ جاریش بەراز کە ســەگ هێرشـی بۆدەبرد پاشـەڵی خۆی بەشـوێنێک وەدەناو سـەگ زەفەری پێنەدەچوو و لەغــاردان زۆر خێرایە، کەرای دەکرد ئەیـان ووت(تیرەی بەســـت)، کـاتێ کە تیرەی دەبەســت ئەوەی لە پێشــی بوایە فڕێی دەداو بەهۆی دوو ددانی پێشـــەوەی کە(گیر)ەی پێدەڵێن هەڵیدەدڕی، بەراز ئاژەڵێکی زۆر بەزاوزێیە ، ئەڵێن مێیەی بەراز(١٢) بێچوو دێنێ، ســاڵی یەکەم ســێ بێچوو ســاڵی دووەم شــەش و ســـاڵی ســـێیەم نۆو ســـاڵی چوارەم ١٢ بێچووی دەبێ، بێچووی بەراز (کودەرەبەرازی) پێـدەڵێن، وە ١٢ گوانی

هەن هەر وەک لە مەتەڵی کوردەواری دەڵێن(چاری چێرێ، هەشتی دێرێ، دوازدەی رەمەقە کوێرێ).

٣ -راوەرێـوی: رێــوی هەرچەنــدە هەنــدێ کەس نایخواوحیسابی گۆشتی سەگی بۆ دەکەن بەلام بەگشتی دەخورێ، گۆشتی رێوی بەگەواهی ئەوانەی خواردوویانە ئەڵێن بۆن دڕی لێدێ ، دەبێ ماوەیەک لەناو ترش و سـماقاو بکرێ، ئینجا شـیاو دەبێ بۆخواردن، هەندێکیش ئەڵێن گۆشتی رێوی بۆ (باداری) رۆماتیزم یەکاو یەکە.

چۆنیەتی راوکردنی رێوی یـان بەتەڵەیە یـان بەچەک دەکوژرێ، پێسـتی رێوی زۆر بەنرخ بووە، گەلێک کەس تەنهـا بۆ پێسـتەکەی راوە رێویـان کردووە، رێوی لەفێڵبازیدا نموونەی نیە، چەندین بەسـەرهات و چیرۆک دەربارەی رێوی گوێ بیسـت بووینە، کەسـێکی گوندی (توتمە) گێڕایتیەوە و وتوویەتی:

رۆژێکی کۆتـایی هـاوین، کۆمەڵێک خەڵک هـاوکاریـان دەکردین لەچیـا بۆ برینی گەلای داربەڕوو بۆکردنی بە (دێیەچروو) منیش لەماڵەوەبووم، سـەبەتەیەک هەنجیری جوانیان بۆ ئامادەکردم و پێیان وتم دەبێ سواری کەرببی و بچی ئەو هەنجیرانە بۆ زبـارە چروو ببەی منیش سـواری کەرەکەم بووم کە کەرێکی زۆر بچووک بوو،

سەبەتە هەنجیرەکەشیان ویدام لەپێش خۆم دانا، گەیشتمە شوێنێکی چۆل، سەیرم کرد ریویەک بۆلام دیت، چەندێ کردم وازی لێنەهێنام، دووجارلەکەرێ هاتمە خوارێ ، بەدوای کەتم بەلام وازی لێنەهینام، لەو سەین و بەینەدا سەبەتە هەنجیرەکەم لێکەوتە خوارەوەو رژا، بەبێ هەنجیری چوومە لای زبارەی چرووبرین و بۆم گێرانەوە، ئەوانیش پێکەنین.

٤-راویکەروێشک: کەروێشک(کوێریشک)،(کێروشک) ئەو گیانلەبەرە جوانەی کە ژینگەی کوردستانی جوانتر کردووە، لە کوردستاندا بەگشتی زۆرە، وەبەتایبەتی لەخۆشناوەتی چونکە ژینگەکەی لەبارە بۆ ژیانی کەروێشک، گەلێک زۆرە بەلام بەهۆی راوکردنی لەلایەن راو چیەکانەوە ناوەناوە کەم دەبێت و دواتر پەیدا دەبنەوە، بەهۆی ئەوەی زووزوو کەروێشک بێچوو هەڵدێنێ بۆیە زوو گەشەدەکەن و زۆر دەبن.

کەروێشک زۆر حەزی لە گندۆرەیەو هەروەها داری (ئەسپینداریش) سپی دەکات و دەیخوا، بۆیە هاوینان لەنزیک بێستانی گندۆرە هەندێ بەرد لەسەر یەک دادەنێنم و دەیکەنە (میل) پێش داهاتنی تاریکی کەروێشک برسی دەبێت و بۆ خواردنی گندۆرە خۆی دەخزێنێ، چونکە

بەدرێژایی رۆژ خۆی حەشـــار داوەو هیچی نەخواردووە، بۆیە کەنزیک میل بووەوە ئەوا راوچی تەقەی لێدەکات و دەبێتە نێچیر، هەروەهـا جـاران بەهۆی تـاژی راودەکرا، چەنـد ســـوارێک دەچوونە راو تـاژیـان لەگەڵ بوون و کەروێشــکیان راو دەکرد، کلکی کەروێشــک زۆر جوانە ، زۆر جار ئەو کلکەیان لێدەکردەوە لەســـەر (کۆچک) ی منداڵ قایمیان دەکرد، چونکە جوان بوو.

٥-راوەکەو: چیـاکـانی خۆشـــنـاوەتی پڕیەتی لەکەو و ســـووســـکە کەبەکەوێ زیخی ناودەبرێ، ئەو باڵندە باڵ نەخشاوە هەرلەبنەڕەتدا لەو شاخ و کێوانە ژیاوە، قاسپەی کەو و دەنگدانەوەی چیا و شاخ ئاوازێکی جوانی بەو ناوە دەبەخشـــــی، بەهـۆی ئەوەی کەو خـۆی راودەکـات و بەباڵندەیەکی خۆخۆر دەژمێردرێ بۆیە گەلێک جار ئەیان گووت(کورد وەکوو کەو خۆخۆرە)، کەو بەزۆر رێگـا راوکراوە وەکوو (داو، تەپکە، دێوجامە، تۆڕ، چەک) ، بەڵام خۆشترین راوەکەو ئەو کاتەیە کە بەفرێکی زۆر کەوتووە، رۆژێـک دوای بەفرکەوتن کۆمەڵ کۆمەڵ بەلەک پێچ و کارەکەگاکەلە پێستی ئاژەڵ دروست دەکرا و لەسەر بەفر هەڵنەدەخلیســـکـا ، دەچوونە دەوروبەری گونـدەکـان ، کەویش لەبەر ئەوەی هیچ شـوێنێکی ســەوزایی نەماوە و

هەمووی بەفردای پۆشـــیوە ، بۆیە لەشـــوێنێکی ژێر تاشـــەبەرد بەکۆمەڵ خۆیان حەشـــارداوە، دوای ئەوەی دەبینرێنەوە و بەڕەوە هەڵـدەفڕن، ئەو کـاتە دەبێتە هـاوارکردنی راوچیـان و ئەڵێن(هـات کەو لۆ فرانە جێی) لەو کاتەدا لەبەر ئەوەی لەکاتی نیشـــتنەوە لەســـەر بەفر زووباڵەکانیان تەڕ دەبن بۆیە ناتوانن بفڕنەوە بۆیە زوو دەگیرێن، ئەگەر ســـــاڵێک بەفر زۆر بکەوێ ، ئەوا لەو ســاڵەدا کەوی کوێســتانەکانیش بۆخواردن دێنە خوارەوە، ئەڵێن(کەوی مهاجیر هاتیە) بەهۆی لاوازی دەناســرێنەوەو ڕێگایان دووربووە بۆیە لاوازن.

هەروەهـا لەوەرزی هـاویندا و دوای گەرمـا داهـاتن کەو بەهەمـــان شـــێوە بەگەرمـــا زۆر نـــاتوانێ بفڕێ، بۆیە بەگەرماش زوو دەگیرێ، ئەمە جگەلەوەی کاتێک کەدەچنە سـەر ئاو و راوچی لێی دەگەڕێ تاکوو تێرئاو دەخواتەوە، ئینجا هێرشـی بۆدەکاو چونکە ئەوەندە ئاوی خواردۆتەوە بۆیە ناتوانێ بفڕێ، بۆیە لەو کاتەشدا راو دەکرێ.

هەروەها لەخۆشـــناوەتی تاک تاکە کەوی ســـپی بینراوە بەڵام زۆربەکەمی، کەوی(کەومار)یش تاک و تەرا بینراون ، وەکوو ئەڵێن کەومار شـێوەکەی ســەری لەماردەچێ و کەچی خوارەوەی کەوەو ئەڵێن ژەهریشـــی هەیە، وەکوو

باس دەکەن لەکاتی خوێندی کەوماردا هیچ کەوێک ناوێری دەنگ بکاو هەموو کەوێک بێدەنگ دەبن.
سـووسـکەش کەلەزۆر شـوێن پێی دەڵێن(کەوی زیخی) ، کەمێـک لەکەو گچکەترەو رەنگیـان مەیلەو بۆرەو لەگەڵ جۆری خاکەکە دەگونجێ و وون دەبێ، سـوووسـکە لە شـوێنی سـاردو کوێسـتان ناژی ، بەڵکوو لە شـوێنی کەندەڵان دەژی، وەکوو دەڵێن گۆشتی سووسکە خۆشترە لەکەوی ئاسـایی، دەنگیشـی وەکوو کەو خۆش نیەو زۆریش ووشیارنیە بۆیە زوو دەگیرێ.
هەروەهـا هەرلە و کاتەدا کەبەفر کەوتووە (پۆڕ)یش راو دەکرێ، ئەویش کەیفی بەبەفرنـایەو بۆیە زوو بـاڵی تەڕدەبن زوو راودەکرێ.
٦ -راوەگاپەل: گاپەل لە کۆمەڵەی کۆترە بەڵام گەورەترەو رەنگیشیان وەکوو کۆترە کێوی وایە، گاپەل جاران گەلەک زۆربوون بەڵام ئێسـتا دانەدانە مـاون و کەم دەبینرێن، وەکوو ئەیان ووت گۆشـتی گاپەل، لەهەموو باڵندەیەک خۆشـترە، چۆنیەتی راوکردنی پاییزان بوو، ئەو کاتە دەو رووبارەکانی خۆشـناوەتی چۆمی ئەسـپیندار بوو، ئەوەندە چڕوپڕبوون، هەموو زیندەوەرێک دەیتوانی خۆی لەنـاو چۆمە سـپیندار بشـارێتەوە، دوای ئەوەی بارانی پەرە

تەواو دەبوو، شـــەو کۆمەڵێک کەس بەلایت دەچوونە ناو چۆمە سـپیندار، رەوە گاپەلیش لەسـەر دارەسـپیندارەکان نیشـــتبونەوەو باڵیان تەڕبووبوون ، یەکێک لایتی لەچاو دەدان و ســـپیندارەکەیان رادەوەشـــاند گاپەل دەکەوتە خوارەوەو راویان دەکرد، شەوی واهەبووە تاکوو بیست ، سی ، چل گاپەل بەیەکەوە راوکراون.

٧-راوە کوێشکە: راوە چۆلەکە بەزۆر جۆر دەکرا:

یەکەم: لەکاتی بەفرکەوتن تەشـتێک یان تریانێکیان بەهۆی دارێکەوە بڵند دەکردو بەنێک یان پەتێکیان لەدارەکە قایم دەکرد، ژێرتەشـــتەکەیان تریـانەکیان گەنم پێوەردەکرد، لەشـــوێنێکیش خۆیـان حەشـــاردەدا، کاتێ کە چۆلەکە دەچوونە ژێر تەشـتەکە بۆخواردنی گەنم ، ئەوا پەتەکەیان رادەکێشا و کۆمەڵێک کوێشکە دەکەوتنە ژێری.

دووەم: داربەڕوو بەرێک دەردەکات وەکوو بلاروک وایەو دەنکی زەردەو ووردە، دووکـانەی پێـدەڵێن، دووکـانەیـان دەکولاند وەکوو سیکۆتینی لێدەهات لەسەر شوێنێک دایان دەنـاو هەندێ دانەوێڵەیـان لەدەوروبەری دووکـانەکە بڵاو دەکردەوە ئیـدی کە کێشـــکە بۆی دەچوو پێوەدەبوو و راویان دەکرد.

سـێیەم :شـوێنێکیان لەبەفر پاک دەکردەوە و هەندێ کاو دانەوێڵەیـان پێوەردەکردو دوایـان دادەنـاوە بەم کـارە کۆمەڵێک کێشکە راو دەکران.

٨-راوە گورگ: هەرچەندە ئێستا راوە گورگ باوی نەماوە، بەڵام کاتی خۆی راوی گورگ کراوە، لەبەر چەن هۆیەک ، لەبەر ئەوەی گورگ گیان لەبەرێکی دڕندەیەو بێبەزەیی یە، بۆیە دەڵێن بێبەزەیی یە چونکە ئەگەر بگاتە مێگەلێک رەحم بەهیچیان ناکا بەڵکوو ئەوەی بکەوێتە بن دەسـتی ئەوا دەیخنکێنی، وەکوو دڕندەکانی ترنیە تەنهـا یەکێک بگرێ و بیخوا، بەڵکوو گەلێک جار کۆمەڵێک بزن و مەڕی خنکاندوەو هیچیشـی نەخواردوون، هەروەها پێسـتەکەی کاتێک بەنرخ بوو، دوای خاراندنی دەکرایە دۆڵ، لەناوبردن و راوکردنی گورگ یان بەڕەوە سـەگ دەکرا یان بەتەڵە یاخود کوشتن و لەناوبردنی بەهۆی چەکەوە بووە.

٩ -راوی بزن و نێریە کێوی:سـەردەمێک چیاکانی سـەفین و هەورێ و شاخی سۆرو شۆڕەو کڵاو قاسم و ئاراسن و ماکۆک بزن و نێریە کێوی زۆری لێهەبوون، خەڵکیش هەژاربوو، بۆیە راوچیەکـان سـەرلەئێوارە یـان شـەو دەچوون، چەند راوچیەک بەیەکەوە لەشـوێنێک کە میلیان دادەناو خۆی دەشـاردەوەو کاتێک کەهەڵدەسـتان و نزیک

میلەکەدەبوونەوەراو دەکران، راوکردنی کێویش یــان بەچەکەوە بوو یـاخودتەڵەیـان دادەنـاوە یـان چـاڵێکیـان هەڵدەکەندکاتێک دەکەوتە نـاوی ئـاســـــتەم بوو بتوانێ بێتەدەرەوە، گەلێجارهەرســەرلەئێوارە گیسـکێک یان بزنە کێویەکیـان راو دەکردو نیوەی هەرئەو شــــەوە لە ئەشکەوتێک دەیان خواردو ئەیان برژاند، بەاینیش زوو کە ســـێرە دەبووەوە راوی خۆیان دەکردو گەلێک جاریش کارەکێویان بەدەســــــت دەگرت، وەکوو شـــــانازیەکیش بۆراوچی کە نێریە کێوی راو کردووە، قۆچی نێریە کێوی لە پێشەوەی خانوو لەدیوارا دەگرت.

بۆدۆزینەوەی بزنە کێوی راوچی پشـــــتی بە (شــــوێن پێ)دەبەســــــت، ئەویش یـان لەنـاو قوڕدا شــــوێن پێی هەڵدەگرت یان لەناو خۆڵ یان سەیرکردنی شکانی لەوەڕو گیـا کەپێیـدا رۆیشـــــتووە، وەکوو ئەڵێن(کوتەکی شکاندوە)واتە شوێن پێی بەوە هەڵدەگیرێ کە رێگای دیار بێ لەناو گیادا.

جـگەلەوەش چەنـدیـن راوی تـریـش دەکـران وەکـوو راوی(دەرەک و چرگ و ســیخوڕ و کوڕەبەشــە) ، ئەوانە گۆشـــتیان بەتـام بووەو بۆیە راوچی لەدوایـان بووەو کردوونی بەژەمێکی خۆش و بەلەزەت.

# کاروانچیەتی

دیارە کوردســـتان بەگشـــتی بە هۆی نەبوونی کارگەو دووری وڵاتەکەمـان لە دەریـا، وەنەبوونـی و هەژاری کەباڵی بەسەر ئەو نیشتمانەدا پەرت کردبوو، دانیشتوانی خۆشناوەتی و گوندنشینان بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانیان چەنـدین ڕێگـایـان هەڵبژاردبوو، یەکێـک لەو ڕێیـانە کـاروانچیەتی بوو، بۆیە هەمیشـــە لەدوای پەیـداکردن و کڕینی باشـــترین جۆری وڵاخ بوون، کامە ئێســـتری باش هەبوو و بۆکـاروانکردن شـــیـاوبوایە ، ئەوا بەکـاریـان دەهێنان ، بۆیە ئەوپەڕی خزمەتی ئێســـتر و لاخەکانیان دەکرد، کامە ئالیکی باش هەبوایە دەیاندایە وڵاخ، تەنانەت ئێســـتریان(قەشـــاوش) دەکرد، قەشـــاوش بریتی بوو لە بەکارهێنانی فرچەیەکی تۆزێک دڕ بۆ خوراندنی سەرپشت و تەنیشتەکانی وڵاخ، من لە بیرمە کەئەو ماڵانەی ئێستری باشـیان هەبوو ، کەبرنجیان دەشـووشـتەوە بۆ لێنان ئەو ئاوەی کە برنجەکەیان پێ دەدێم دەنا، ئاوەکەیان دەدایە ئێستر، ئەیانوت ئێستر بەهێز دەکات.

لەوەڕی باشـــیان بۆ پەیدا دەکردن و لە مێرگە پڕلە گیای خۆرای دەیان بەســـتنەوە، جۆری جۆی ڕەشـــی نایابیان

دەدانێ، (کورتـان و چـل و تەنگەو پـاروو و بن پـاروو) چاکیان بۆ دەکڕین.

من لام وایە مێژووی کـاروانکردن تـائێســـتـا دیـار نییە، چونکە لەوەتەی مرۆڤ بوونی هەیە ئەم کارەی کردووە، لە وڵاتی خۆشـــمـانـدا بەهەمـان شـــێوە کـاروانکردن مەودایەکـی دووروودرێژی هەیە و نـازانرێ لە کەیەوە کـاروانکردن دەســـتی پێ کردووە، ئەوەنـدە زانراوە لە خۆشناوەتی زیاترین کاروان کراوە و کاروانی خۆشناوان بەناوبانگ بووە.

ئێمە لێرەدا باســی کاروانچیەتی دەکەین و دەیکەینە چەند بەشێک:

١- بـازرگـانی: ئەمە بۆ هێنـانی کەلوپەلی بـازرگـانی وەکـوو (قـومـاش و کەلـوپەلـی خـواردن) لـێرەوە بە ڕێکەوتوون چەنـد مـانگێـک قـافلەی کـاروانـچیـان بەڕێکەوتوون بۆ وڵاتانی دوور، وەکوو(ئێران و شـــام و تورکیا...هتد) ، ئەم کارەش یان ئەوەتە بازرگانی ناوچەکە بووە یان لەگەڵ بازرگانێکی تر ڕێک کەوتوون بە کرێیەکی دیـاریکراو، ئەم کـاروانکردنە بەمـانگێـک یـان زیـاتری خایاندووە.

٢-    زیــارەتکردن: دوای موســــڵمــانبوونی کورد و قبوڵکردنی ئایینی پیرۆزی ئیســـــلام، وەبۆ جێبەجێکردنی فەریزەی حەج، چەند مـانگێک خۆیـان ئـامـادەکردووە و بەڕێکەوتوونە بۆ وڵاتی حیجـاز، لەبەر ئەوەی وەکوو ئێســـتا هۆیەکانی گواســـتنەوە نەبوون بۆیە بەکاروان بەڕێدەکەوتن و وەکوو دەگێڕنەوە و ئەڵێن، یەک ســـاڵی خایاندووە ئەم ســـەفەرە، واتا ســـاڵێکی رەبەق لەڕێگادا بـوونە بـۆ جـێبەجـێکـردنـی فەڕیـزەی حەج، هەروەهـا زیارەتکردنی مەرقەدی (غەوسی گەیلانی) لەبەغدا، ئەویش هەربەکـاروان چوونە و هـاتوونەتەوە، ئەویش مـاوەی مـانگێک یـان زیـاتری بردووە، خۆشـــناوەتی تەریقەتی نەقشـــبەندییان لازیاتر هەڵبژاردووە، هەرچەندە تەریقەتی قـادریش هەبووە، بەڵام زیـاترلەگەڵ شـــێخەکـانی بیـارە تێکەڵاوبوونە، ئەویش سالانە بەکاروان دەچوونە (بیارە)بۆ زیارەتی (شێخ علائەددین سراجەددین) ئەویش هەفتەیەک یان نیو مانگی پێچووە.

٣-    لەهەردوو جەنـگـی جـیـهــانـی یەکەم و دووەم مرۆڤایەتی بەگشـتی تووشـی برسـیەتی ناڕەحەتی بوونەو کوردیش لەو برســـیەتیە بەشـــی خۆی بەر کەوتووەو دووچــاری تێکچوونی بــاری گوزەران بوونە، هەروەک

(قـادر گۆزێ) لە بیرەوەریەکـانیـدا لەکتێبی (من و شـەقلاوە)دا دەڵێ: سـەرباری ئەو شـەڕ و ماڵوێرانیەی بەسـەر گەلاندا هات لەو سـەردەمەدا، وشـکە سـاڵیش سـەربارو بنبار، سـاڵی ١٩٣٩ وشـکە سـاڵی و برسـیەتی رووی لە ناوچەی خۆشـناوەتی کردووە، زۆربەی خەڵکی ئەوەی هەیـان بووە خواردوویـانە و، بـاری ئـابووریش رۆژدوای رۆژ بەرەو خراپی چووە، تاوای لێهاتووە نانی گەنم نەماوە و دەسـتیان کردووە بە خواردنی نانی جۆ، دیارە لەو سـاڵەدابووە کە کرۆسک و بەڕوویان هارپیوە و کردوویـانە بەنـان، دیـارە گەنـم و جۆ لەدەشـتی هەولێرنەماوەو نەبووە بۆیە خەڵکی خۆشناوەتی بەکاروان چوونەتە رۆژهەلاتی کوردسـتـان، چونکە لەوێ گەنم دەسـت کەوتووە، بەلام ئەوەی جێگەی ئومێدبووە سـاڵی پاشتر بارانی زۆرباریوەو زەوی تێرئاوبووە و لە دەشتی هەولێر هات بووە و گەنم پەیدا بووەتەوە، بۆیە ئەو سـاڵە واتـا سـاڵی ١٩٤٠ خەڵکی خۆشـنـاوەتی ئەوەی لە بەروبوومی کشـتوکاڵی هەیبووە، کۆی کردووەتەوە و لەولاخی نـاوەو بەرەو دەشـتی هەولێر بەکـاروان رۆیشـتوون ، (ترێ و هەرمێ و کرۆسک و خۆخ و هەنار و سێو)یان بردووەتە دەشتی هەولێر، لەوێ بەگەنم و جۆ

ئاڵوگۆڕیان کردووە، کاروانچییەکان بە دڵێکی خۆشـــەوە گەڕاونەتەوە ، بەم جۆرە جارێکی تر گەنم پەیدا بووەتەوە و ســاڵی پاشـتر چاندوویانەتەوە و لە قاتوقڕی رزگاریان بووە.

٤- کاتی خۆی لەزۆرشـوێن کەسـی دەوڵەمەند چەند کاروانچییەکی هەبوون، ئەوانەی چەند ئێستریکیان هەبوایە لای ئەو کەســە کاروانچیتی دەکرد، کاروانی پێدەکردن ، کاروانچییەکان هەرشـەش مانگ جارێک دەسـتە جلکێکیان بۆ دابین دەکرالەگەڵ جووتێک پێڵاو، چونکە کاروانکردن زۆربەی هەربە پێیـان بوو، رێگریش ئەو کـاتە زۆربوونە بۆیە کاروانچییەکان لەترسی رێگرەکان بەکۆمەڵ کاروانیان کردووە، هەندێ جاریش چەکیان پێبووە بۆبەرگری کردن، کـاروانکەرەکـان خەڵکـانی هەژاربوونەو هەمیشـــە قەرزاربوونەو پارەیان لەسەر قافڵەچی وەرگرتووە، گەلێک جاریش کاروانچی وولاخەکەی لەکاتی کارواندا لێدەفەوتا ، بۆیە لەبەرانبەردا ســەرقافڵەچی گەلێک جار وولاخی بۆ دەکرییەوە، ســـەرقـاڵەچیش خۆی وولاخی خۆی هەبوو لەگەڵ کاروانکەرەکاندا بووە.

٥- کاروانکردن بۆ رۆژهەلاتی کوردستان بەتایبەتی بۆ شــارەکانی مهاباد و نەغەدە کراوە، بۆ هێنانی (پێسـتی

گامێش) لەوێوە بۆ موسڵیان دەبرد، دیارە ئەوکاتە پێستی گامێش بەرەغبەت بووە و بازاڕی باش بووە و لە موسڵ، بۆیە ڕێگای چەند هەفتەیەکیان بڕیوە و گەلێک جاریش کاروانچییەکان تووشـــی کارەســـات بوونە و چەندینیان فەوتاون، هەروەها سەرقافڵەچی واهەبوو لە خۆشناوەتی پاییزان قافڵەی بردووەتە بناریِ حەسارۆست و لە گرتک و ڕۆست و ئەو ناوەیە هەرمێ و سێوی یەکجار زۆریان کڕیوە و بردوویەتیان بۆ موســـڵ و لەوێ ســـاغیان کردووەتەوە، گەلێک جاریش سێوەترشە و گەراز چونکە لەدەشتی هەولێر سالآنە نەخۆشی گرانەتا بڵاو دەبووە و نەخۆشی گرانەتاش حەزی لە شتی ترشە، بۆیە گەراز و سێوەترشەیەکی زۆر باردەکران دەبردرانە دەشتی هەولێر و بەگەنم ئالوگۆڕیان پێ دەکرا.

٦- کـاروانی توتن: لەوەرزی پـاییزدا دوای ئەوەی تووتن وشـــک دەبوو، ئینجا مشـــتەری دەچووە ســـەری دەیانکڕی، دوای داگرتنی تووتن لە گوشـــی داخســـۆر، کەوەستەی تایبەتی هەبوو، بەکاروان باردەکرا، کاروانچی بۆ ئەوەی ســـەرقافڵەچی تووتن یان (قاچاغچی تووتن) باری پێ باربکات دەبوایە بارەدارێک بۆقاچاغچی ببات، ئینجا تووتنەکەیـان باردەکرد و نـانی دوو هەفتەیـان بۆ

ئامادەدەکراو جگەلە (ئالیک) بۆ وڵاخەکە کە لە ســـەربارردا دەنرا، لەگەڵ هەندێ کەلوپەل، هەندێ کاروانچیش ئەگەر کەرێکی چاکی هەبوایە ئەوا بۆ ســـــواربوون دەیبرد ئەو وڵاخە (مێینەک)یـان پێ دەگوت، ئینجـا کـاروان بەڕێ دەکەوت، لە ســـاڵی پەنجاکانی ســـەدەی رابردوو تووتنی خۆشناوەتی بەکاروان چووەتە(موسڵ و تکریت و عانە و راوەو کوبی ســـات)، بەزۆری کاروانی تووتن لەترســـی پۆلیس بەشــــەو بەڕێدەکەوتن ، بەرۆژ پشـــوویان دەداو لەشوێنی دوورلەپۆلیس خۆیان دەشاردەوە، چونکە تووتن قەدەغە بوو زۆرجار لەلایەن پۆلیســـەوە دەگیران تووشـی دادگا و مســــادەرەی تووتنەکە دەبوون، جگەلەترســـی پۆلیس و گومرگ مەترســـی زێی بـادینـان و خـازریش بۆپەڕینەوە ، لەو پێناوەشدا زۆرجار ووڵاخ بەزێدا چووەو خنکاوە، هەروەها زۆرجاریش شەڕو هەراو تەقەی پۆلیس کاروانی لەیەک دابڕوەو لەم رووەوە چەندین کارەســـات روویداوە، گەلێک جاریش تووتنەکە کەوتووەتە دەســـت پۆلیس و قاچاغچی تووشـــی زەرەر کردووە، من لەبیرمە کاروانکردن بۆ موســـڵ لە خۆشــناوەتی تەنها دینار و نێوێکیان وەردەگرت، دواتر بووبە سێ دینار.

# نەخۆشی و چارەسەرکردن

جاران لەخۆشـــناوەتی بەهۆی نەبوونی نەخۆشـــخانە و دەرمانی پێویست، خەڵکی خۆشناوەتی بەگشتی پشتیان بە چارەسـەری سـرووشـتی و پیاوچاک و مەلاو سـەیدو ئەوەی خۆی قەنـاعەتی پێبووەو بەو دەرمـانەی کەخۆی دڵی ئـاوی خواردووەتەوە بەســـتبوو، هەروەهـا خەڵک بەگشـــتی جـاران بەهۆی مژوول بوون و مـاندووبوونی هەرلەبەیانیەوە تاکوو ئێوارە کەم نەخۆشـــی زەفەری پێ بردووە و هەمیشـە جموجۆڵی هەبووە، ئەمە وای کردووە کە نەخۆشـــی نەتوانێ تەنگی پێهەڵبچنێ، ئـاخر خواردن مەوادی حافیزە و ئێکســـپایەر نەبوون، ئەمە وای کردبوو کە بەردەوام تەندروســـت بێ، چونکە زۆربەی زۆری ئەو خواردنـانەی کەبەکاری دەهێنـان خۆمـاڵی بوون و خۆی بەرهەمی دەهێنان، ئەمە جگە لەوەی بەروبوومی ئاژەڵیش یارمەتی دەربووە و بۆ بەهێزبوونی چاو و ماسـولکەکانی لەشـــی، بۆیە دەمـان دیت پیـاوانی جـاران چەنـدە مـل ئەســـتوور و بەهێزبوون، بەهۆی کـارکردنی رۆژانە بەرەدەســـتیان وەکوو بەرد رەق و ئەســـتووربوون، ئەمە لەلایەک لەلایەکی تریش نەخۆشـــی وەکوو ئێســـتا زۆر

نەبوون و بڵاو نەبوون، بەڵکوو چەند نەخۆشییەکی سادە هەبوون ئەویش بەبەکارهێنانی دەرمانی کوردەواری و سەردانی مەلا و سەید و پیاوچاک و کردنی دوعا و نزاو نوشتەو حەمایل، نەخۆشی چارەسەرکردن لەخۆشناوەتی جاران لەسەر چەند بنەمایەک و چەند رێگایەک چارەسەر دەکران، ئێمە لێرەدا ئیشارەی پێدەدەین:

**-*دەرمانی دەستکردی خەڵکی شارەزا:**

لەم بوارەدا چەندین خەڵکی شارەزاو زیرەک هەبووە بۆ دروستکردنی دەرمانی دەستکرد، جا ئەو دەرمانانە چ لەبەروبوومی ئاژەڵیەوە دروستکرابن یان لەرووەکەوە بووبن، بۆ زۆر نەخۆشی وەکوو نەخۆشییەکانی (گەدە و هەناسەتەنگی و سەرئێشە و رشانەوە و کۆکە و هەلامەت و نەزۆکی و خورشت و چاوکول بوون و خێلی و گەربوون و ناوککەوتن و بنارگرتنی منداڵ و ددان ئێشە و سەرسووڕان و سەرمابوون و لاوازی و دڵنەچوون بۆخواردن..هتد).

بۆچارەسەری لاق هەڵاوسان و ران ئەستوور بوون ، هێلانەی بەردە کوڕەیان لەناو ئاوی گەرم خاو کردۆتەوەو دواتر لەسەر شوێنی هەڵاوسانەکەیان ناوەو بۆ ماوەیەکی کورت نەخۆشەکە چاک بۆتەوە، بەردە کوڕە باڵندەیەکی

بچووکەو لەچیـا دەڕژی بۆ دروســــتکردنی هێلانە کەلە شـاخدا دروسـتی دەکات، بنێشـتەتاڵ بەدەنووک هەڵدەگریَ لەبەردی دەدا، دواتر قوڕ دێنیَ و تێکەڵی دەکـات، ئینجـا هێلانە دروست دەکات.

بۆ چارەسەرکردنی (شەوتا) هانایان بۆ کەسێک دەبرد کە دووژنی هەبوون، شـــەو کابرای شـــەوتا گرتوو لەســـەر بانێک بانگی دەکردو ئەی ووت(بەشـەو دەگری تا ، بەرۆژ بەردەدا، مـاخۆی چـارچـاو جوابیَ وەدا) کـابرای خـاوەن دووژن لە مـــاڵـــی خـــۆی وەلامـــی دەدایەوەو ئەی گووت(مریشکەرەشـەی دەرمانە)، بۆیە دەبوایە مریشـکێکی رەشـــی بیَ نیشـــانەیان پەید کردبایەو ســـەریان بڕیبایەو دەرخواردی شـــەوتا گرتوویان بدابایە، ئەو کات خەڵ○ک سادەبوو بیروباوەڕیان وەهابوو.

بۆچارەســەری گەدە ئێشـان بنێشـتەتاڵیان بەکاردەهێنا، بۆ چـاو کولبوون کیفی مـار کە ســـــالانە فڕێی ئەدا کیفەکە دەردا بە چـــاو کولبوو و دەبوایە بیخواردبوایە، منـداڵ ئەگەر خێل بوایە ئەوا دەیان بردە لای کەســـانی شـــارەزا ئەویش پـێی دەووتـن کەبـایەنـیەک بـیـهـێـنـن بەپەنـجە شـــوێنێکیان لەنـاو دەمی منداڵەکە بەپەنجە ئەزیەت دەدا بۆماوەی دووڕۆژ یان ســـیَ رۆژ ئەوا خێلیەکەی نەدەما،

وەئەگەر منداڵێک (زیرپەی)بگرتبایە واتا زۆر گریابایە ، قەســـنی یان هەزوایـان دەدایێ کەزۆر تـاڵ بوو، ئیدی گریـانەکەی دەوەســـتـا، هەروەهـا ئەو منـداڵانەی کە نەخۆشـــی(مانگ و بۆن)یان دەگرت، کەســـانی شـــارەزا هەبوون بۆ ئەم نەخۆشـیە و چارەســەری پێویسـتیان پێ دەدان و چاک دەبوونەوە.

ئەوانەی مار پێوەیان دەدا شــوێنی پێوەدانەکەیان بریندار دەکرد، ئینجا پارچە گۆشـــتێکیان لەناو دەو دەگرت و بە کەڵەشـــاخ خوێنە ژەهراوییەکەیـان دەمژی ، بۆ چەنـد رۆژێک شـیریان پێدەدا تاکوو مارپێوەداوەکە دەرشـایەوە، ئەگەر کەسێک(کولک یان سۆی) لێهاتبا، ئەوا (دووکانە)یان دەکولاند تاکوو وەکوو سیکۆتینی لێ دەهات، ئینجا لەسەر کولکەکەیـان دادەنـا تـامـاوەیەک، ئەو دوکـانە کولکەکەی دەتەقاند و پاش ماوەیەک چاک دەبووەوە، بۆچارەســـەر (قورپـاقە) کەجۆرێـک بوو لە کۆکە، هەنـدێ بیبەری کوتراویـان دەخســـتە ســـەر پەنجەو لەنـاو گەرووی نەخۆشـەکە لەسـەر گرێیەکەی ناو دەمیان دەناو گرێکەیان دەتەقـانـد، بۆ راگرتنی خوێنی نـاو دەمیش ، خوێراوک دەدرایە نەخۆشەکە بۆ ئەوەی غەرغەرەی پێبکا، بۆ هەموو نەخۆشیەک پزیشکی میللی پشتیان بە دەرمانی سروشتی

دەبەســـت، ئەو دەرمـانـانە لەگیـا کوێســـتـانیەکـان و بەرووبوومی ئاژەڵ دروســـت دەکران، ئەم چارەســـەرانە ســـەدەیەک بەر لە ئێســـتا پەیڕەوی کراوە لەخۆشـناوەتی کەچی تازەبەتازە دەبینین ئێســـتا دەرمانخانە و پزیشـکی میللی لەبرەو دایەو لەشـــارەکانی کوردســـتان بەدەیان دەرمانخانەی گیایی و سروشـتی بەدی دەکرێن، خەڵکێکی زۆر بەدوای دەرمانی سروشتی دەگەڕێن.

لەبورای چارەسـەرکردنی نەخۆش لەخۆشـناوەتی چەندین کەس وەکوو پزیشـکی میللی ناویان بەنەمری ماوەتەوە لە هەردوو رەگەزی نێرو مێ، هەردەم باسـیان دەکرێ ناوی دەرمـانەکـانیش مـاوەتەوە، بۆ ئەوەی نـاویـان ون نەبێ پێویســـتە تۆماربکەینەوە، ئەو پزیشـــکە میللیانەش بریتی بوون لە(فاتیمەی بەیتاری شــــەقڵاوەو هەردوو کوڕەکانی قادر وەســـمان و حمدامین وەســـمان، حاجی صـــادقی شـەقڵاوە، ئێلیا رەقۆو دەنحا شـوان و حمدامین کوێستانی و حەمەد گۆڕەشێری و حەمەدی حەیشە کەڕێ و ئاغەژنی توتمەو شـێخزادە ئایشـی کچی شـێخ کاکەمینی ســـەران لەتوتمەو هەمینە دەسـت رەنگین و حاجی حسـینی بێکێڵێ و مەلا عبـداللەی زێوەی و حمـد خەلیفەی هەرتەلی و پوورە ئایشـــە تســـکە و هەمینێ مام حەســـەنی و خدرە

گەورەو ئۆمەرە خێل و پلکە ئەســتی و حەمەدی خدر ئەندێکی و مەلا عەولای بێتواتی و مســـتەفا هەرمکی و ئایشــێ شــیرێ و پوورە ســـەروەرێ بەڕۆژەی و حاجی فاتمێ بالیســانێ و هەمینەخانێ خەتێ و عەولا پزیشــکی فریزی و مام قادری زیارەتی و خدرەسـۆری ئەنگۆزی و هەمینە چاوشینێ بێراوێ و زێنەبێ قادری عەیشێ توتمێ و پلکەهەیبەتێ شــێخ وەســـانی و پوورە فاتمێ وەرێ و خدری دارکەرو رەزای مام وەیســـی و حەیشـــە بســـک درێژو فاتمە پسان و هەمینە لەلەو عەلی مام دەروێشی و حەمەشـوان و حاجی حسـێنی شـێخ وەسـانی)، دەیانی تر ئەم وەســـتاو بەیتار و پزیشــکە میللیانەی کە هەریەکەیان شــارەزاییان لەبوارێکدا هەبووە، ناویان بەنەمری لەهزر و بیر و مێشـکی خەڵکیدا ماونەتەوە و لەکۆڕ و مەدریســاندا بەچاکە باس دەکرێن، بەدەیانیش بێئەوەی ناویان بهێنرێ ناویان بە ونی مایەوە و نەتوانرا تیشک بخرێتە سـەر ئەو کارانەی کە کردوویانە.

# نووشتە و دوعا و حەمایل:

بەهۆی پتەوی باوەڕ بە پیرۆزیەکانی ئاینی ئیســـلام ، وەقەناعەتکردن بە مەلا و سەیدو شێخ و پیاوچاک، خەڵکی خۆشناوەتی بۆ زۆر جۆر لەنەخۆشی پەنایان بردۆتە بەر نووشـــتەو دوعـاو قورئـان لەگوێ خوێنـدن و تفەڕک و کشـــتەک، ئەم قەنـاعەتە نەگۆڕە وای لەدەروونی خەڵک کردووە کـاتێـک تووشـــی هەرنەخۆشـــیەک دەبوون، ســـەردانیی کەســـانی پایەبەرزیان دەکردو بەو دوعاو نـووشـــتەو تـفەڕکەی کەوەریـان گـرتـووە، لەلایەنـی دەروونـیەوە ئـاســـوودەیـیەکـی لەرادده بەدەریـان وەرگرتووەو ئـارامیەکی دەروونی رووی تێکردوون ، ئەمەوای کردووە ببێتە دەواو شـیفا بۆنەخۆشـەکە، زۆر کەس بەهـۆی ئەو قەنـاعەتەوە کـاریگەری لەدەروونی نەخۆشـــەکە کردووەو چاک بۆتەوە، چارەســـەر لەلایەن بنەماڵەی شـێخەکان بۆنەخۆش بریتی بوون لە (کشـتەک کەپارچە پەڕۆیەک بوو هەنـدێ دووعـاو نزای لەســـەر دەخوێنـدراو لەدەســـتی نەخۆشـــەکە دەکرا، دووعـا راســتەوخۆ لەلایەن شـێخ و مەلاو پیاوچاک و ســەیدەوە دەکراو، نووشـــتە دوای ئەوەی بەســـێ گۆشـــەیی

دەنووشترایەوەو لەپەڕۆیەکی سەوز دەپێچرایەوەو لەسەر شان یان پیل یان سەری نەخۆشەکە قایم دەکرا، حەمایل گەورەتر بوو لەنووشتە شێوەی لاکێشەیی بوو لەپەڕۆ یان پێستە قایم دەکراو بەپەتێکەوە لەبەر دەکرا، ئەم نووشتەو دوعاو حەمایلە شێخەکانی (بالیسان و باقلان و زیخان و سوورسوورە و تاراوەو سەران و شەقلاوە و هیران و سیساوە و سەیدەکانی زێوە و هەرتەل و سێنان و سەروچاوە) ئەنجام دەدرا، عەزیمەت بریتی بوو لە جامێکی ماددەی سفر هەندێ ئاوی تێدەکراو دوای خوێندنی چەند ئایەت و نزایەک بەسەر سەری نەخۆشەکە دەکراو هەرزوو چاک دەبووەوە، عەزیمەت گرتنەوە کارێکی ئاسان نەبوو بەکەم کەس دەکرا، چونکە وێردو دووعای گەلێک زۆری تیادابوو، هەروەها ئەو شێخەی کە عەزیمەتی دەگرتەوە نابوایە هیچ کەسێکی خۆی لەنزیک بوایە ، چونکە ئەوەندە تێکەڵی جیهانی جنۆکە دەبوو کاریگەری لەسەر خێزانی شێخەکە دروست دەکرد منداڵ و نەوەی شێخەکە دەمردن، عەزیمەت گرتنەوە بۆ کەسانی شێت و هار دەکرا، بالاپۆش بریتی بوو لە خوێندنی چەند وێردێک بەقەدەر کراسی ئەو ژنەی کە منداڵ راناگرێ، ئەویش بریتی بوو لە نووسینی دوعاو نزا لە کاغەز

بەقەدەر کـراســـێـک و دواتــر هەڵـگـرتـنـی ئەو بـاڵاپۆشــیە)بـاڵاپۆشـــی و عەزیمەت گرتنەوە لەلایەن شێخەکانی باقلان و شێخەکانی سەران ئەنجام دەدرا.

ئەم کارە ترســناک بوو ئەو شــێخەی ئەم کارەی دەکرد دەبوایە هەموو ئـامـادەییەکی هەبوایە بۆبەرگرتن لەهەر نســیبەتێک کەبەهۆی ئەم باڵا پۆشــیەوە ئەنجامی دەدا، چونکە ئەو جنانەی لەلەشــی نەخۆشــەکەبوو بەهۆی ئەم باڵا پۆشیە لەناو دەچوون، بۆیە جنەکان بەدوای فرسەتێک دەگەڕان بۆتۆڵە کردنەوە لەو شــێخە ئینجا بە شــێتکردنی منداڵەکانی بوایە یان بە لەناو بردنی منداڵەکانی ، ئەم کارە شــێخەکانی ســەران ئەنجام دەدا ، یەکێک لەو بنەماڵانە منـداڵەکـانیـان هەموویـان نـاتەواو بوون ئەیـانوت بەهۆی باڵاپۆشیەوە بووە.

یەکێکی تر لە چارەســەرەکانی شــێخەکان و بنەمـاڵە پیرۆزەکـان بریتی بوو لە (عەبـا) بریتی بوو لە عەبـایەکی ئاســایی، چەند دوعا و نزاز ئایەتی لەســەر دەخوێندراو ئیدی ئەو عەبایە پیرۆز بوو، هەر کەسێک کە نەساغ بوایە ئەچوو ئەو عەبـایەی مـاوەیەک لەبەر دەکرد تـاکوو چـاک دەبووەوە، ئەو عەبایە هەم شێخەکانی (سەران و بنەماڵەی مەلازادەی بالیســان و شــێخەکانی زیخان و شــێخەکانی

ســوورســوورە)، ئەوەی جێگەی باســکردنە هەموو ئەو بنەماڵە شــێخانەی باســمانکردن ســەربە شــێخەکانی هەورامان بوون و ساڵانە سەردانی بیارەیان دەکرد.

## سەردانی پیاوچاک و مەرقەد:

بەهۆی بیروباوەڕی بەهێز بەگۆڕی پیاو چاکەکان خەڵکی نەخۆش سـەردانی مەرقەدی ئەو پیاو چاکانەیان دەکرد و ئەوەنـدە بیروبـاوەڕەکە داچەقیوبوو بوو لەدەروونی خەڵکدا، بۆیە کە دەچوونە سـەردانی مەرقەدەکان هەریەکە بۆ مرازێک بۆ نەخۆشـــییەک ، کاریگەری لێ دەکردن و پاش ماوەیەک چاک دەبوونەوە و بووبووە دابونەریتێک، رەگی داکوتـابوو بەجۆرێـک هەرپیـاو چـاکێـک مەرقەدو گۆڕســــتانێک بۆ جۆرێک نەخۆشـــیان بەکاردەهێنان و شێوازی سەردانی هەریەکێکیش جیا بوو بەم شێوەیە:

-*پیاوچاکی واهەبوو کە هیچ ئاســەواری گۆڕی لێنەبوو بەڵکوو بریتی بوو تەنها لە داربەڕوویەکی گەورە، ئەوانەی تاو و لەرزیان دەگرت هەندێ گەنم یان هەر دانەوێڵەیەک بوایە لەدەوروبەری دارەکە بڵاویان دەکردەوە، چۆلەکە و باڵنـدە دانەوێڵەکەیـان دەخوارد، ئەم کـارە دەبووە هۆی چاک بوونەوە لەتاو و لەرز.

-*شـــوێنی واهەبوو کەتەنها بریتی بوو لەکانیەک ، ئەو کـانیە ئەوەنـدە بەپیرۆز دادەنرا، ئەویش بە خواردنەوەی ئاوەکە دەبووە شیفا و نەخۆشەکە چاک دەبووەوە.

-*ئەگەر یەکێک تای سێبەڕۆ گرانەتای بگرتایە ، زۆربەی گوندەکان چاکی وایان هەبوو کەدەچوونە ســـەری تەنها

نانێک و سەلکێک پیوازیان لەسەر چاکەکە دادەنا ، شوان ، گاوان ، ڕێبوار، دارکەر..هتد ئەوەی بەسەر نانەکە هەربوایە دەی خوارد، دەبووە هۆی چاک بوونەوە.

-*هەندێ مەرقەد هەبوون لەخۆشناوەتی کە دەچوونە سەری دەبوایە بزنێک یان مەڕێک یان گیسکێک ، لەسەر مەرقەدەکە سەرببڕن و لەوێوە گۆشتەکەیان دەکردە خێر.

-*هەندێ گۆڕ هەبوون تەنها خۆڵەکەیان دەبردەوەماڵەوەو وەکوو تفەڕک تەڕیان دەکردو لەشوێنی ئازارەکە یان پێ چەور دەکرد.

-*پاو چاک و گۆڕی واهەبوو بۆمراز خواستن دەچوونە سەری و بەردێکی پانیان بەکێلەکەوەدەنا، ئەگەر بەردەکە بە کێلەکە وەنووسابایە ئەوا نیشانەی هاتنەدی مرازەکەیان بوو، ئەگەر نەشی گرتبایە ئەوا نیشانەی بەد بەختی بوو.

-*لەزۆربەی گوندەکان مەرقەدی سەید هەیە، لەکاتی نەبارینی باراندا پیاوێکی بەدین دەچوو، ئەو ئاڵایە سەوزەیەی سەرمەرقەدەکەی دەبرد و لەناو کانی گوندی وەردەداو تەڕی دەکرد، یان دەچوون کێلەکەیان هەردەدایە ناو کانی...

-*هەندێ مەرقەدوپیاوچاک هەن لەخۆشناوەتی ، ئەوانەی شێت و کەم ئەقڵ بوون دەیان بردنە سەر ئەو مەرقەدانە، لەوێ دەبوایە شێت یان کەم ئەقڵ کەمێک

لەســــەر گۆڕەکە خەوی لێکەوتبایەو پیاو چاکەکە دەهاتە خەونی، ئەگەر بهاتبایە خەونی ئەوا نەخۆشـــەکە چاک دەبووەوە.

بەنــاوبــانگترین پیــاو چــاک قو مەرقەدەپیرۆزەکــانی خۆشناوەتی بریتی بوون لە:

شــێخ ئۆمەر لەگوندی خەتێ، شــێخ مەلا حســن و شــێخ نورالدین و شــێخ تەها لەتوتمە، چاکی بەدری لەبالیســان ، شێخ مستەفای کۆخان، شێخ تەهای سوورسوورە، شێخ بۆکری لە شــێخ مەموودیان، مەرقەدی کاکی ســیســاوە، شێخ باوەدین لە شێخ وەسانان، شێخ تەلح لە زێوە، شێخ پیرس لە ئەنگۆز، چاکی بەکەچەپەڕۆ لە بێکێڵ، شــێخی زەنگەڵێ نان و زینی هەرتەل و مەلا سمایل و چاکی تایێ و داری مشــەڵ لەهەرتەل، چاکی گەورە و ســۆفی خدری لە گوندی وەرێ، شــێخ وســوورەحمانی شــەقڵاوەو دارێ بــالووکــان لەحوجران و گۆڕی مەلازادان لە زیــارەتی مەلازادان، مەرقەدی شــێخ محمدی بەرگەڵی لە خوارووی کونەفلووسە، مەرقەدی کاکی سیساوە و مەرقەدی خدری شەمزینان لەبێتواتە و گۆڕێ ئەسحابان لە دۆڵی سماقولی و....هتد.

# ددانئێشە و شکاند

بۆ چارەسـەری ددان ئێشـان هەندێ چارەسـەری سـادە و سەرەتایی ئەنجام دەدران وەکوو:

بۆچارەســەری ددان ئێشــان ئەگەر ددانەکە کلۆربایە ئەوا (قەنەفر)لەنـاو کلۆریـایی ددان دادەنرا تـاکوو ئـازارەکەی دەشکا، یان ئەگەر ئازارەکەی نەشکابایە ئەوا بە داغکردن ئازارەکەیـان دەشـــکاند ، کە بریتی بوو لە گەرمکردنی ســووژن بەشــێوەیەک کە ســووژنەکە ســووربیتەوەو لەســەر ددانەکەیان دادەناو تاکوو داغ دەبوو و ئازارەکەی نەدەما، یان داری ووشــکی گوێزیان لەســەر ئاگردادەنا تاکوو ئەو کەف و ئاوەی تیایدایە دەهاتە دەرەوە لەســەر ددانەکەیان دادەنا، ئەوا ئازارەکەی دەشــکا، ئەگەر هەر ددانەکە ئازاری نەشــکابایە ئەوا لە زۆربەی گوندەکان کەسـانی شـارەزا هەبوون بۆ هەڵکێشـانی ددانەکە، کەبەبێ بەنج و سڕکردن یەکسەر بە (کەلبەتێن) دادنەکەی دەکێشا، لەم بوارەدا کەســـانی زۆربلیمەت هەبوون وەکوو(حاجی محمدی برایمەکۆری بێڕۆ و حەسـەنی مستەفابەگی تونمە و ئەحمەدی یوسفی کامەلا و شەماشە بنیامین و حەمەدی حەیشـەکەڕێ لە شـەقڵاوەو کەریمی مام عەلی هەرتەلی و

مــام حەمەدی وەرێ و مــام وەســـــمــانی کێشـــکەو حەمەدەبۆزی ســماقوڵی و مام مســتەفای مەلەکان و مام برایمی ســـکتان و حمدامینی هیرانی و وەســــتا قادری پیرمامی و چەندانی تر.

لەبواری شکستیدا گوندەکانی خۆشناوەتی پێشەنگ بووە لە کاری بەیتاری و هەربەســـتنەوەی شـــکاندا، بەهۆی سروشتی خۆشناوەتی کەبریتیە لەشاخ و کێو و هەڵدێر، خەڵک بۆ کاری رۆژانەیان زیاتر لەناوچەکانی تر تووشــی هەڵدێران و بەربوونەو و شــکان دەبوون، بۆیە وەســتاو بەیتاری کارامە لەخۆشـناوەتیدا هەبوون، هەروەک دکتۆر کەریم هەرتەلی لەگۆڤاری خۆشناوەتی ئاماژە بەکەسێکی دەســـــترەنگین لەو بوارەدا دەکات و ئەڵێ: (حاجی عەلی مەلابرایمی هەرتەلی ) وەســـتاو بەیتارێکی بەناوبانگ و دەســـــت رەنگین و بەســــەلیقەو لێزان بووەو لەهەموو کوردستان خەڵک سەردانیان کردووە و هەرشکستێکیش لەلای پزیشـــک و نوژداری تایبەتی شـــکســـــت چاک نەبووبایەوە ئەوا ئەیانبردە لای ئەو، هەروەها دکتۆرکەریم هەرتەلی هەندێ ناوی تری هێناوە کەوەســـــتاو بەیتاری بــاش بوونە کەبریتین لە(برایمــاغەی ئەنگۆزی و مــام حەمەدی بێتواتەو حەمەدی حەســــەنی وەرێ و مــام

حەســــەنی زێوەو مـام عەولای هەرمـک و مـام خـدری شـیرەووەسـتابرایمی هیران و و مەلاخدری فریزی و کاک برایمیمـامەجەلکەو عەولاحەســــەنی چیوەو مـام قـادری ئەسـپینداریَ و سـابیری مەلەکان و مەلابرایمی هەرتەلی و مام عوزێرو مام زیادی زێوەو وەمەرپاشـــای هەرتەل و مام رەحمانی ئەندێکی) و هەمینەگردی توتمەو حەمەدبەگ و خارفەقیَ حمەدی شێخ وەسانی.

# چارەسەری برین‌دار

لەم بوارەشدا خەڵکی خۆشناوەتی بۆ چارەسەری برین پشتیان بە چارەسەری سروشتی بەستووە و چەندین کەسی شارەزا لەم بوارەدا بەدی دەکرێن، کە لەدەرمانی کوردەواری جێدەستیان دیارە وەکوو(شێخ زادەو ئاغەژنی توتمەو خارفەقێ ئەحمەدی شێخ وەسانی و حاجی صادقی شەقڵاوەو پوورئایشێ بێناتانی و سۆفی رەسوڵی هەرتەلی و پوورهەمینی بەرەکەیی پلکەئامینەی چیوە و چەندانی کەسی تر).

بۆ چارەسەری برینی قووڵ بەتایبتی برینی خەنجەر حەوت دەرمانیان بەکاردەهێنا کەتەنها بۆیەک جاربەکاردەهات و پاش ماوەیەکی کەم چاک بوونەتەوە و هەڵساونەتەوە سەرپێ، حەوت دەرمان لەشوێنێک بۆ شوێنێکی تر جیاوازی هەبووە، بەڵام لەشێوەی دروستکردنی یەک شێوەبووە تەنها لەپێکهاتەی دەرمانەکە جیاوازییەکی کەم هەبووە، چۆنیەتی دروستکردنی حەوت دەرمان بەم شێوەیە بووەو ئەم پێکهاتانەی تیادابووە:

١-پاشماوەی دووکەڵ.

٢-رەشەبی.

٣ -مێکووک.

٤ -پنجەبۆر، جۆرێکە لەگیا.

٥-پەلکەدراو.

٦-پەلک (گەڵا)ی دارەبەن.

٧-خوێ.

ئەم حەوت دەرمـــانەیـــان تێکەڵ یەکتر دەکردو لەنـــاو مەنجەڵێـک دەیـان کوڵانـد، تـامـاوەیەکی زۆر لەســــەر ئـاگردەمـایەوە، دوای ئەوەی کەبەباشــــی دەکوڵا، ئینجـا سەلەیەکی داریان لەسەر مەنجەڵێکی تردا دادەنا و پێکهاتە کوڵاوەکەیان بەهۆی ســــەلەکەوە دەپاڵزنی و ئاوەێافەکە دەکەوتە ناو مەنجەڵەکە، پاشـان ئاوەکەیان لەسـەر ئاگردا دادەناوەو تاکوو ماوەیەکی زۆر لەســەر ئاگردا دەمایەوە، تـاکوو وەکوو ســــرکەو دۆشـــــاو چڕ دەبووەوە، لەناو دیزەیەک یان قاپێکی خاوێنیان دەکردوبۆبرین ســــازی ئامادەدەکرا.

چۆنیەتی بەکارهێنانیشــی هەندێک لەو دەرمانە لەناو برینە قووڵەکە دەکرا، بۆبرینی تفەنگ و زۆر قووڵتریش بەفتیلە دەرمـــانەکەیـــان لەنـــاو برینەکە دەکرد و بۆیەک جـــار بەکاردەهات پاش ماوەیەک برینەکە ساڕێژ دەبوو.

بۆ دروستکردنی حەوت دەرمان زۆر کەس شارەزابووەو ناویان بەنەمری ماوەتەوە بەتایبەتی (خارفەقێ حمەدی شێخوەسانی و حاجی صادقی شەقڵاوەو حەلیم خانی ئاغەژنی توتمە) و چەندانی تر.

ئەمە لەلایەک لەلایەکی تر جاران لەبەر ئەوەی هاتووچۆکردن و کاروانکردن و سەفەرکردن تەنها بە وڵاخ بوو بۆیە گەلێک جار لە رێگا سەخت و لەئەنجامی سەرەرۆیی وڵاخەکە خەڵک بەربوونەتەوە و لەشیان گواوە یان لێیان دراوەو لەشیان ئەزیەتی زۆریان پێگەیشتووە، بۆچارەسەرکردنی ئەم حاڵەتانە خەڵک پشتیان بەکەسانی شارەزا لەو بوراەدا بەستووە، لەم بوارەشدا کەسانی شارەزا هەبوونە وەکوو (مەلا ئەحمەدی کەشخەی سماقوڵی) وەستاو شارەزاو لێهاتوو بووەو لەرێگای چەند دەرمانێک توانیویەتی چارەسەری گونجا دابنێ ، وەکوو لەپێستگرتن کەبریتی بوو پێستی ئاژەڵی لە لەشی پێچاوەو تاماوەیەک ، لەخۆشناوەتی ئەڵێن (ئەوەهندەیان لێدا بوو لە پیستانیان گرتووە).

هەروەها گیای(رووکێش) کە لەنزیک رووبار و شوێنی تەڕدا دەڕوێ، لەگەڵ جەفت و گروان و خڕنووک و ریخۆڵەی گیانداران بەکارهێناوە.

ئەمەش ناوی ئەو گیایانەیە کەلە خۆشـــناوەتی دەڕوێن و بۆ بەکارهێنان وەکوو دەرمان بەکاریان هێناون:
کوزەرە، خەرتەلە، کروک حاجیلە، کروک ماســـت، جاترە، گیابەند، خاو، تەڕەبەن، گوێنی، ئەستریلک، پیفۆک، سالمە، رووکێش، مووکێش، گەزگەزۆک، قەســـکوان، پرپێنە، گیادەراو، ناوکەشـوان، گێزەری کیوی، سـۆریازە، گوونە سۆرە، مێلاق، شلێر، کاردی شاخی، کاردی قوڕێ، کاردی ریشۆری، کاردی ریخێ، کەنگر، سێبسکۆرە، کنێرەکیویلکە، کرووک فەقێ، وێنجە، هەندرێشە، کرووک نیسان، کرووک بووکۆرە، گیاپەنوور، گورەروون، ناوکە کەنگر، ســـتریە شەکرۆکە، باڕێزە.
جاران بەم شێوەیە هەندێ نەخۆش چارەسەر دەکران:
-*ئەگەر منداڵێک نەخۆش بایە و کەســـوکاری منداڵەکە پێیان وابوو کەچاو و زار لێیداوە، وەئەو کەســـەشـــیان ناســـیبایە کە چاو پیســـەو چاوزاری لەو منداڵە داوە، ئەوا بە نهێنی یەکێکیان رادەسـپارد کەبچێ پرچی ئەو کەســـە ببڕێ ، یان (ناوپیســـتێری) شـــروار یان کراســـی کەســـە چاوپیســـەکە ببڕێ ، پاشـان دەیان سـووتاندن، لایان وابوو بەم کارە چاو و زارەکە لەسەر منداڵەکە لادەچێ.

-*جاران ئەگەر یەکێک ددانی ئازاری هەبوایە، ئەوا چەند چارەســەرێک هەبوون، وەکوو دەچوونە لای مەلای گوند بۆ نووسـینی دوعا، ئەویش وشـەی(یاسمعلون)ی لەپارچە کاغەزێک دەنووسـی و پێی دەوت بەبزمار لەدیواری بدەن و بەمەرجێک نووکی بزمارەکە لەســەر یەکێک لە پیتەکان دابنێن ، یـان ئەگەر ددانەکە کلۆر بـایە، ئەوا قەنەفر یـان کیســـی ســـووتاوی لۆکســـیان لەســـەر دادەنا، یان بە درێشـــەیەک داغیـان دەکرد، یـان رۆنی کـاکڵە گوێزیـان لەســـەر دادەنـا ، ئەگەر هەر چـاکیش نەبوایە ئەوا بەبێ بەنجی بە (کەلبەتێن) هەڵیان دەکێشا.

-*ئەگەر منـداڵێک درەنـگ فێرە قســـەکردن بوایە، ئەوا یەکێک لە کەســـوکاری منداڵەکە لەکاتی نـان خواردندا ، دەچووە ماڵێک و لەناکاو و لە هیکڕا پارووەنانی لەدەســتی خـاوەن مـاڵ دەرفـانـدو دەیبردەوە مـاڵەوەو دەرخواردی منداڵەکەی دەدا، پێیان وابوو بەم کارە منداڵەکە وەقسەدێ، پارووی دەمی هەموو کەســێکیش نەدەبوو، بەڵکوو چەند کەسێک(ودم)یان هەبوو.

-*ئەگەر منداڵێک درەنگ بەسـەر پێیان بکەوتایە و درەنگ رۆیشـــتبا، ئەوا رۆژی هەینی، بەبەنێـک هەردوو پێیـان دەبەســـتن و لەپێش مزگەوتیان دادەناو مقەســـێک یان

چەقۆیەکیان لەتەنیشـــت منداڵەکە دادەنا، کێ یەکەم کەس کەلەمزگەوت دەهـاتە دەرەوە دەبوایە بەنەکە ببڕێ، گوایە بەمکـارە منـداڵەکە لەترســـی ئەو قەرەبـاڵغیەی مزگەوت بترسێ و تەکانێک بداتە خۆی و هەڵبستێتە سـەر پێ، یان چوار کەس لەخوارەوە بەتـانیەکیـان دەگرتەوەو یەکێک لەســـەر بان منداڵەکەی فڕی دەدایە خوارەوە و دەکەوتە ناو بەتانیەکە، گوایە دوای ئەم دوو کارە منداڵەکە بەســـەر پێیان دەکەوێ و دەڕوا.

-*ئەگەر منـداڵێـک دەمی کول بـایە، ئەوا عـادەت بوو منـداڵێکی ئەو مـاڵە، هەنـدێ ئـاردی لە قـاپێـک دەکردو دەچووە حەوت ماڵ، بێ ئەوەی هیچ بڵێ، ئەو ماڵانە دەیان زانی بۆچی هـاتووە، ئیدی هەرمـاڵەو هەندێ ئاردی لەنـاو قـاپەکە دەکردو منـداڵەکە دەگەڕایەوە مـاڵ، ئـاردەکەیـان دەکردە هەویرو گوتکیان لێدروســـت دەکردو دەیانکردە ئەســـتوورکو هەربەهەویری لە دیواریـــان دەرگـــایـــان ئەســـتووندەی ناوماڵیان دەدا، تاکوو هەویرەکە ووشـــک دەبوو، ئینجا دەوکولیەکەش نەدەما.

-*ئەگەر یەکێک (بـاپشـــکێوە)ی لەچـاو هـاتبا، دەچوون هەنـدێ (کل)یـان لەچـاوە ســـاغەکە دەکرد، ئەیـان گۆت

بۆئەوەی ئەو چاوەی باپشــــکێوەی لێهاتووە لەخەفەتان بتەقی.

-*ئەگەر منداڵێک (زیپکە)ی لەدەم و روو هـاتبـایە، ئەوا ژنێک یان پیاوێک، کەمنداڵیان بەســـووتان مردبوو، هەندێ ترشـاوی سـماقی لەدەمی دەکردودەیپرژاندە دەمووچاوی منداڵە تووش بووەکە، ئەم کارەش تەنها بەیانیان دەکرا، کاتەکانە تر شیاو نەبوون.

-*ئەگەر یەکێک (بالووکە)ی لێهاتبایە، ئەوا بۆ چارەســـەر چەند رێگایەک دەگیرایە بەر وەکوو:

دەچوون لەو شــوێنەی داری(کفری) لێهەبوو، قەدێکی دار کفرەکەیـان بـادەدەاو بەردێکیـان لەســــەر دادەنـا، تـاکوو ووشـــــک دەبوو، لەگەڵ ووشـــــک بوونی دارکفرەکە بـالـووکەکەش نەدەمـا، یـان دەچـوونە لای ئەوانەی ی(ودم)یـان هەبوو، بۆلێبڕین ئەویش بریتی بوو لە لە خوێنـدنی چەنـد ئـایەتێکی قورئـان، و چەنـد دوعـایەک، لەدەنکە جۆیەک و ســــەرو بنی دەنکە جۆیەکەیان دەبڕی بۆ ئەوەی شـــین نەبێتەوەو ئینجـا لەژێر عـاردیـان دادەناتاکوو دەنکە جۆیەکە دەڕزی، لەگەڵیشــــیدا بالووکە بەرەبەرە دەڕزی و لەنــاو دەچـــوو، یـــان لەگوندی(حوجران)گۆڕســتانێک هەیە، لەســەر رێگا یەکێک

لەدارەکان تایبەت بوو بەبالووکە، دەبوایە یەکێک بچێتە سەر دارەکە و بەنیەتی چاک بوونەوەی فلانەکەس لەبالووکە و قەدێکی بچووکی دارەکەی شکاندبا، بەمەرجێک قەدە دارەکە لێ نەبووبایەوەو هەربەدارەکەوە مابایەوەونابوایە ئەو کەسە ئاوڕ لەدارەکە بداتەوە دوای ووشک بوونی قەدە دارەکە بالووکەکەش نەدەما.

-*ئەگەر یەکێک (کەوان)یان(قونێر)ی لێهاتبایە، ئەوا چەند دەرمانێکیان بۆ ئامادە دەکرد، لەسەر کەوانەکەیان دادەناو چەند شەوێک دواترکەوانەکە دەتەقی، دەرمانەکانیش بریتی بوون لە:

١ -دووکانە بەرێکی زەردە لەناو قەدە داربەڕووە بەتەمەنەکاندا دارێکی تر دەڕوێ ، بەرێک دەردەکات دووکانەی پێدەڵێن، ئەو دوکانەیەیان دەکردە هەویرو دەنکەکەیان لێدەردەهێناو لەسەر کەوانەکەیان دادەنا ، دوای چەند شەوێک کەوانەکەی لەبنڕا دەهێنایە دەر.

٢-پەلکی(روکێش)کە گیایەکە لەسەر دادەنا.

٣-دوونگی تازەو تەڕیان لەسەر دادەنا.

ئەیان گۆت کەوان یان قونێر بۆلەشی مرۆڤ گەلێک بەسوودە، چونکە دوای دەر بوونی کەوانەکە کێم

هەوایەکی زۆر پیس لەکەوانەکە دێتە دەرەوە و مرۆڤ ساغ دەکاتەوە.

-*ئەگەر یەکێک ووشـــکە بیرۆی لە دەمووچاو هاتبایە، ئەوا دەیانبردە لای کەسـێک کە شـــارەزای ئەو کارەبوو هەندێ تفی دەمی لەشوێنی ووشکە بیرۆیەکە هەڵدەسوی و چـاک دەبووە، یـان بەیـانیـان هەنـدێ مـاســـتیـان تێ هەڵدەسوی.

-*ئەگەر منداڵی سـاوا خێلە بوایە، ئەوا نیشـانەی ئەوەبوو کەوا بەباسکێک هەڵیان گرتووە، لەهەموو گوندەکان ژنێک تایبەت بوو بە چارەسـەر کردنی خێلی، دەیانبردە لای ئەو ژنەو بەیانیان لەخورینی بەپەنجەی لەناو دەمی منداڵەکەی دەناو شـوێنێکی ناو دەمی ئەزیەت دەداو چاک دەبووەوە، ئەگەر منـداڵێکیش ملی خوار بوایە، ئەوا پێی دەگووت بەری لانکێ بگۆڕە.

-*ئەگەر منـداڵێـک (میرکوتەی )لێهـاتبـایە، منـداڵەکەیـان ئەبردە ســـەر بـانێـک و ژێر پیلیـان دەگرتن و هەڵیـان دەپەڕاند، ئەیان گوت:

میرکوتە میرکوتە لەسەر بانیان هەرکوتا

سێ جار لەسەر یەکیان ئەم کارە دەکرد.

-*یەکێک ئەگەر (بەرچیچکە)ی بگرتایە، ئەوا یەکێک دەچوو تەنگاوی دەکردو پێی دەگوت:ئەوەڵۆ فرانە رۆژی ئەو جوینەت دبوو؟ یان ئەیانگوت ئەوەڵۆ جوینت دابوونە فرانە کەسی؟ ئیدی بەم تەنگاو کردنە بەرچیچکەکەی بیر دەچووەوە، یان ئەگەر بەرچیچکە گرتووەکە لەرێدا گەیشتبایە یەکێک، ئەوا پرسیاری لێدەکرد و ئەی گۆت: داکێ توو چەند مەمکی پێوەنە؟ ئەویش ئەی گۆت : دوو، بەرچیچکە گرتووش پێی دەگوت: بەرچیچکەی من بگاتە توو.

-*ئەگەر یەکێک ژانەسەری زۆر بەئازاری هەبوایە، چەند رۆژێکی خایاندبا، ئەیان گۆت سەری کەتیە، پەڕۆیەکی توندیان لەسەر دەبەست، ئەگەر ژانەسەرەکەش درێژەی کێشابا، ئەوا ئەیانبردە لای ئەوانەی لەسەر کەتن شارەزا بوون، داوێکیان بەدەرزیەوە دەئالاندو داوەکە بەکامەلا کەوتبا، ئەیان گۆت سەری بەو لایەدا کەتیە، بۆماوەیەک ملیان لەسەر لێوارو رۆخی(بیژینگ) دادەنا تاکوو دەماری ملی سڕ دەبوو، بەهۆی سڕ بوونی دەماری مل ژانە سەرەکەی سووک دەکرد.

-*ئەوانەی نەخۆشی زەرتکیان دەگرت، چەندین جل و بەرگی رەنگ زەردیان لەبەر نەخۆشەکە دەکرد، یان

مۆری و مەرجانی زەردیان لەمل دەئالاند، گوایە بەمکارە زەردوویی نەدەما، یان دەچوون ماسیەکیان لەناو تەشتێک لەناو ئاودا دادەنا، دەبوایە نەخۆشـەکە سـەیری ماسـیەکە بکـات تـامـاوەیەک ، بۆ ئەوەی زەردوویيەکەی بپەڕێتە ماسیەکە.

-*ئەگەر مندال (فرچکی)کەوتبا، فرچک بریتیە لەسەر یەک لاچوونی دەمارەکانی لاق، بەهۆی یاریکردن و سـوورِان، منداڵەکەیان لەسـەر پشـت دادەناو ژنێک هەردوو پێی منداڵەکەی بەرز دەکردەوە، شـەقی لەژێر پێی دەداو ئەی گۆت:

فرچکە وەجێ فرچکە وەجێ
ئێ مام ریوی بچی لەجێ
ئێ کوڕی من بێتەوەجێ.

-*ئەگەر ژنێک بەزەحمەت و ئازار بووبایە، ئەوا دەچوونە لای مەلای گوند بۆ ئەوەی بانگی فەڕاجی بۆ بدا، کەبریتی بوو لە دوعاکردن و پاڕانەوە لەیەزدان بۆ ئەوەی ئەو ژنە زوو نەجاتی ببێ، بانگی فەڕاجیش بەم شێوەیە بەئاوازێکی تـایبەت دەدرا(اللهم یـا قریـب الفرج، ویـا عـالیـا بلا درج)، تاکۆتایی، یان دەچوونە لای ئەو مالانەکە ئاوی زەمزەمیان هەیە، لەهەندێ شوێنیش دەچوون دۆخینی پیاوێکی بەدین

و بەتەقوایان دەبرد لەناو قەدی ژنەکەیان دەبەسـت، بۆ ئەوەی زوو منـداڵی ببێ، یـان دەچوون بـاگوردانی مزگەوتیـان قیت دەکردەوە، تـاکوو ژنەکە منـداڵی دەبوو باگوردانەکە هەر بەقیتی دەمایەوە.

-*جاران ئەگەر ماڵێک منداڵیان بووبایە، ئەوا خەنجەرێک یان چەقۆو سـیکاردیان لەپشـت سـەری مەلۆتکەکە دادەنا، بۆ ئەوەی شــەوەو جنۆکە نەتوانن لەو منداڵەو دایکەکەی بدات.

-*لەســەردەمی کۆندا ئەگەر یەکێک (تای ســێبەڕۆ)ی بگرتایە، واتا لەماوەی سێ رۆژ جارێک تای بگرتایە، ئەوا تووش بووەکە دەبوایە بچێتە سەر(سێڕیانێک) ، سێ بەرد هەڵبگرێتەوە، هەر بەردەی بۆ رێگـایەک فڕێ بـدایەو بیگوتبایە(بابەڕۆ، لێم ناگەڕێ ســێبەڕۆ) باوەڕیان وابوو بەم کارە چاک دەبێتەوە.

-*ئەگەر یەکێک (شــەوتا)ی بگرتـایە، ئەوانەی کەتەنهـا بەشــەو تاوو لەرزیان دەگرت، یەکێک لەئەندامانی خێزان دەچوونە سەر بانێک و بەشەو بانگی رادەهێشت:

بەشەو دەگری تا

بەرۆژبەردەدا

ماخۆی چارچاو

جوابێ وەدا.

مـاخۆی چـارچـاو بریتیە لەپیـاوێـک کە دوو ژنی هەبێ، مـاخۆی چـارچـاویش بەدەنگی بەرز ئەیگۆت(مریشـــکە رەشەی دەرمانە) دەبوایە مریشکێکی رەشی بێ نیشانەی بۆ سەربڕن و دەرخواردی بدەن.

-*جاران ئەگەر دوو ژن لەیەک کاتدا منداڵیان بووبایە لە گونـد، عـادەت وابوو لەهەر شـــوێنێـک ئەو دوو ژنە گەیشـــتبانە یەک، دەبوایە دەرزی بگۆڕنەوە، بۆ ئەوەی منـداڵەکە تووشـــی نەخۆشـــی(چلە گرتی) نەبن، ئەگەر نەخۆشـــیەکەشـــیان بگرتایە، دەبوایە منداڵەکە لەتایەکی تەرازو(میزان) تـایەکەی تریش زبڵی ئـاژەڵی تێبکەن و بیکێشن، لایان وابوو بەمە چلەگرتیەکە نامێنێ.

-*جـاران ئەگەر ژنێـک منـداڵی نەبوایە، ئەوا دەیـانبردە ســـەر پیاوچاکێک، یان ئاژەڵێکیان بۆ دەکردە خێر، یان پـارەیـان دەبەخشـــیەوە، یـان ئەگەر ژنێـک پیـاوەکەی مردبایەو هێشـــتا منداڵی نەبووبایە و گومانی ســـک پڕی هەبایە، ئەوا دوای ناشـتنی مێردەکەی چەند جارێک ژنەکە بازی بەســـەر گۆڕەکەی مێردی دا دەدا، گوایە بەمە دڵنیا دەبن کە سک پڕە.

-*جاران که ماڵێک منداڵیان دەبوو، نابوایە تاکوو دوای ساڵێک منداڵەکە بشۆن، بەڵکوو تەنها دەست و قاچ و پێیان دەشووشت، ئەیان بۆئەوەی تووشی سەرماو نەخۆشی نەبێ.

-*جاران نەریت وابوو ئەو ژنانەی کە منداڵیان دەبوو، ئەوانەی کەمنداڵی ساوایان هەبوایە، نابوایە تاماوەی مانگێک زیاتر سەردانی ژنە منداڵ بووەکە بکەن، چونکە ئەیان گوت بۆنی منداڵی تازە لەدایک بوو، کاریگەری و بۆنی بۆسەر منداڵی ساوا هەیە، بۆیە لەسەردان خۆیان دەپاراست.

-*پێشان ئەیان گوت منداڵی ساوا واباشە بگریێ، ئەیان گوت چاوی پێکەورابن.

-*پێشان ئەگەر منداڵی ساوا لەرادەبەدەر گریابایە، ئەیان گوت ئەو منداڵە زیڕیەی گرتیە، دەچوون دەرمانێک هەبوو ، لای چەند ژنێکی خاوەن تەجروبە هەبوو، پێیان دەگوت هەزوا یان قەسنی) کە لە گیاوگوڵ دروست کرابوو، ئەوەندە تاڵ بوو کە منداڵەکە دەیخوارد، زیڕیەکەی نەدەما.

-*لەزۆربەی گوندەکان (بەیتار)هەبوون کەشارەزابوون لەشکانی ئێسک و هەڵبەستنەوەی، جگەلەوەش چەندین

کەسی تر لەژن و پیاو ئیش و کاری برین پێچیان دەکرد، بۆ برینداری و نەخۆشـیەکانی تر، ئەوانەی (گرانەتا) یان بگرتایە، ئەوا (حەمام)یان بۆ دەکردن، حەمام بریتی بوولە کولاندنی کا لەناو مەنجەڵێک ئاودا، پاشـان پارچە پەڕۆیەکیان لەسـەر مەنجەڵەکەدا دەناو نەخۆشـەکەیان لەسەر دادەنا، تاکوو نەخۆشەکە ئارەقەی دەکردو تاچەند جارێک ئینجا چاک دەبووەوە.

-*بۆ گشـت نەخۆشـیەک دەرمانی کوردەواری بەکار دەهات، منداڵیش کە نەخۆش دەبوون، ئەیان گوت: یان بۆنە یان مانگە یان ترسـاوە، بۆچارەسـەری نەخۆشـی مانگ، مێشـکی بزن و کاریان لەسـەر سـەری منداڵەکەدا دادەنا، یان حەفت دەرمانیان بۆ دەگرتەوە، ئەو منداڵانەش کەتووشـی بۆن دەبوون، دەیانبردە لای بۆنبڕ، بۆنبڕیش بەری دەسـتی بۆن دەکردو هەندێ شـەکری بەگولاوی پێدەدان، ئەوانیش لەناو چایە یان ئاویان دەکردو دەیاندایە منداڵەکە.

وەبۆ ترسـانیش هەندێ مسـیان لەناو قاپێکدا دادەناو لەسـەر ئاگردایان دەنا، ئینجا لەسـەر سـەری منداڵەکە کارەکەیان دەکرد، مسەکە کە دەتوایەوە وێنەیەکی لەسەر دەردەچوو، لەکاتی کردارەکەدا دەبوایە ژنێک بڵێ ئەوە چ

دەکەن؟، ئەویش دەیگوت(ترسـێ لەفلانە منداڵی دەرەکەم)، وەدەبوایە ئەم ترس دەرکردنە دوای نوێژی عەسـر بوایە، پاشان هەندێ دەرمانیان دەدایێ.

-*گرمژە: بەهۆی ماندووبوون و ئارەقەکردن لەهاوینانداا، بەدەیان هووردە زیپکە لەدەک و چاو و سەرو مل و شان و پشـتی مرۆڤدا دەردەکەوتن، ئازارایان زۆر نەبوو، تەنها لەو کـاتەنەبێ کەدیســــان بەهۆی کـارکردن ئـارەقەی دەکردەوە دەزووورایەوە، دەرمانیش تەنها تیچهەلچسـوینی پەلکە شفتی بوو.

-*خوریکە: ئەم نەخۆشـــیە زۆر ترســـناک بوو و هیچ چارەســـەرێکی نەبوو، چونکە کووتان بەهۆی دەرزی و دەرمانی تر نەبوون، بۆیە ئەم نەخۆشـــیە ســـاڵانە پەیدا دەبوو و خەڵکێکی زۆری پێدەمردوو و ســەریان دەنایەوە یان کوێردەبوون.

-*کۆخەڕەشــە: بەهۆی ســەرماو سـۆڵەی جاران ، خەڵک لەبەر ئەوەی ماندوو بوو و دوای ئارەقەکردن ســەرمایان دەبوو، بۆیە تووشـــی کۆخە دەبوون، کۆخەیەک کەدوای کۆخین دەنگێکی زۆر بەســـام لەگەرووەیەوە دەهـات، کۆخە رەشــە یان(قوڕباقە)یان پێدەگووت، کەســی تووش بوو زۆر ئازاری پێوە دەکێشا، وەختی نووستن گەروویان

بۆ چەور دەکرد، یان شیرو هەنگوینیان پێدەدا، بەیانیانیش لەخورینی قەنداوێکیان هەندێ بیبەری تیژ بۆ تێدەکرد، ئەمە چارەسەری بوو.

-*سۆرکە یان سۆریکە: ئەم نەخۆشیەش بەهاران پەیدا دەبوو، هەموو لەشی سوور دەبووەوە، ئەیان گووت سۆرکە پیرۆزن، بەم شێوەیە گوایە هەموو ئازارێک و ئیلتیهاباتێکی لەش دەبا، لەبەر ئەوەی زوو بلاو دەبووەوە، زۆرجار هەرچی مندالی گوندە سۆرکەی دەگرت، بەهۆی سۆرکەوە چەندین مندال دەمردن ، من لەبیرمە سالی شەستەکان دوای ئاوارە بوونی خەلکی گوند ئەو سالە نزیکەی ٢٥ مندالی گوند سەریان نایەوە ، نیمچە چارەسەرێک هەبوو ئەویش بریتی بوو لە خۆپاراستنی نەخۆشەکە کەوا با لێی نەداو شوێنی زۆر گەرم بێ، هەندێ جاریش ئاوی جەرگ و ناویان دەدانێ.

-*گوێ ئێشان: ئەم نەخۆشیەش هەبوو جاران بەتایبەتی تووشی مندال دەبوو، چەند چارەسەرێک هەبوون، وەکوو قانگدانی گوێی نەخۆش، واتا دووکەلی جگەرەیان دەکردە ناو گوێ، یان شیری ژنانیان تێدەکرد.

# ئابووریی خۆشناوەتی

خۆشناوەتی لە رووی ئابووریەوە وەکوو باقی ناوچەکانی تری کوردســـتان بۆ چاندنی دەغڵ ودان پشـــت بە بەفروباران دەبەستن، سالانە رێژەیەکی زۆر گەنم و جۆ دەچێنرێت ، هەرچەندە ناگاتە ئاســـتی پڕکردنەوەی پێداویســـتی خۆراک، بەلام پارســـەنگێکی باشـیشــە بۆ پشـــتیوانی ئابووری کوردســـتان، جاران جوتیاری خۆشـــناوەتی چونکە بە کەرەســـتەی ســـەرەتایی زەوی دەکێلاو هەربەدەستیش دەیدووریەوەو دەی کوتاو لەیەکی جیا دەکردەوە، بۆیە هەمیشـــەو چوار وەرزی ســـاڵ لەکارکردندا بوو، تەنانەت لەوەرزی بەفر بارینیشـــدا دەبوایە خۆڵ و گڵ بەسەر بەفری سەر گەنم و جۆ دابکات بۆئەوەی گەنمەکە لەژێربەفردا نەخنکێت، خۆشـــناوەتی چەندین دەشـــتی باش و بەپیتی هەیە وەکوو(دەشـــتی بالیســان و دەشـتی توتمەو دەشـتی شـکارتەو بەشـێکی دەشـــتی هەریرو دەشـــتی دۆڵی هیران و ســـماقوڵی و...هتد)لەپاڵ گەنم و جۆکردنیشـــدا نیســـک و نۆکیش دەچێنرێت ، بۆیە پێداویســـتی لەنۆک و نیســـک نەبوو بۆ کڕین، ئەگەر ســـاڵێکیش ئاو زۆر بێت ئەوا زۆربەی

زەویەکان دەکرێن بە برنج و ماش و کونجی ، جگەلەوەی پێداویستی ناوچەکەی پڕدەکردەوە، جگەلەوەش ڕێژەیەکی زۆر دەفرۆشـــرا، هەروەها لەخۆشـــناوەتی ڕەزی دێمی لەتەواوی گوندەکاندا هەیەو هەندێ گوند ئەوەی پشـــتیان پێدەبەست فرۆشتنی ترێ و دۆشاوو مێوژ بوو، بەجۆرێک ترێی خۆشـــنـــاوەتی لە هەولێرو دەوروبەری دەنگی دابووەوە، جگەلەوەش لەزۆربەی گوندەکان چەندین باری ئۆتۆمبێل لەهەنجیر باردەکران و لەبازاڕەکانی کوردستان ســـاغ دەکرانەوە، ئەمەش داهـاتێکی بـاش بوو بۆ گونـد نشینان و پارەیەکی باشیان دەستدەکەوت.
بەڵام وەکوو بڕبڕەی پشـتی ئابووری خۆشناوەتی توتن بوو، تووتن وەکوو سـەرەکی ترین داهات گرنگیان پێدەدا، تاچەند سـاڵێک بەرلەئێسـتا سـەرچاوەیەکی باشـی بژێوی خەڵکی خۆشناوەتی بوو، تووتن یان(نیکۆتینیا)کریستۆڤەر کۆڵۆمبس لە ئەمریکـا بینیویەتی هینـدیە ســـوورەکـان رووەکێکیان کێشــــاوە ئەویش هێناویەتی بۆ ئەوروپا ، دوایی لەرێگەی بازرگانیەوە گەیشـتۆتە تورکیا لەسـەدەی ١٧ ی زایینی ، پاشـــان گەیشـــتووەتە وڵاتانی عەرەبی و گەلی کوردیش چاندوویەتی و خێری لێ بینیوەو بەرهەمی هێنـاوە، چـانـدن و بەخێوکردنی تووتن هەروا کـارێکی

ئاســان نەبوو، بەڵكوو بە پێچەوانەوە كارێكی تابڵێی گران و ســـەخت بوو، هەروەك ئەیان ووت تووتن بەخێوكردن وەكوو بەخێوكردنی منداڵی ســـاوا وایە، چونكە بەزۆر قۆناغدا تێدەپەڕی و ماوەیەكی زۆری دەویســـت تاكوو دەهاتە بەرهەم هێنان و ئینجا فرۆشـــتن، ســـەرەتا لە بەهارداو لەكۆتایی مانگی شـــوباتدا یان بەپێی گۆڕانكاری كەش و هەوا هەندێ جار دەكەوتە نەورۆز، لەپارچە زەوی بچووكـدا كەپێیـان دەووت(تكـانە شـــتر) ئەو تۆیەی كەلەپاییزدا هەڵیان گرتبوودوای ئامادەكردن و خۆشكردنی تكانە شـــترەكە ، تۆیەكەیان پێوەردەكردو بەزبڵ یان كەونە خۆڵ تۆیەكەیان بن خاك دەكردوئینجا بەباگوردان زۆر باش دەیان پەســتایەوە، پاشــان هەندێ چیلكەداریان لەســەر دادەنان ، دانانی چیلكەكان بۆ دوو مەبەســت بوو، یەكەمـیـان بـۆ ئەوەی چـۆلەكەو مـریشـــك تـۆیەكە هەڵنەگرنەوەو نەی خۆن، دووەمیش بۆ ئەوەی شــتڵەكان باران كوت نەبن، ئەگەر بارانیش لەو كاتە نەباریبایە ئەوا دەبوایە بەئاو چەند جارێك شــتڵەكان تەڕبكەن بۆ ئەوەی گەشـــە بكەن، دواتر بژار دەكران، پێش ئەوەی شــتڵەكان گەورە ببـن زەویەكەیـــان دەدووریەوە لەگیـــا ، دوایـی رووســـەیـان دەكرد، رووســـە بریتیە لە تێرئـاوكردنی

زەویەکە، بۆئەوەی نەرم و نیـان بێـت و دوای حەوت هەشـــت ڕۆژ دەیان کێڵا، دووگاســـنیان دەکرد ، هەندێ جاریش تەنها یەک جار دەیان کێڵا، دواتر خەتیان لێدەدان ، ئینجا بەزبارە (بۆیە)کانیان هەڵدەدانەوە ، بەشـــێوەی (قەتـارە) کەلە چەنـد (بۆیەک )پێـک دەهـات، (بەنـداو)یش بریتی بوو لەچەن قەتـارەیەک، (شـــەقە)ش بریتی بوو لەچەند بەنداوێک، بەم جۆرە زەویەکە یان بیستان جاڕەکە ئامادەدەکرا، پاشـان بەیانیەک شـتڵەکانیان هەڵ دەقەندن و بە گیایەک دەیان پێچان دەســـک دەســـک، گیایەکە پێی دەڵێن(پیزپیزۆک، یان دەراو)، دوای ئامادەکردنی شـتڵەکان کابانی ماڵ دراوسـێ و خزمەکانی ئاگادار دەکرد کە (پاش نیوەڕۆ تووتنێ چینین وەرنە یارم) وەکوو دەسـتەوا چەند کچ و ژنێـک ئـامـادە دەبوون، جووتیـار پێش چـانـدن رووســـەی بۆیەکانی دەکرد ، واتا پڕئاوکردنی بۆیەکان، ئینجا دوای کەمێک ووشـــک بوونەوەو کزر بوونەوەی بۆیەکـان جـارێکی تر ئـاوێکی کەم هەڵـدەبەســـتراو شـــتڵەکانیان دەچاند، پاش ئەوەی تووتن چاندن تەواو دەبـوو ئێوارە جـووتیـار هەنـدێ دەرمـانی قڕکەری (جۆبڕکەی) لەگەڵ هەندێ ئاردەســـاوار تێکەڵ دەکردو هەنـدێ ئـاوی پێـدادەکرو بۆیە بۆیە دەرمـانەکەی لەنـاو

بۆیەکان دەکرد، ئەگەر دەرمانی جۆبرکەی لێنەدرابایە ئەوا بێگومان جۆبڕکە لەژێرزەوی ڕیچکی تووتنی دەقرتاندو دەبووەهۆی ووشک بوونی شتڵەکان، دوای ئەوەی دوو ڕۆژ تێدەپەڕی بۆجاری یەکەم ئاوی دەدایەوە، ئەمە پێیان دەووت(ئێک ئاوی، پاشان دووئاوی و پاشان سێ ئاوی و سەراوکردن، قۆناغی بژارکردن دادەهات دەبوایە ئەو گیایەی لەناو بۆیەکان دەڕوا بەهۆی بژاربڕ بژاربکرێن بۆئەوەی هێز لەتووتن نەبڕن، چەند ڕۆژێک بژارکردن دەیخایاند ، دوای سەراوکردن جارێکی تر بژار دەکرایەوە کە (پاشـــوەبژار)یان پێدەگووت، دوای بژار ئینجا قۆناغی (ســـەر لێهاویشـــتن وکارتەو جۆتە )دەهاتە پێش، دوای ئەوەی تووتنەکە گوڵی دەردەکرد، بۆئەوەی هێزبداتە گەڵاکانی گوڵەکانیان لێدەکردەوە کەپێی دەوترێت (ســـەر لێهاویشـــتن) ، تاماوەیەک لێی دەگەڕان تاکوو دووگوڵی تری دەردەکرد ، ئەوانیشـــیان دەقرتاند، ئەمەیان (جۆتە) لێکردنەوە بوو، دوای ماوەیەک هەرگەڵایەک کارتەیەکی لەبن دەردەکرد، ئەمە کارتە کردن بوو، کارێکی زۆر بەزەحمەت و پڕ ماندووبوون بوو، چونکە دەبوایە هەربە پێوەو خۆی بچەمێنێتەوە تاکوو کارتەکان لێبکاتەوەو بۆ پشت ئێشان خراپ بوو.

لەهەمووی خراپتر بۆتووتن (گورگە) شـــین بوونە لەژێ قەدی تووتن، گورگە جۆرێکە لەبژار گوڵێـک دەردەکـات وەکوو نێرک لەژێرقەدو لەناو رێچکەی تووتن شـین دەبێ ، گورگە تووتن زۆر بێهێزدەکات ، بۆلەناو بردنی گورگە لە رۆژداو لەکـاتی گەرمـای نیوەڕۆ تووتنەکە ئـاوبـدرێ بەشـــێوەیەک کە بۆیەو پشـــتەبۆ هەمووی (رەش ببنەوە) واتا هەموو شـوێنێکی زەویەکە تەڕ ببن، ئەمە کارلەگورگە دەکات و دەبێتە هۆی لەنـاوچوونی، زۆر جاریش بەهۆی ئەوەی تووتن زۆر ئاودەدرا ئەوا گەڵاکانی سـپی دەبوون و هەڵدەوەران.

تووتن ئەو کـاتەی کە پەڵـک و گەڵاکـانی پنگی زەردو قاوەیی لێپەیدا دەبوو، ئەوا نیشـانەی ئەوە بوو کەوا کامڵ بووە، بۆیە دوا ئاو دەدرا و ئامادەکاری دەکرا بۆ رنین و لێکردنەوەی گەڵاکانی ، یەکەم کار کە دەکرا ئامادەکردنی شیشـە بوون ، شیشـە لەداری باریک ئامادەدەکران، دوای چاکردن و تیژکردنی هەردوو سەری شیشـەکە کەبەقەدەر مەترێک درێژبوو، وەدروسـتکردنی کەپرێک لەناوەڕاسـتی زەویەکە بۆدانیشـتنی تووتن پێوەکەرەکان، چەند کەسـێکی شـارەزا لەتووتن پێوەکردن بانگهێشـت دەکران بەشـێوەی دەســـتەوا، هەروەها چەند کچ و ژنێکیش ئاگاداردەکران

کەزبارەی تووتن رنینمان هەیە، ئیدی لەبەیانیەوە دەسـت دەکرا بە تووتن رنین و کوڕێـک یـان کچێـک کۆمەڵی تووتنی رنراوی دەگواسـتەوە بۆ پێش تووتن پێوەکەران، ئەم کارە بەقسـەی خۆش و پێکەنین ئەنجام دەدرا، هەندێ جـاریش دەبووە پێشـبڕکێ لەنێوان ئەو پیـاوانەی کەتووتنیان پێوە دەکرد بۆئەوەی بزانن گیشـەی کامەیان زۆرترە لەوی تر، پێش نیوەڕۆ وەجبەیەک ترێ یـان هەنجیر وەکوو چێشـتەنگاو دەهێنراو پشـوێکی کورت دەدرا، دوایی تـاکوو کۆتـاییـان پێدەهێنـا، ژنێـک ئەو گەڵایانەی کەووشک بوونە هەڵی دەگرتنەوەو دوای ئەوەی بەتەواوی ووشـک دەبوو پاییزان عەرەب دەهاتن بەرانبەر پابوون و قەسپ (سۆرەپەل) وەردەگرت.

جووتیـار دوای تەواوبوونی تووتن رنین و پێوەکردن شـیشـە تووتنەکانی لەپاڵ یەک لەشـوێنی کەمێک شـێدار لەتەڵەدەدا بۆماوەی سـێ بۆ چوار رۆژ دادەنابە پوونگ یان چرۆ دادەپۆشـی، دوای ئەوەی تووتنەکە زەرد دەبوو، هەندێک لە زەویەکەیان راسـت دەکردو (مشـتاغیان)خۆش دەکرد، تووتنەکە شـیشـە شـیشـە لەبەر تیشـکی رۆژ رادەکردو هەموو رۆژێک شـیشـە تووتنەکەیان وەردەگێڕا تاکوو بەتەواوی وشـک دەبوو و رەنگی لەنێوان زەردو

ســوور دەبوو، دوای ووشــک بوون لەســەر یەک دایان دەناو زۆر جار هەرلەناو مشـــتاغ مشـــتەری دەهات و توونتنەکەی دەکڕی ، ئەگەر نەش فرۆشـــابایە ئەوا ئەیان بردەوە ماڵەوەو لەشـوێنی تایبەت بە گیشـە لەسـەر یەکدا دادەنرا، توونتن هەتا کۆنتر بێ نرخی باشـــتر بوو، ئەگەر خاوەنەکەی توونشـــی هەرکیچشـــەیەک بووبایە ئەی ووت خۆ توونتنم هەیە، توونتن وەکوو(شـــیری پاش کەندوو) هەژمار دەکرا.

توونتن لەلای ئێمە چەند جۆرو ناوێکی هەیە وەکوو(بۆندار، گوێ کەرە، بیتوێنی، فەقێ عەوێزی، بڕک کورت) ئەو شــوێنانەی کە ئاویان زۆرو ســازگارە هەمیشــە لەنرخ و فرۆشـــتن لەپێش شـــوێنەکانی تر بوونە، وەکوو توونتنی (مەلەکان و زێوەو هەرتەڵ و شیرەو چیوەو خەتێ )، زۆر جاریش توونتن لەســـەر مشـــتاغ بارانی پێکەوتووەو تێکی داوەو خاوەنەکەی هاتۆتە ســـەر زەرەر، توونتن گەلێک گیروگرفتی زۆری هەبوو بۆ مـامرەتکەرانی توونتن، بەرلەوەی دام و دەزگـای نوێ بۆ وەرگرتنی توونتن دابمەزرێ، فرۆشـتنی بەزۆر قۆناغی سـەخت و ناخۆشـدا تێپەڕیوە، چەنـدین جـار کـاروانچیەکـانی توونتن کەبە شـــێوەی قـاچـاغـدا توونتنیـان بـارکردووە، لەرێگـادا

کەوتوونەتە دەســت پۆلیس یان بۆتە شــەڕو تەقەو یان لە ڕووباری خازرو زێی بادینان خنکاون یان ولاغەکانیان هەڵدێراون و بۆتە هۆی ئاژاوە تا ئەم دواییانەش کێشــەی توتن هەرمابوو، لەلایەن حکوومەتەوە تووتن قاچاغ بوو، لەگەڵ ئەو هەموو بەربەرەکانیەی فرۆشتنی تووتندا کەچی خەڵک گوێیان بەمەترسیەکان نەدەداو بەبێباکی تووتن بار دەکراو بۆ (تکریت و دۆرەو عانەو ڕاوەو کوبی ســـات و موصل)، پاش ئەوەی تووتنەکە دەگەیشتە جێی دیاریکراو کاروان چیەکان بەبێ ترس و منەت بەپێش چاوی پۆلیسدا دەهاتنەوەو کەیفیان ســـازبوو، چونکە لەلایەک بارەکەیان گەیـانـدبووە جێ، لەلایەکی تریش پـارەی کرێیەکەیـان وەرگرتبوو بەناو شـاردا دەگەڕانەوەو کەلوپەلی پێویسـتی ماڵەوەیان دەکڕی، لەسـاڵەکانی حەفتای سـەدەی ڕابردوو بردنی بارێک تووتن بە(دینارو نیوێک) وەردەگیرا، دواتر بووبە (سێ دینار).

هەروەها لە سـاڵی هەشتا بەسـەرەوە کاری چاندنی(پیواز) هاتە مەیدانی کشــتوکاڵ لەخۆشــناوەتی ، چەندین زەوی دەکران بە پیاز و ئەویش تاماوەیەک خەڵکی مژوول کردو داهـاتێکی بـاش بوو بۆ گونـدنشـــینـانی خۆشـــنـاوەتی، بەجۆرێک گرنگی بەپیاز دەدرا لەپاڵ چاندنی تووتن.

بەهۆی هەڵکەوتەی خۆشناوەتی کەساڵانە بەفرێکی زۆری لێدەبارێ ، وەئاو و هەوایەکی سازگاری هەیە، وەبەچەندان شاخ و دۆڵ دەورە دراوە ، وەسەرچاوەیەکی زۆری کانی و رووبارو جۆگەی هەیە، ئەمە وایکردووە کە کەلەناوچەی خۆشـــنـاوەتی داری گوێز بەرێژەیەکی زۆرو بەرچـاو برویێت، چونکە سروشتی داری گوێزحەزی لەئاوو هەوای فێنک و ســـازگارە، لەم بوارەدا ئەگەر پۆلینی ناوچەی خۆشناوەتی بکەین لەرووی داری گوێز ئەوە بەپێی قسەی خەڵکی بەتەمەن و ســـەرچاوە مێژووییەکان مێژووی دار گوێز لەخۆشـــنـاوەتی زۆر کۆنە، هەربەبوونی مێژووی کۆن ئەو دارە بوونی هەبووە، بەپێی ســـەختی و ســـاردی ژینگە زۆرترین دار گوێزی هەیە.
زۆرترین دارگوێز لەخۆشـــناوەتی لەگوندی (مەلەکان و تارینان) بەپلەی یەکەم دێت، گوێزی مەلەکان بەناوبانگن لەرووی جۆرو باشـــی و ناســـکی و کاکڵ ســـپیەتی ، هەرچەندە بەهۆی ســـاردی مەلەکان گوێز لەم شـــوێنە درەنگتر پێدەگات، بەڵام دەتوانن بەدەیان تەن گوێز بنێرنە بـازاڕەکـانی کوردســـتـان، لەفۆلکلۆری کوردیـدا ئـامـاژە بەزۆری گوێزی مەلەکان کراوە هەروەک ئەڵێن:
بابچینە لای مەلەکان

گویزان بینین گەلەکان
لۆخاتری چاو بەرەکان
گوندەکانی (هەرتەل و زێوە)بەپلەی دووەم دێن، لەرووی زۆری گوێز، بەهۆی هەڵکەوتەی ئەم دووگوندە ژینگەیەکی شیاوی گوێزیان هەیەو ساڵانە دەیان تەن لەم دووشوێنە بەرهەم دەهێنرێت و دەنێردرێنە بازاڕەکانی کوردستان، گوندی بێتواتە بەپلەی سێیەم دێت ، گوێزی بێتواتە زووترپێدەگات و بەرهەم دەهێنرێت و زووتر دەنێردرێنە بازاڕەکان، ئەمە جگەلەوەی گوێزبەرێژەیەکی بەرچاو و زۆر لەباخچەکانی (شەقڵاوەو هیران و نازەنین و کرۆژو دۆڵی کۆڕێ و سیساوەو خەتێ و توتمەو بالیسان و کانی بەردو شیرەو هەردوو چیوەو ئەنگۆزو بێکێڵ و بەڕۆژ) هەن.
جۆرەکانی گوێز بریتین لە(ناسک، ئازا، کاکڵ سپی، کاکڵ رەش، کاکڵ بۆر، هێلکەیی، شەرەفی، کویرک، پایزی، هاوینی، کەلالە، سێ چوو، زەردی، شیرنە گویز، تاڵەگویز، چیایی، گەرمێنی، خڕیلە)، داری گوێز زۆری دەوێت تاکوو گەورە دەبێت ، لەهەمان کاتیشدا دارێکی بەتەمەنە، تەمەنی بە ١٠٠تاکوو ٢٠٠ ساڵ خەملێنراوە، هەروەها جاران کەم وابووە داری گوێز بەدەست چێنرابێ، بەڵکوو سمۆرە

دوای شـــاردنەوەی گوێز پاش ماوەیەک لەبیری دەچێت لەکوێی شاردوونەتەوە بۆیە بەشێوەیەکی خۆڕسک شین دەبوو، بەڵام ئێستا بەدەست دەچێنرێت.

گوێز لەســـەرەتای مانگی ئەیلوول پێدەگات و ســـەرەتا بەفەریکی کەتازە کاکڵی کردووە دەخورێت، مانگی ١٠ و ١١ دادەوەشـرێت بەکەسـانی شـارەزاو دارەوان ، دوای ووشـــک بوونی هەڵدەگیرێت و رەوانەی بازاڕەکان دەکرێت، ســـەردەمێک گوێزی خۆشـــناوەوتی نەک هەربازارب ِ ەکانی کوردســـتان بەڵکوو بازاڕەکانی عیراقیشی پڕدەکردەوە، بەڵام بەهۆی ئەنفالەکانەوە رژێمی لەناوچووی بەعس زۆربەی دارگوێزەکانی تەقاندەوەو لەناوی بردن.

گوێز لەبازاڕەکاندا داواکاری زۆری لەســـەرەو زوو دەفرۆشـــێت، بەهۆی ئەوەی گوێزوەکوو دەرمانی سـرووشـتی بۆدابەزاندنی کۆلیسـتڕۆل و نەخۆشـی دڵ باشـــە، بۆیە ئێســـتا زۆربەی نوژدارو پزیشـــکەکان ئامۆژگاری نەخۆشـــەکان دەکەن بەخواردنی گوێز، گوێز پێکهـاتەیەکی چەوری هەیە ئەم چەوریە ئەبێتە دژ بە چەوری و کۆلیستڕۆل.

یەکێکی ترلە سەرچاوە ئابووریەکانی خەڵکی خۆشناوەتی بریتی بوو لە(مازی)، بەهۆی هەبوونی دارستانێکی چڕوپڕی خۆڕسک لە چیاکانی (سەفین و بەنەباوی وکڵاوقاسم و هەورێ و ماکۆک و زینەتیرو تەلان و شۆپەو سەربارو شیشار...هتد) داری مازی بەشێوەیەکی بەرچاو بەدی دەکرێت، جاران وەکوو ئێستا نەبوو، بەڵکوو هەرگوندەی رۆژێکیان تەرخان دەکرد بۆ لێکردنەوەو چنینی مازی ، ئەو رۆژە خەڵکی گوندەکان بەگشتی دەچوونە ئەو چیایانەو ژن و پیاو بەیەکەوە وەکوو گەشتێکیش بوو، کامە خواردنی باش هەبوو رۆژی پێشتر ئامادەیان دەکردو بەیەکەوە بەڕێدەکەوتن ، لەسەر ئەو لووتکەو ئەو بەرزاییانە بەگۆرانی و بەللۆرەو بەند دەستیان دەکرد بە لێکردنەوەی مازی، لەکوردەواریدا حەڵاڵترین رزق مازیە، وەکوو ئەیان ووت ئەوەندەحەڵاڵە ئەرێی پارەی مازیانە، دوای لێکردنەوەی مازیەکان ماوەیەک لە شوێنێک رایان دەکردن تاکوو ووشک دەبوون، دوای ووشک بوون ، مشتەری وەرزی پاییزان دەگەڕا لەگوندەکان گوند بە گوند مازیەکانی دەکڕین، یان بەخۆیان دەیان بردنە شارو دەیان فرۆشتن ، ئەمەش داهاتێکی باش بوو بۆ خەڵکی گوند نشین.

هەروەها بەدرێژایی سەدەی رابردوو هەناری خۆشناوەتی لە شـــارەکانی کوردســـتان و عیراق بەناو بانگ بوون، بەشـــێوەیەک پاییزان بەدەیان قەتاری کاروان کەران بەدوای یەکدا ریزیان دەبەست بۆدەشتی هەولێرو موصل ، ئەوەی شـــارو گوندەکانی دەشـــتی هەولێر پشـــتیان پێدەبەســـت هەناری خۆشـــناوەتی بوو، کاروان چیەکان کەدەگەیشـــتنە هەر گوندێک بانگیان رادەهێشـــت(هۆی هەنارو هۆی هەنار ، هەناری شـیرنی شـۆشـێ، بارناکەم لەوێ عەوشـێ، هەتا هەنار نەفرۆشـێ، هۆی هەنارو هۆی هەنار، هەنار سـۆری قورمزی، بارناکەم لەکەردزی، هەتا هەنار نەڕزی.....هتد).

ئینجا هەنارەکانیان یان بەگەنم و دانەوێڵە دەگۆڕیەوە، یان بەپارە دەیان فرۆشـــتن، ئەمە جگەلەوەی دەیان کردنە ســـرکەو پاشـــان دەیان فرۆشـــت، بۆیە ئەوانەی باخچەی هەناریان هەبوو داهاتێکی باشیان پاییزان دەست دەکەوت.

دەشتی سەروچاوە دەشتێکی فراوانەو ئاوێکی باشیشی هەیە، بۆیە سالانە رێژەیەکی زۆروبەرچاو لە گوڵەبەرۆژەو کونجی و مـاش و برنج دەچێنرێت، بۆیە خەڵکی ســـەرووچاوەو بێتواتەو گوندەکانی دەوروبەری زۆر گرنگی بەچاندنی گوڵەبەرۆژە و کونجی و ماش دەدەن ،

ساڵانە دەستکەوتێکی باشی پارەیان دەست دەکەوێت و وەکوو باگراوەندێکی ئابووری ناوچەکە هەژمار دەکرێت، ئەگەر ساڵێک ئاو زۆر بێت ئەوا لەگوندەکانی تریش کونجی و برنج و ماش دەچێنرێت ، بەتایبەتی گوندەکانی دەشتی هەریر.

ئاشکرایە لای هەموانمان کەباسی هەنگ دەکرێت دووشتمان بیر دێتەوە، یەکەمیان هەنگوین، دووەمیش ژینگەو سروشتی شیاوی بەخێوکردنی هەنگ، خۆشناوەتی سروشت و ژینگەیەکی لەبارە بۆ بەخێوکردنی هەنگ، هەبوونی زۆری زەوی و زاری کشتوکاڵی و چیاو لووتکەی عاسێ و کەئەم دووانەش یارمەتی دەرن بۆ هەنگ، بۆ سوود بینین لەگوڵو بەرهەمە کشتوکاڵیەکان بۆ مژینی شیلەی ناو گوڵەکان، وەبۆ دانانی شوێنی حەوانەوەو دروستکردنی شاندا لە شوێنی لێڕەوارو داری گەورەو یان کەلێنە شاخەکان، بۆیە دەبینین هەنگوینی ساغ و بێ فرت و فێڵ زیاتر لە خۆشناوەتیدا دەست دەکەوێت، لەم رووەشەوە چەندین کەس کارو کاسبیان بەخێوکردنی هەنگەو بەدوای دۆزینەوەی مێشە هەنگوینە لەچیاکان ، ئەمەش وادەکات

کە یارمەتی دەرێکی باش بێت بۆ ژیان و دەســت کەوتنی داهات.

خۆشــــناوەتی بەهۆی بوونی دەیـان لێرەواری دارەبەن خاوەنی بەرهەمهێنانی بنێشــتی کوردیەو ســاڵانە بەدەیان تەن بنێشـــتی کوردی بەرهەم دەهێنرێت، بـازاڕەکـانی کـوردســــتـان و دەوروبەری پـێپـڕدەکـرێتەوە، وەک بەرهەمـێـکـی خـۆمـاڵـی لەپـاڵ بەرهەمەکـانـی تـری وەک(هەنگوین و گوێز پەنیرو دۆشـاوو سـرکە)، گونجانی کەش و هەوای خۆشناوەتی و بوونی شاخی بەرزو گردو تەپۆڵکەو زۆری شــــاخەکان هاندەرن بۆبوونی دارەبەن، تەمەن درێژی دارەبەنیش هــانـدەرێکی تربووەبۆئەوەی دارە گەشـــە بکات و ببێتە ســــەرچاوەیەکی ژیانی دەیان خێزان و بەهێزکردنی ژێرخـانی ئـابووری کوردســـتـان، وەپڕکردنەوەی بەشـێکی بازاڕی کوردسـتان بەم بەرهەمە ناوخۆیی یە، دارەبەن چەند جارێک تووشــــی لەناوچوون هاتووە بەهۆی ئەو کارەسات و شۆڕشانەی لەکوردستاندا روویان داوە، بەتایبەتی لەنیوەی ســــەدەی رابروو تاکوو پرســـەی ئازادی عیراق، چەند جارێک تووشـــی ســووتان هــاتووە، هەروەهــا ئەو کۆچەی کەخەڵکی گونـدەکـان بۆشــــارەکان و دامەزراندنیان لەلایەن حکومەتەوە ئەمە

وایان کردووە کەبەرهەمی بنێشـــت رووڵەکەم بوون بکات ، ئەمە لەلایەک لەلایەکی تریش گەنجی ئەمڕۆ کەمتر بایەخ بەم کارانە دەدات و زیاتر حەزی لەئیش شارەکانە.

چیـاکـانی خۆشـــنـاوەتی پڕیەتی لەدارەبەن وەک چیاکانی(ســـەفین و بەنەباوی و چیای هەورێ بەگشـــتی پڕیەتی لەدارەبەن، بەتایبەتی خەڵکی گوندی (ســـەردۆڵ) کەهەمیشـــە خەریکی بەرهەمهێنانی بنێشـــت بوون، بەڵام خەریکە ئەم گونـدەش بەرەبەرە وازلەم کـارە بێنن ، کاروابرِوات ئەوا بەرهەمە خۆماڵیەش دەپووکێتەوە.

بەشـێکی تری سـەرچاوەی ئابووری خەڵکی خۆشـناوەتی بریتی بوو لە (داری ئەسـپیندار)، بەهۆی ئەو ئاوە زۆرەی کەلە ناوچەی خۆشـــناوەتی بەدی دەکرێ، ئەو کەش و هەوایەو ژینگەلەبارەی ناوچەکە، خەڵکێکی زۆر زەویەنزیک ئـاو و رووبـارەکـانیـان بەداری ئەســـپینـدار دادەچانـد، بەجۆرێک زۆربەی زەویە نزیک ئاوو رووبارەکان چۆمی ئەســـپینداریان دادەنا، جگەلەوەی کەســـەرچاوەیەکی باش بوو بۆ خەڵک، بەهەمان شـــێوەش کەش و هەواو ژینگەی دەوروبەری جوان و دڵڕفێن و فێنک دەکرد، لەبەر چڕی وپڕی داری ئەســـپینـدار دیمەنێکی جوانی دەبەخشـــیە ناوچەکە، بازاڕەکانی کوردســـتانی پڕدەکردەوەو داهاتێکی

باشیش بوو بۆ خەڵک، شێوەی فرۆشتنیشی بەچۆم بوو، واتا چۆمەئەســــپیندار بەهەموو داری چاک و خراپ و کورت و درێژەوە دەفرۆشـــرا، کەپێیان دەووت (چۆمبڕ)، هەندێ جاریش بەدانە دەفرۆشران، تاکوو رێگای سەیارە گەیەنرایە گوندەکان پێش ئەو کاتە بەووڵاخ دار بارکراوەو بۆشـــار گوێزراوەتەوە، زۆرترین داری ئەســـپیندار لە (شـــەقڵاوەو هیران و کۆڕێ و نازەنین و ســـماقوڵی و کرۆژو سیساوەو سوورسوورەو باشوورەو خەتێ و توتمەو زێنەو بالیســـان و هەردوو چیوەو کانی بەردو هەردووشیرەو زێوەو هەرتەل و بێتواتەو سەروچاوەو مەلەکان و تارینان) بەدی دەکران ، پاییزان و بەهاران چەندین لۆری لەداری ئەسپیندار بار دەکران و دەنێردرانە بازاڕەکانی هەولێرو ســـلێمانی و رانیەو موێڵ، ئەمەش داهاتێکی زۆر باش بوو بۆ خەڵکی خۆشـــناوەتی ، بەڵام ئێستا کەمتر گرنگی بەداری ئەسپیندار دەدرێت.

# ئاژەڵداری

بەو پێیەی کە دەڤەری خۆشناوەتی ناوچەیەکی شاخاوی و دەشتایی یە، هەڵکەوتەی شوێنەکەی وایە کە پڕیەتی لەلەوەڕگاو پووش و پاوان، بۆیە سروشتەکەی گونجاوە بۆکاری ئاژەڵداری، وەگومانی تیادانیە کە بڵێین ئاژەڵداری سەردەمێک بڕبڕەی ئابووری گوندەکانی خۆشناوەتی بوو، چونکە زۆربەی پێداویستیەکان لە ئاژەڵداری دەست دەکەوتن، هەرلە بەرووبوومی ئاژەڵی و بەکارهێنانی وولاخی بەرزە بۆگواستنەوەو کێڵانی زەوی هەمووی بەهۆی ئاژەڵەوە بووە، بەم شێوەیە:

**یەکەم: وڵاخەبەرزە**

وەکوو ئێستر و کەر و بارگیر و ماین و ئەسپ، ئەوانە بۆبەکارهێنانی گواستنەوەی کەلوپەل و گەشتکردن و کاروانکردن و هێنانی دارو چیلک و گواستنەوەی چرۆو کاو گەنم و جۆو گێرەکردن و جەنجەڕ، ئەو کارانە هەمووی لەسەر پشتی وولاخی بەرزەوە بووە، هەندێ جاریش بۆکێڵانی زەوی بەکاریان دێنان، بۆیە زۆر گرنگیان پێدەدان و خزمەتیان دەکردن، بەجۆرێک وولاخ گرنگ بوو ئەیان ووت(ئەوەی کەرەکی نەبێ، کەرەکی

نایینی) واباشە باسی جۆرەکانی وولاخی بەرزە بکەین بەم شێوەیە:

١-کەر: چەند جۆرێکی هەبوو وەکوو:

کەری دێزە:ئەم جۆرە کەرانە لەکاتی کەباریان لەســـەر پشـــــت بـوو خـۆیـان بەدارو بەردا دەدا بـۆئەوەی کەبـارەکەیـان لێبکەوێ، وەکوو ئەیـان ووت(کەری دێزە خۆلەشـاخی فڕادا هەتا سـاحێبی زەرەرێ بکات)بۆیە ئەم جۆرەیان زۆر مەرغووب نەبوون، چونکە وەکوو پێویست ئیش و کاری نەدەکرد و بەکەلک بارکردن نەدەهات.

کەری تەمبەڵ: ئەمەشیان هەرلەناوەکەیەوە دیارە ، لەکاتی بـارکردن دا زۆربەتەمبەڵی دەڕۆیشـــت و نـاوەنـاوەش کەدەگەیشـــتە ســـەر ریخ و زبڵی کەرەکـانی تر، بۆنی دەکردو زۆڕەزۆڕی دەکرد، بۆیە ئەمـانەش پەســـەنـد نەبوون.

کەری باش: کەپێشیان ئەووت کەری ئێسترانی ، ئەمەیان هەندێکیان هێندەی ئێســـتر بڵند بوون ، هەندێکیشـــیان ئاسـایی لەبارکردندا وەکوو ئێسـتر کاری دەکرد، ئەمەیان پەسەند بوون و مەرغووب بوون.

کەرەبەغدایی: جۆرێک بوو لەکەر کە زۆر گەورەبێ.

کەرێ شین: مەبەست لێرەدا لەرەنگەکەی نیە کە شین بێ بەڵکوومەبەست جۆرەکەیەتی کەجۆرێکی هەرەباشە.

کەری خەســـاو: ئەو کەرانە بوون کە خەســـێنرابوون، بۆئەوەی کاری پەڕینیان پێ نەکرێ و بێهێز نەبن، کەسـی تـایبەت هەبوو کە شـــارەزابوو لەخەســـاندنی کەر، کەرەکەیان لەزەوی دەداو گونەکانیان دەبردنەوە ناوەوە، تـامـاوەیەک ئینجـا کەرەکە هیچ زەوقی پەڕینی نەدەمـاو قەڵەو دەبوو بۆبارکردن گەلێک باش بوو.

هەروەها ئەم رەنگانەیان هەیە:

بۆز: لەنێوان رەنگی بۆرو ســـپیی، کەری رەش، کەری سپی، کەری بۆرە،

ماکەر: ئەم جۆرەیان کەمتر لەخۆشـــناوەتی بەخێودەکرا، پێم وایە لەبەر عەیبەبووە کە مێیەی کەرلە خۆشـــناوەتی رابگیرێ.

هەروەهـا کەری هەرەبـاش بۆکـاروانیش بەکـاردەهـاتن ، کەتەنها بۆسواربوون و هەڵگرتنی پێداویستیەکانی کاروان وەکوو خـواردنـی کـاروانـکەرو کـاو ئـالـیکـی وولاخ بەکاردەهات پێیان ئەووت(مێنەک).

ئەگەر ماکەر لە ئەسـپ چاک بکرێ واتا ئەسـپ بپەڕێتە ماکەر، ئەوا بێچوەکەی ئێسترێکی زۆر بچووک دەردەچێ، لەقەبارەو شێوەدا وەکوو کەرە.

٢-ئێستر: چەند جۆریکیان هەیە وەکوو:

-*ئێسـتری نێرە: کەباشـترین جۆرەکەی بوو، بۆکاروانکردن و ڕێگای دوور بەکاریان دەهێنا ماندوو بوونی بۆنەبوو،

-*ئێسـتری ماچە: واتا مێیەی ئێسـتر بەهەمان شـێوە بۆ گشت کارێک بەکاریان دێنا.

-*ئێستری کۆتە: گوێیەکانی بچووکن و زۆر گەورە نیە.

-*ئێسـتری گڕە: زۆربەرزو گەورە نەبوون. ئەیان وت ئەگەر ماکەرلە ئەسـپ چاک بکرێ واتا ئەسـپ بپەڕێتە ماکەر ئێسـتری گڕەی لێدەردەچێ. جاران ئەیان وت لە ئێستریان پرسی بابت کێ یە؟ لەوەلامدا وتی :خالْم ئەسپە. شـەرمی بەبابی بووە چونکە ماین لەکەر چاک دەکرێ، واتا لەکاتی پەڕینی کەرلە ماین ئەوا بێچوەکەی ئێسـتر دەردەچێت.

٣ -ماین: ئەم جۆرو ڕەنگانەیان هەیە:

-*ماینی حدود: باشـترین جۆری ماینە، هەم بۆبارکردن هەم بۆ نانەوەی بێچوو.

-*مـاینی ڕەوەنـدی: جۆرێـک بوو لەمـاین کە زیـاتر ڕەوەندەکان هەیان بووە بۆیە بەم ناوە ناو نراوە.

-*ماینی عەرەبی: ئەم جۆرە ماینە ڕیشـیەکانی سـەرملی درێژن و زیـاتر عەرەبەکـان بەکـاریـان هێنـاوەو جۆرێکی باشە.

هەروەهـا ئەم ڕەنگانەیـان هەیە (کەوێت واتـا ڕەنگی بۆر، شـــێ واتا ڕەنگی زەرد، بۆز لەنێوان ڕەنگی ســپی و بۆر، ســۆر، ڕەش، ســپی، نێوچەوان قەرەبەش، واتا نێوچەوان سپی)

-*جوانیە مــاین: ئەو مــاینەیە کە گچکەیەو هێشـــتــا نەگەیشتۆتە قۆناغی گەورەیی.

-*ئەســـپ: ئەســـپیش بەهەمان شـــێوەی ماین جۆری (حدودو ڕەوەندی و عەرەبی و ئێرانی)هەیە.

ئەگەرمـاین لەئەســـــپ چـاک بکرێ ئەوا بێچوەکەی یـان ئەسپ دەردەچێ یان ماین.

-*بارگیر: ئەسپی خەسێنراوە.

-*یەختە یان ئێختە: بەهەمان شێوە ئەسپی خەسێنراوە.

**دووەم :چێر**

زۆربەی گونـدەکـان کـاڕانی تـایبەتی خۆیـان هەبووەو ئێســتاشــی لەگەڵ بێ (چێر) بەخێوکردن بەردەوامی هەیە،

بەڵام ئەوەی من باسی دەکەم چارانە ، هەموو گوندیۆۆك گاوانی هەبوو کامە کەس هەژار بوایەو منداڵی هەبان بە راوێژی ریش سـپی و پیاو ماقولی گوند گاوانیان دەستنیشان دەکرد و گاوانیش مەرجەکانی خۆی دەخستە روو کەبریتی بوو (نانی گاوانی) بۆهەر سـەرە ووڵاخێک نانێکی وەردەگرت و شـەرتەکەش بۆماوەی چەند مانگێک بوو کەهەقی هەرسـەرە ووڵاخێک دادەنراو دوای تەواو بوونی شەرتەکە برە پارەکەی وەردەگرت، وەدەبوایە پیاو ماقوول و خاوەن ووڵاخەکان شوێنی لەوەڕاندنی هاوینەو زستانانیان بۆدەستنیشان دەکرد، ئەو کاتەی کە سبەینان گاوان بانگی رادەهێشت و ئەی ووت(گاڕان رۆیی وراغان بینن)ئەو وراغە دەکەوتە ئەستۆی گاوان لە وون بوونی و دابڕان و خۆدزینەوەی وراغەکان لەگاڕان یان زانی چێرلەچیا ئەوا دەبوایە گاوان خەبەر بنێرێ بۆخاوەنەکەی کە چێریان زاوە دەبوایە خاوەنەکەی بەدوای چێرەکەدا بچێ بیهێنێتەوە، زۆرلەو کەسانەی کەدەبوونە گاوان نازناوی (فلان گاوانی) لەسەر دەمایەوە.

لەبەهاراندا کاتێک هەیە کە چێرو جوانەگاو گا مێشیان دێتێ، ئەویش مێشێک لەناو پێستی ئەو ئاژەڵەدا دێتە دەرەوە، بۆیە وراغەکە شێت و هاردەبێ لەولابۆئەولا

رادەکات، بۆیە ئەو کاتە بۆگاوان زۆرناخۆشەو گاوان زۆر ماندوو دەکات.گاوانی کارێکی قورسە چونکە هەم دەنگدان و لێخوڕینی وراغ بە(وەحە یـان ئۆحە) وەتەری نـاو گەرووی مرۆڤ مـاندوو دەکات، گەلێک جار گاوان دەنگی دەنووســـێ، هەم زۆریش مـاندوو دەبێ لەدوای گاڕان ، لەگێڕانەوەو راکردنی وراغ، جـاران ئەیـان ووت گـاوان دوعـای لێکراوە کەقەت نەحەســێتەوە، بۆیە هەمیشـــە هـەرماندووە.

چێر (چێڵ) بۆ لێخوڕین هەروەک باســمان کرد بە (وەحە یان ئۆحە) بەکاردێت، بۆ بانگکردن (چکی چکی) لە کاتی دۆشینیش (تشووووتشووو) بەکاردێت.

چێر دوای زانی و لەدایک بوونی بێچوەکەی (گۆلکۆکە) ی پێـدەڵێن، دواتـر ئەبێتە(گۆلـک)، ئەگەر مـێ بێ ئەوا (گۆلکەمێیە)، ئەگەر نێریش بێ ئەوا (گۆلکە نێر) ی پێدەڵێن، دواتر گۆلکە مـێ دەبێتە (مـێنگوین) ، گۆلکە نـێریش دەبێتە(جوانەگا) پاشــان مێنگوین دەبێتە چێرو ئینجا (یەک گۆلکی ، دوو گۆلکی...هتد) جوانەگاش دوای خەســـاندنی دەبێتە(گا).

گا لەخۆشـناوەتی زۆر خۆشـەویسـت بوو چونکە هەرچی زەوی کێڵان هەبوو هەمووی لەســـەر ملی گا بوو، بۆیە

زسـتانان خاوەنەکەی لەکاتی نووسـتنیش پێی خۆش بوو لێی نزیک بێ و لێی دیار بێ، بەهاران جۆرێک لەدانەوێڵە کەتـایبەت بوو بە گـا دەچێنرا، کەنـاوی(کزن) بوو، کزن وەکوو نیسـک وایە بەڵام گەورەترە لە نیسـک، لەزسـتانان کـزنەکەیـان بـۆ دەکـوڵانـدن و دوای نەرم بـوونەوەی دەرخواردی گایان دەدا، بۆئەوەی گایەکە بەهێزبکات.

سێ یەم: بزن

من لێرەدا تەنها باسی بزنتان بۆ دەکەم ، چونکە باسەکەی من تـایبەتە بەرابردوو، نـاوچەی خۆشـنـاوەتی بەهۆی هەڵکەوتەی زیـاتر جـاران گرنگیـان بە بزن دەدا بزنیـان بەخێودەکرد، چونکە ژینگەی خۆشـنـاوەتی لەبـارترە بۆبەخێوکردنی بزن، بەهۆی ئەوەی خۆشـناوەتی زیاتر شـاخ و کێو و هەڵدێرە ، بزنیش سـروشـتی خۆی وایە زیاتر حەزی لە رۆیشـتنی ناو چیاو شـاخ و هەڵدێرە، ئەمەلەلایەک لەلایەکی تریش خۆشـنـاوەتی بەفر زۆر دەگرێ ، بزن رۆیشـتنی نـاو بەفری لەلائاسـایی یە ، بەپێچەوانەوە مەڕتوانای رۆیشـتنی سـەر بەردو شـاخ و بەفری نیە، من نـاڵێم مەڕ بەخێوناکرێ، بەڵام بەکشـتی مێگەلە بزن زیاتر هەبووە نەک مێگەلە مەڕ، تەنها پاییزو بەهاران کەشـەکە لەبارە بۆمەڕ ، بۆیە رەوەندەکان پاییزو

بەهاران دێنە ئەو دەڤەرەو ئاسـایی یە بەڵام زسـتانان نامێننەوە و بەرەو شـوێنی گەرمێن کۆچ دەکەن، لێرەدا بۆ دەوڵەمەندکردنی بابەتەکە واباشە باسی شوان و شوانەتی و جۆرەکانی بزن و قۆناغەکانی تەمەنی بزن بکەین.

شوان و شوانەتی

کەسێک کە دەبووە شوانی خاوەن مێگەلە بزنێک دەبوایە شـەش مانگ شـوانەتیەکەی تەواو بکردایە، ئەم ماوەی شـەش مـانگە (شـەرت)یـان پێـدەگووت، هەش بوو هەربەخۆی شـوانەتیەکەی دەکرد یان کوڕێکی دەناردە شـوانەتی، ئەو کەسـەی کە بەمەرجەکانی شـوانەتی رازی دەبوو گەلێک جـار (سـەرشـەرتیشـی) وەردەگرت، سـەرشـەرت بریتی بوو لە وەرگرتنی گیسکێک یان بزنێک، هەروەها جگەلەوەرگرتنی شەرت هەندێ پێداویستیشی بۆ دەکرا، بەپێی رێککەوتنەکەی سـەرەتایی، وەکوو جووتێک پێڵاو و کراسێک و دەرپێیەک و قاتێک کورتەک و شرواڵ، هەندێ جاریش لەجیاتی کراس و دەرپێ پارچە خوماشێکی خـامیـان بۆدەکڕی، جـاری وا هەبوو هەر ژنی خـاوەن مێگەل خـامەکەی بۆدەکردە کـراس و دەرپـێ ئەگەر لەدوورین شارەزا بوایە ئەگینا شوانەکە خامەکەی دەبردە لای کـامە ژنی کـارامە لە دوورینی جل و بەرگ، جـاری

واهەبووە شـــوانەکە ماوەیەکی زۆر لەلای خاوەن مێگەل ماوەتەوە بۆیە خاوەن مێگەل ژنی بۆ شـوانەکەی هێناوەوماڵیشی بۆ داناوە.

لە گوندەکانی خۆشـناوەتی جگە لە مێگەلەبزن هەر ماڵێک چەند سـەربزنێکیان هەبوو تەنها بۆ دۆخواردن و ماسـت و پێداویسـتی تر، ئەمانە پێیان دەوترا (هووردەمار)، واتا چەند سـەرەبزنێک، لەو کاتەدا شـوانەکە بەپێی سـەرەبزن پارەکەی وەردەگرت، ئەگەر شـوانەکە لە شـوێنێکی تر هـاتبـایە ئەوا شـەو لەمـاڵی خـاوەن مێگەل دەمـایەوە و هەموو پێداویسـتییەکی بۆ دابین دەکرا، وەکوو بەیانیان نـان و پێخۆریـان بۆ لەتوورەکەیەک دەکرد و شـوانەکە توورەکەکەی لەملی دەکرد و تـاکوو ئێوارە، بەڵام ئەگەر شوانەکە خەڵکی هەمان گوند بوایە ئەوا شوانەکە نانی لەو مـاڵانە دەچـنیەوە، کە شـوانەتـی بـۆ دەکـردن، ئەم نـانچنینەوەیەش بۆ هەرمـاڵێـک نـانێـک یـان زیـاتری وەردەگرت، بۆ ئەم کارەش ژنی شـوان یان خوشـکی بەم کارە هەڵدەستا.

جاران وەکوو ئێستا نەبوو بۆ نێری لەبزن بەردان، بەڵکوو پاییزان نێریەکانیان لە مێگەڵ دادەبڕین و دەیان هێنانەوە مـاڵەوە و بەخێویـان دەکردن، کـامە لەوەڕی بـاش هەبوو

بۆیان دەهێنا بۆ ئەوەی قەڵەو بێت و بەهێزبێت، بۆ کاتی نێری تێبەردان و پەڕین، هەم بۆ ئەوەش کارەکان لەکاتی سەرما لەدایک نەبن، بۆیە بزنەکان لەمانگی سێ دەزان و هیچ کاریگەری سەرمایان لەسەر نەدەما، دوای ئەوەی بۆ ماوەیەک نێریەکان دادەبەستران لەپاییزدا نێریەکانیان تێکەڵی مێگەل دەکردنەوەئەم کارە(نێری تێبەردان)یان پێدەگووت، ئیدی زۆر ئاسایی بزنەکان لەمانگی سێ و چوار دەزان ، ئەو کاتەش کاتێکی ئاسایی یەو کارەکان زۆربەڕێکی و خێرایی گەشەیان دەکرد، بەڵام ئێستا ئەو بەرنامەیە جێبەجێ ناکرێ، نێری ناگیرێتەوە، بەڵکوو هەمیشە لەناو مێگەلە، بۆیە دەبینین هێشتا هەر پاییزە کار پەیدا بوونە، بۆیە دەبینین کار و بەرخ ئێستا زوو زوو دەمرن و بەرگەی نەخۆشی ناگرن.

**قۆناغەکانی تەمەنی بزن**

دوای ئەوەی بزن زاو کارلەدایک بوون، هەرئەو کاتەی کارلەدایک دەبێ و دوای ئەوەی بزنەکە کارەکە دەلێسێتەوەو ووشکی دەکاتەوە، شوانەکە هەوڵ دەدات کارەکە یەکەم جار شیر بخوا ، بۆئەم مەبەستە کارەکە بەدەست هەڵدەستێنێتەوەو دەی باتە ژێر بزنەکە هەربەدەست گوانی بزنەکە دەگرێ و لەناو دەمی کارەکەی

دەنێ ، کارەکە دەســـــت دەکات بە شـــیر خواردن، ئەم کارە(فرچک خواردن) ی پێدەڵێن، دوای خواردنی فرچک ئەوا کارەکە دەتوانێ خۆی لەسەر پێ رابگرێ و بەرەبەرە خۆی دەچێتە ژێردایکی و شیردەخوا دوای کەمێک کارەکە دەســــت دەکات بە یاری کردن، لەو یاری کردنە چەند جارێک بەردەبێتەوە، ئەم قۆناغە(کارە ســـاوای )پێدەڵێن، دوای ماوەیەک (کاریلە) یان (کارۆکە)ئینجا دەچێتە قۆناغی (کار) ، ماوەی ساوایەتی کار لەماڵەوەیە، دەبێت جێگاکەی گەرم بێت و ســــەرمای نەبێ، تاماوەیەکی زۆر خواردنی تەنها شـــیری دایکە کەرۆژانە دووجار بەیانی ئێواران شـــیرەکەی دەخوات، لەم کاتەدا خاوەن ماڵاتەکە نابوایە شیر زۆر لەبزنەکان بدۆشن بۆئەوەی کارەکە برسی نەبێ ، تەنها دوای تێرخواردنی کـارەکە ئەوەی لەگوانەکـانی دەمایەوە دەدۆشراو یەکەم جاریش شیرەکە نابێتە ماست بەڵکوو دەبێتە(فرۆ)، حەوشـــێکی بچووکیان بۆدروســـت دەکەن پێی دەووترێت (کۆز) یان (کۆزەکار).

داری بەڕوو بەهـاران ســـەرەتـای چرۆکردن گەڵاکـانی ووردن و رەنگی مەیلەو ســـوورە(کۆژ) ی پێـدەڵێن، تاماوەیەک ئەو کۆژە دەبڕن پارچە پارچە بەسەر پەرژینی حەوشـــەکەی هەڵـدەواســـن بۆئەوەی کـارەکان فێری

خواردنی چرۆببن، ئیدی بەرەبەرە کارەکان فێری خواردنی چرۆ دەبوون،

پاش ماوەیەک کەکارەکان کەمێک گەورە دەبوون، پێیان دەووتن (فەراژی) بووینە واتا گەورە بووینە، بۆیە کارەکان لەحەوشـــە دەردەکرانە دەرەوەی گوند، یەکەم رۆژ بردنە دەرەوەی کارکەمێک ئاســـتەم بوو چونکە کارەکان رێ ناکەن و بۆئەولا ئەولا رادەکەن و یاری دەکەن بۆیە یەکەم رۆژ کارەوان زۆر ماندوو و هیلاک دەبوو، هەروەها یەکەم رۆژ کەکارەکان دەبردرێنە دەشت و دەر ، ئێوارەکەی بزنەکان بۆنێکی نامۆ لەکارەکانیان دەکەن کەبۆنی دەشتە، بۆیە لەسەریان ناوەستن و نایەڵن کارەکان شیر بخۆن، ئەیان ووت بزن(نەبان) بووینە، پاش ماوەیەک بزنەکان لەمەش رادەهاتن و ئیدی ئاســـایی دەبوونەوە، پاش ماوەیەک (کارەوان) یان بۆدەگرتن یان یەکێک لەکوڕەکانی خاوەن مێگەل دەچووە دوای کاران و دەبوو بەکارەوان.

دوای ئەوەی کەداربەتەواوی سـێبەری کرد، ئینجا قۆناغی (بەدان هاتن) دەســتی پێدەکرد، ئەمەش بریتی بوو لەوەی کەوا چیتر بەیانی ئێواران لەماڵەوە کارو بزن نەدەدیتران ، بەڵکوو پێش نیوەڕۆ مێگەلە بزن لە شـوێنێکی دەرەوەی

گونــد رادەگیرا و (بێری)کۆمەڵ کۆمەڵ بەدوای یەک دەکەوتن و ســتڵ و شــیرمەشــکیان پێبوو دەســت دەکرا بەدۆشینی بزنەکان ، لێرەدا واباشـە هەڵوەستەیەک بکەین دوای بەدان هاتنی مێگەل گەلێک جار شـــوان ئەگەر گەنج بایەو ژنی نەهێنابایە ئەوا یەک لە بێریەکانی دەست نیشان دەکرد و خۆشـــەویســـتی و دڵداری دەســـتی پێدەکرد، شـوانەکە چەپکێک کنێری بۆن خۆشـی کێوی دەبەسـت و لەپەنـایەکـدا دەیکردە دیـاری دەیـدایە یـارەکەی ، یـان شـــوانەکە چەپکێک (گوڵەروون)ی دەکردە دیاری بۆ ژنی خاوەن مێگەل، ئەویش لەســـەر مەشـــکەی قایم دەکرد، باوەڕیان وابوو ئەو گوڵەروونە رۆن دەبەخشێتە مەشکەکە و رۆن و کەرەکەی زیـاد دەکـات، لە بەهـاردا کـاتێـک کە داری هەنـار گەڵا دەکـات یەکەم جـار گەڵاکـانی مەیلە و سـوورن، ئەو کاتە هەڕەتی شـیر و ماسـت زۆر بوونە، لە خۆشـناوەتی پەندێک هەیە دەڵێ: (وەختی هەنار سـۆران، خەنی لەبزن زۆران) دوای ئەوە رەگی گەلاکـان دەگۆڕێ بۆشـــین، ئینجا ئەڵێن: (وەختی هەنـار شـــینان ، خەنی لەمەشک ژینان).

دوای ئەوەی کرداری دۆشـــین و بێرکردن تەواو دەبوو، ئینجا بانگی کارەوان دەکراو بەم شێوەیە:

هۆۆۆۆۆ کارەوان کاران بینە، کارەکانیش برسـیتیان بەراکردن دەچنە ناو مێگەل و دەبێتە بارە بارى بزن و کار ، ئەوەندە دەنگێکى خۆش پەیدا دەبێ بەدەیان ئاواز وەکوو سـەمفۆنیایەک تێکەڵى دەشـت و دەردەبێ، دواى تێرخواردنى کارەکان ئینجا لەیەکیان جیا دەکردنەوەکە (چەرت و ئاوێر) کردنیان پێدەووت، پاشـان کارەکان دووردەخرانەوەو بزنەکانیش لەژێر سێبەرى داربەڕوەکان (مۆر) دەبوون واتا رادەکشـان تاکوو دواى نیوەڕۆ، ئینجا دواى ئەوەى بزنەکان پشـوێکى باشـیان دەدا و برسـى دەبوونەوە و هەربەخۆیان بێ ئەوەى هەڵیان بسـتێنى و دەنگیان بدەى ، زۆر ئاسایى هەڵدەستان و بەدواى لەوەڕ دەستیان بەرۆیشتن دەکرد، لەوکاتەدا ئەیان ووت(حەیوان راقەنا) واتا لەجێى خۆى جوولا، ئێوارانیش دواى عەسـر بەهەمان شـێوە لەشـوێنێکى مێرگ و دلڕفێن مێگەل رادەگیراو بەهەمان شـێوە بێریەکان دەچوونەوە دۆشـینى بزنەکان، دەبوایە ژنى خاوەن مێگەل هەندێ نان و ئەوەى نیوەڕۆ چێشـت لێنراوە بۆشـوان وکـارەوان ببەن بۆخواردن.

گەلێک جار کار ژان دەگرێ هیچ شـتێک ناخواو یارى نـاکـات ، ئەیـان ووت ژانى گرتووە، بەچەقۆیەک یـان

بەبەردێکی تیژ گوێی کارەکەیان کەمێک دەبڕی پاش ماوەیەکی کەم ژانەکە بەردەدا و ئاسایی دەبێتەوە، من خۆم ئەم کارەم زۆرجار ئەنجام داوە.

ناوی کار هەتاکوو شیر بخوا دەمێنێتەوە، دوای ئەوەی لەهاویندا کارەکان لەشیرخواردن دەبڕن، ئینجا دەبن بە(گیسک)تانزیکی پاییز یان ئەوەتە کارەکانیان لەگەڵ مێگەلێکی تردەکردن، یان دەبوایە کارەوان تاکوو نزیکی زستان لەلای کارەکان بمابایەوە، دوای ئەو ماوەیەی باسمان کرد، کارەاکنیان کەبووبوونە گیسک دەبردنەوە لای مێگەلی خۆیان و تێکەڵ دەکرانەوە، ئەوکاتە نەگیسکەکان دایکی خۆیان دەناسیەوە نەبزنەکانیش ئەو سۆزو میهرەبانیەی جارانیان دەما، ئینجا دەبوون بە گیسکە نێرو گیسکە مێ، پاش ماوەیەک نێرەکە دەبووە (کووری)و مێیەکەش دەبووبە (چوشتیر)، ئەگەر بزن ئاوس نەبایە دەیان گوت(بزنە ئەستەویر) ، پاشان دەبوو بە(سەرەبزن)و ئینجا (پیرەبزن)، نێرەکەش دەبووبە(تەگە)و دواتر نێری.

جۆرەکانی بزن

١- بزنی مەرەز: بچووک ترە لەبزنی رەش، بالای گچکەترە، مووەکەی بەنرخ بوو، بۆدروستکردنی (کری

رانـک و چۆغەر)، چەنـد رەنگێکی هەیەوەکوو(ســـوور، شینکی، رەش، سپی، گورگەیی، شەکەری).

٢- بزنی رەش:مووەکەی بۆزۆرشـــت بەکـاردەهـات وەکوو دروستکردنی(رەشماڵ و گوریس و تەنکەو خرارو جاجم و راخەر).

٣- بەلەپۆش: گوێیەکانی خڕو مەیلەو سپیە.

٤- بەلەجاغ: هەردوولاچاوی خەتێکی سپی پێدا هاتووە.

٥- بەلەمس:دەم و چـاوی مەیلەو رەش و ســپیە، گوێیەکانی لوولن.

٦- بەلەپۆش: گوێیەکانی لوول و سپیە.

٧- گۆردی:گوێیەکانی پان و درێژن.

٨- گۆردی پۆش: گوێیەکانی پان و مەیلەو سپین.

٩- گۆردی کار: گوێ پان لاچاوەکانی مەیلەو سوورە.

١٠- گۆردی مس: گوێیەککانی پان و درێژو سپین.

١١- گۆردی رەش: گوێیەکانی پان و درێژو رەشن.

١٢- قەش، قەرەبەش: نێوچەوانی سپیە.

١٣- بەلەرەش: گوێ لوول و رەشە.

١٤- قوتەرەش: گوێ کورت و رەنگیشیان رەشە.

١٥- بەلەکار: گوێ لوول و مەیلەو خاکیە.

١٦- بزنه دوڕه: لەبزنی مەرەز پەیدا دەبێ چەند ڕەنگێکی هەیە(ڕەش، سپی، سوور، شین).
١٧- بزنەکەژ: ڕەنگیان سپیی تۆخە، مووەکانی بەهێزترو درێژترە لەوانی تر.ئەوانیش چەنـد جۆرێکیـان هەیە وەکوو(بەلەکەژ، گۆردی کەژ، قوتە کەژ).
١٨- بزنە کۆریس:بەو بزنـانە دەووترێ کە کە(قۆچ، شاخ)یان نیە.
١٩- گوریلە: دوو گوریلەیان لەژێرملدا هەیە.
٢٠- بزنە گەمبۆر: ڕەنگیان ڕەشـەو هەندێ مووی سـپی لەپشتدا هەیەو مووەکانیشیان قایم و پتەون.
ئەو بزنەی کەلە پێشـــــەوەی مێگەل دەڕوا (عەجەجە کێش) یان پێدەووت، کە زەنگوڵی لەملدایە، ئەو بزنە وەکوو ڕێ نیشاندەرێک لەپێشەوەی مێگەڵ دەڕوا.
بۆلێخوڕین و دەنگدانی بزن (ئیخخە)بەکـاردێـت، بۆئاودان(کۆووونەحائەح)، بۆ گێڕانەوەی مێگەل (هێشـشـە هەرا) ، بۆبـانگ کردنی بزن (گدی گدی)، بۆبـانگکردنی نێری(چکەلەچکەلە) ، بۆبۆبانگکردنی بزن و گیسکە مێ(خچ خـــچ خـــچ)، بـــۆلەیەک جـــیـــاکـــردنەوە (چەرتە)و (ئەحائەح)بەکاردێت، وەئەگەر بزن یان گیســـک یان نێری زۆرلەمرۆڤەوە نزیک بکەوێتەوە و لێی نەترســـێ و گەمە

لەگەڵ مرۆڤدا بکات پێی دەڵێن(لچ) ئەمەش بەهۆی پێدانی ووردکەنان و خوێیە.

بزن حەزی لەشوێنی شاخاویە، دەتوانێ گوزەربەشوێنی تاشەبەردو عاسێدا بکات، وەزۆرحەزی لەچرۆی داربەڕوو و چرۆی مازیە، بۆیە لەپاییزاندا چرۆی داربەڕوو ودارمازی بۆدەبڕن و لەسەر یەکی دادەنێن لەشوێنێکی نزیک گوند ، کە (دێیە چرووی ) پێدەڵێن، ئەمەش یان لەشوێنێک کەوا ئاوی نەچێتەژێر یان لەسەر دارێکی گەورەی دوولک بۆئەوەی ئاژەڵ نەیگاتێ دادەنێن، لەزستاناندا لەسەر دارێکی دوولک هەڵی دەواسن ، ناوەناوەش دەبێ خوێراوکی بۆ پێدابکەن، لەزستاناندا ئەگەر بزن چرۆ زۆر بخوا ئەڵێن(حەیوان دوونەیێ کا)ئەمەش نیشانەی کەوتنی بەفری زۆرە.

چەند زانیاریەک دەربارەی شوانکارەیی

جاران لەخۆشناوەتی ئەو کەسانەی بزنیان نەبوون و حەزیان لەبەخێوکردن هەبوو، بەڵام توانای دارایی و کڕینیان نەبوو، دەچوونە لای خاوەن مێگەلە زۆرەکان و چەند سەرەبزنێکیان لێ وەردەگرتن و بەخێویان دەکردن، بەپێی رێکەوتنێک رێک دەکەوتن، وەبەیەکێک لەم جۆرو شەرتانە رێک دەکەوتن:

یەکەم: دۆخۆرە: ئەو جۆرە شـــوانکـارەیی یە واتـا ئەو کەسەی بزنەکانی بەخێودەکردن تەنها نیوەی گیسکە نێرو بەرووبوومەکـانی تری هەبوو، وەکوو (موو و پەنیرو ماست و دۆو رۆن...هتد).

دووەم: پێنج و دوو، ئەم جۆرەیان بەم شێوەیە بوو:

بۆنموونە:سـێ بزنی خاوەن مێگەل و دووبزنی شـوانکارە لێک دەدران و ئینجا چەندی هەبایە، بۆمـاوەی چواریان پێنج ســـاڵ دوای تەواو بوونی ئەو مـاوەیەبزنەکـانیـان دابەش دەکردن، لەو مـاوەیەشــــدا بەرووبوومەکەیـان بەنیوەیی بوو.

سێیەم: شوانکارەیی بەسەر

ئەم جۆرەیـان خـاوەن مێگەل چەنـد ســــەرەبزنی دابـایە شـوانکارەکەدەبوایە ئەوەندە سـەرەبزنەی بدابایەوە، تەنها ئەو کاتە نەبێ ئەگەرنەخۆشــــیەک یان ئافاتێکی ئاژەڵی تووشـــــی ئەو بزنـانە بووبـایەوە ، لەکۆتـاییدا ئەوەندەی مـابـایەوە خـاوەن مێگەل لێی وەردەگرتەوە، ئەم جۆرە معـامەلەیە مـاوەیەکیـان بۆدیـاری دەکرد، چواریـان پێنج ساڵ، لەو ماوەیەشدا بەرووبوومیان بەنیوەیی بوو.

# ئەو پەندانەی لە خۆشناوەتی بەکاردێن

*ئەوەی لە رابردوو چاو بنووقێنێ*
*ناتوانێ بۆ پێشەوە هەنگاو بنێ.*

پەند رســـــتەیەکی کورتە، یـان نیمچە درێژو پڕ مـانـاو مەبەستە، سـادەو رەوان و خۆماڵییە، مۆرکی گەلی پێوە دیارە، دوورە لەهەموو داتاشـــین و وردکاری ، پڕە لە هەموو جوانکاری و رەوشــتێکی میللی ، شــێوەو وێنەی ئاســاییان گرتووەتە خۆ، هەرچەندە قســەی ســەرزارەکی خەڵکن بەڵام لە قالب و کاڵایەکی فەلســـەفیانەو هەموو لایەنەکـانی ژیـانی کۆمەڵگـای کوردەواری پێوەدیـارە ، پەندی هەرگەلێک بەرهەمی رۆڵە قسەزان و بەبیر و هۆش و خـاوەن تـاقیکردنەوەکـانیەتی، بەروبوومی ئەدەبی و رۆشنبیری پیاوە دنیا دیدەو زاناو بیرو عاقڵمەندەکانیەتی، بۆ هەموو بوارو گیر و گرفتەکـان وتراون، بۆ هەر رووداوێک و کارەســـات و پێشــبینییەک پەندێک وتراوە، دانەری دیارنییە و وەکوو پاشـماوەیەک جێماوە، خاوەنی پەند گەلە بە گشتی بەسامانی نەتەوایەتی هەژمار دەکرێت، نەوە بە نەوە گوازراوەتەوە و لە ئەنجـامـدا ئەوەی مـاوە دەســـــتی کەوتووە و بەکاری هێناوە لەکاتی پێویســــتدا،

ئەوەی من مەبەستمە ئەوەیە ئەو پەندانە بڵاو بکەمەوە کەلە دەڤەری خۆشناوەتی بەکارهاتوون، ناتوانم بڵێم سەدا سەد ئەو پەندانە هی ئەو ناوچەیەن، بەڵام ئەو پەندانە زیاتر شەقڵ و مۆرکی خۆشناوەتیان پێوە دیارە و بەراوردیشم کردوون لەگەڵ ئەو پەندانەی کەوا بڵاوکراوەنەتەوە ، لەوانەیە هەندێ پەند بە دارِشتنێکی تر و بە شێوازێکی جیاوازتر لە خۆشناوەتی بڵاوکرابنەوە، بەڵام من زیاتر ئەو پەندانەم کۆکردوونەتەوە کەوا بڵاو نەکرابنەوە و تایبەتمەندی ئێرەی پێوە دیاربێ.

-*رەشێ قانوونی تا هێوارێ خۆبدەیە بەر صابوونێ هەردێیەوە سەر قرارێ دوونێ.

-* مارەبابم ژنێ نەوسن ، دەبەری نایینە نیر و گاسن .

-*هەوی لە پشت کۆزا ، لە ترِکەنا وابی رۆژە.

-*ژنێ ژن بەسەرهات ، شەرتی هەرات.

-*هەویداری، سەگ حەساری.

-*تاشیری نەبینی لە کالانێ ، نەکەی درۆو بوختانێ.

-*خۆ شووشتن رەنگ و رووە ، خواردن گەندو گووە.

-*ئەگەر بخۆی سەرکی بەرانی ، ناگری جێی نانی.

-*نەکەوەت دارە ، نەچەقەلە بوارە ، نە کیژ شوونەوارە.

-*کوچک لە ئاگری گەرمتر نابی.

-*ئەوەی کەرەکی بوو ، خەمەکی بوو.

-*کەر بەستنەوە، خەم بەستنەوە.

-*ماریَ لە خوارماران، کافر نەبی بە حاران.

-*بەگایان گوت، لۆ دەچییە دوو چێڵەبەکەریَ؟ گوتی لە ترسی قوونیَ خۆ.

-*لۆ کابرای ناکەس بەچە خۆ بەکوشـــتن بدەی، ئەریَ بەمردنیَ خۆمرد.

-*قسە خۆشان، گولک بەردانە ماشان.

-*بە حوشتریان گوت خەت، گوتی پیشەم نیە قەت.

-*رۆژو لات ، هەموو وورات.

-*مست لە درێشە ئەگەڕێتەوە.

-*دەستت لە کەوگیربی، چاوت لە فەقیر بی.

-*ساریَ بەتەم هەرمەگرە غەم.

-*دنیا هەورە، دەمی گورگی چەورە.

-*هەوران پنەپنە، نەمێردە و نەژنە.

-*بەرایێ کۆچیَ چێربی، زەحمەتە ئاخیری خێربی.

-*ئەگەر چێرە بە دۆبی، لەدەرکیَ ساحێبی خۆبی.

-*ئەچیتە دەشتیَ راوەکا، بسکیَ خۆ داوداوەکاو ، ئێکی دی بەناوەکا.

-*ئەگەر خواداى دەركێ وەكە، ئەگەر خوابردى دەركێ وەكە.

-*ئەوەى كردى بردى.

-*ئەوەى بەنەفسە، ئەلفەكى بەسە.

-*ســـەرتراشـــين ، كۆرێ بەشـــەريە ، ترش خوێدانێ بەشەريە.

-*ئەوەى هەمووشـــتەكى لەبەركا ، قەت رووت نـابى ئەوەى هەموو شتەكى بخوا ، قەت برسى نابى.

-*نانى خۆ بخۆ بە ئاوێ، منەتێ خەركى پێناوێ.

-*وەختى ترێ و هەنجيرى، گون درێژترن له عيرى!

-*كەرێ مەمرە بواردێ ، كورتانت لۆ له شـار دێ گيات لۆ بەبار دێ.

-*هێتيمم كە، شەيتانم كە.

-*گەرمت بى، شەرمت بى.

-*ئێك بە زۆران دەبى خەنى زۆربە ئێكى نابن خەنى.

-*ئەگەر داكە خواى فەناكا ، ئەگەر بابە خواى وەلابا ئەگەر برايە هەربەرايە، ئەگەر خوشكە، خواى هيشك كا ئەگەر ژنە، عەمرێ منەو چاوێ منە.

-*نەرسترايە و نەپەشترايە ، شرقە شرقێ جۆرانە.

-*ئەوەی بیرێ و بیکا ، شـــێرە، ئەوەی نەیرێ و بیکا مێرە
ئەوەی بیرێ و نەیکا چێرە.

-*سپیەو پەلکە بیەو تامی نیە، رەشە و پەلکە بنەوشەو تامی خۆشە.

-*ماچێ رەشان یەک بە شەشان.

-*دروونە لەبەری دەستی ناکرێ.

-*گەورە ئەچنەوە بنەبانان، گچکە ئەدەنۆ جوابێ مێوانان جستان ئەکەونە بواران.

-*گەورە ئەرێن لەناو خانان، گچکە ئەگێڕنەوە لەســـەر بانان.

-خەو نامینێ لەکن بچووکان، حەیا نامینێ لە کن بووکان.

-*مردیێ پار هاوینێ، ئەوساری لۆکەن شینێ.

-*وەختی هەنار زۆران ، خەنی لە بزن زۆران.

-*وەختی هەنار شینان خەنی لە مەشک ژینان.

-*لە مانگێ کانوونێ ، کەپوو پیسترە لە قوونێ.

-*لە خۆشەویستی کونانە کا لە پیستی.

-*منداری بەدەرمانان ، ناڕۆن لەسەربانان.

-*ئیشـــی ژنان بیســـت و چارن ، هەرنان و کۆریان دیارن.

-*ئیشـــی ژنان بیســـت و چارن،    هەرنان و شـــیویان دیارن.

-*جۆرە هەر بێ دەرپێ یە.

-*پینەدۆز بێ پێراوە.

-*تەشی ڕێس ئەگەر تەشی ڕێس بی ،   بەکلکێ کەرێش ئەڕێسی.

-*هەرتەیرە بە رەوێ خۆ.

-*کاروان کردن هێلانە کەوە.

-*تەیرەک ئەخوینی ،  ئەرێ ئەوکوف ئەوکوف.

-*ئەوەی گا ئەیکا گا نایخوا.

-*گا ئەیکا و کەر ئەیخوا.

-*هەمبوو هەمبوو هەمبانە، هەیتم هەیتم مەیدانە.

-*خەســـوێ چاک جووتە گایە، خەســـوێ خراپ لینگە گایە.

-*نانی شوانی چ دەتووری ،  چ دەهووری.

-*گۆلکی خۆماری چکی چکی پێدەرێن.

-*کار هەرلەبن سەوان نابن.

-*ئاگری کەرەدێیان ،  لەشکری فەقێیان.

-*کەرو کاروانیان نەگۆتیە.

-*كەری دێزە خۆلە شاخی فڕادا ، تاصاحێبی زەرەرێ بكات.

-*مازی كەرێ كون دەپاشۆلێ.

-*مێرد ئەگەر لە ژنێ بەهەنجەت بی ، ئەرێ لەكاتی هارد بێژتنی قونان بادەی

-*تڕێ خۆو سڕێ خۆ.

-*بووک لەسەر زینی ، یارزق و یا نسیب.

-*هەمبوو هەمبوو حیساب نیە ، هەیتم هەیتم حیسابە.

-*خزمی خەراب وەكی گونی قۆڕە.

-*لەمن نادەن لە حەمەدی برا دەن ،
وائەزانم لە فەردەی كایێ دەن.

-*ئەوەی رەزەكی هەبی لە نیشاوێ ،
جۆخینەكی هەیە لە شیناوێ.

-*ئەگەر نەگەیشتیە كویستانێ ،
هەڕوە دەربەندی گۆمەسپانێ.

-*ئەگەر نەگەیشتیە كویستانێ ،
هەڕوە باتكانێ.

-*گاڕان بە خڕەوە رۆیشت ،
پیرەژن تازە لە گۆلكە سۆرێ پێچیتۆوە.

..... -*بە پەڕۆكان ستوور نابی.

-*بیر بە دەرزیێ لێنادرێ.

-*کابرایەک .....گچکە بوو ، ئەیگۆت وای جۆتە گونەکی باشم پێوەیە.

-*چار گەواد هەنە لە دنێ، ئەوەی ماریێ باتۆ گوندی ژنێ، ئەوەی لە هەورازان ئەرێ گۆتنێ ، ئەوەی مەڕی دا بە بزنێ.

-*پیر لە خۆشیان ناترِی.

-*چار گەواد هەنە لە دنێ
ئەوەی ماریێ باتۆ کن ماریێ باوی ژنێ
ئەوەی لە هەورازان ئەکیچشی قەلنێ
ئەوەی کچێ دا بە بێوەژنێ.

-*لەکەرێیان پرسی قۆناغت لە کێیە؟
گۆتی تۆبزە زانی .
لەبارگیریان پرسی قۆناغت لەکێیە؟
گۆتی جۆڕکەزانی.
لەهێستریێان پرسی قۆناغت لەکێیە؟
گۆتی ێاحێبمەزانی .

-*چەقەلێ نەزانی ،
مەپشکوە بە جستانێ.

-*مەکەن خزمەتێ لاوان

بکەن خزمەتێ چاوان.

-*خەرک لەدینەبی لەخوین نابی.

-*ئەگەر هیچت نەزانی

خۆیی مەدە بەبیانی.

-*نانی بدە نانکەری، نیوەی لەبەر ڕابخوا.

-*گران بێ حیکمەت نیە

هەرزان بێ عیللەت نیە.

-*ئەگەر کەرەبابیش نەبی، ڕۆژهەردادێ.

-*لەکێ کەتی پار دەوە

لەکێ پسا گرێ ی دەوە.

-*لەدوو چوان مەرێ ئاخ

کۆراو نابن بەباخ

کوڕەتیم نابن بە شەو چراغ.

-*کۆرە شیوا مەکە بەباخ

کوڕەتیمان مەکە بەیداخ

کچە تیمان مەکە بە یاخ

ئاخیرتە بن بە ئاخ.

-*ئەگەر بەختت هەبی هارەبی

خەنجەرت ئە دارەبی

عالەم پێ بریندارەبی.

-*ئەگەر بەخت پەڕیە سەری
بزۆڕی وەک نێرەکەری
عالەم دەرێن عانفەری.
-*رەشەمێ رەشکی روان
بەتارەکا چارو کەندوان
بەشەڕدینی بووک و خەسوان.
-*رەشەمێ و ئادار
رۆژەبنە سار
زکە بنە جەوار
بەتارەبن کەندو و عەمبار
خەسوێ وەگۆتە بووکێ
کێڕا بڕا هەی هاوار.
-*رەشەمێ رەشکی رووشا
نەگیا مینێ نە پووشا
گای سۆر هەر لووشە لووشە.
-*رەشەمێ و ئادار
دوونە ئەبنە چار
بەتارەبن کەندوو و عەمبار
قەت دانایێ بوار.
-*شایی و نێ بە بوونێ

شایی و بێ بە ژینێ.

-*باربەرت جاش بی
لایەکت پووش بی
لایەکت بەرداش بی
ڕێشت هەردێرو تەڕاش بی
هێشتا باشترە کە رەفیقی کەرت وەرداش بی.

-*بیورت سواکاربی
دارت گەندەر بی
یاریشت لە دیاربی.

-*لەخۆبەشکان گوێ بەلن.

-*هەورە سۆری سبیانان
مار دەچنەوە بنەبانان.

-*هەورە سۆری هێواران
ماردەچنەوە هەواران.

-*ئەگەر هەور چووە شارەزوور
بەڕێ کەوە لۆ ڕێگەی دوور
ئەگەر هەور چووە بادینان
مار دە چنەوە کادینان.

-*منداری ترکەن
گیسکی پۆخن

گۆلکی چرمن.

-*بیور تیژبی
دارگەندەربی
یارلەدیاربی.

-*ژنێ شەرموون شارەکی دینی
پیاوی شەرموون شەیەکی ناینی.

-*ئەوەی بە زارو دەوە
مەزنێ گوندی هەرئەوە .

-*لەدەنگان میری زەنگان
لە ئیشیش ریخ لەلینگان.

-*ئەوەی عاردی ئەفرۆشی هەر سارەکێ دەورەمەندە
ئەوەی عاردی ئەکڕی هەر سارەکێ فەقیرە.

-*دوو سەرکە بەران دەمەنجەرەکێ دا ناکورن .

-*هەرکەسە گویزان لە هەمبانێ خۆ ئەژمێری.

-*لە ترسێ گێرێ ، بوویتە حوشتر.

-*لە شێتی وایە هەموو کەس شێتە.
لە دزی وابی هەموو کەس دزە.
لە حیزی وابی هەموو کەس حیزە.

-*هەتا داری دەگوی وەردەی ، هەربۆنی لێدێ.

-*زگی برسی لە ج نابرسی.

-*شیوێ بە زۆر کابانان ، یان سوورە یان بێخوێ.

-*پاشی ترێ ، قوونێ قەیمەکا.

-*ئەرێتە قوونێ خۆ لەدووم مێ ، بۆنت لێدێ.

-*نۆکان باوێ، لۆقان باوێ.

-*رۆیشتنێ وەردان
خواردنێ نۆکان
وەکی ئێکن گران.

-*نەپیاوی بە فیز
نەتووتنێ جێ ی میز
نە کیژێ داک حیز.

-*بەکەرێیان گۆت کورەکت بوو
گۆتی ئەو بارەی لێمە هەر لێمە.

-*مێردم بەدری خۆ بی
نوینم چارۆکێ خۆ بی.

-*فەقیر نەخۆشە، بە لێفە شرێی داپۆشە
دەورەمەند نەخۆشە، بۆنێ ترانیە خۆشە.

-*دەگەر عامێ ، هەروە شامێ.

-*گورگ دەڵێ :
مارت خەرابی بزن
نەوێرم گوێیانی بگەزم

شوان و قاپوت و کسۆکم بەدودا ئەبەزن
مارت خەرابی گا
کەکلکێ خۆ بائەدا
لە خوارێ گوم پیفرێ ئەدا.
مارەبابم کەر
گوێیانم لۆ کاتە چەپەر
نە وێری بکا زەڕە زەڕ.
مارەبابم مەڕ
کەدەستی کرد بەلەوەڕ
دم ئەنێمە دوونگی تەڕ
ئەوجا خۆناکا لەلەوەڕ.
-*کاردی بەساردی
خەوێ لبادی
ئاوێ بەبادی
سیبەرێ کەپکی.
-*ئێک جار بەبەفرێ ئەرێن سارد.
-*لێو لە درانان لە پێشترن.
-*جغارێ پاشی نانی
خەوێ پاشی.......
-*تەشیێ مەڕێسە کورکە

مەشکێ مەژینە چرکە

کوڕی بەخێوکە مرکە.

-*ئەگەر هاتت بوو نەرێی هەی هەی

ئەگەر نەهاتت بوو نەرێی وەی وەی.

-*ئەوەی گەڕا ، دڕا.

-*ئەگەر جومعەی بباری

شەمووشی دێتە یاری.

-*ئەمرێ خوای رەزای هەق.

-*هەر بەردەکی لەسەر دانێ.

-*قەت بەوێ دوعایێ نارێم ئامین.

-*بەپیکێ لێدا بە ماپیکی ئەگێڕیتەوە.

-*هەرسارەو عاقرەکە.

-*بەشەر شیری خاوی خواردیە.

-*پیس بە پیسیێ ئەچیت.

-*تەبێعات دەرمانی نیە.

-*ئەگەر بووی بە میر

خوانەکەی لەبیر

-*ئەگەر زانیت ئەزم

ئەگەر نەتزانی دزم

-*بزن بەپێی خۆی ،

مەریش بەپێی خۆی.

-*بەکەرێ نەوێری، هەردێتە کورتانی.

-*بەردی گەورە ، عەلامەتی لێنەدانە.

-*لۆهاری، هەرەباری.

-*پشێ قاڕان ترش و گۆشتە.

-*تفێ سەرهەوراز، وەخۆتە کەویتەوە.

-*رۆژێ باران قورە.

-*تۆز لە قوڕێ پەیدا نابی.

-*چێر ئەگەر بەدزیش کەری بخوا ،
بەئاشکرا ئەزێ.

-*سەری وەگۆتە زمانی
هەتا ئەتوم لە جیرانی
خۆشیێ ناکەم لە ژیانی.

-*گرێیێ دەستان مەخە درانان.

-*گۆشتی سەی بە کەرپێ بەرازی.

-*دەگەر سەی سەر رەوێ ئەبا،
دەگەر گورگی گۆشتیە خوا،
دەگەر صاحێبی شینێ کا.

-*دەگەر عامێ هەڕوە شامێ.

-*موو لەهاری ، نینۆک لە هەژاری.

-*ماست نیە بەبەرچێرێ ی وەبی.

-*ماری قەرپ سەر بەصاحێبیە.

-*مردنیان پێشاندا ،

بەگرانەتایێ شوکربوو.

-*نەکەرە نەکورتان.

-*نەبای دیتیە نەباران.

-*نەمنداری پیرە مێردانی ،

نەپیرەمێردی مندارانی.

-*کوتەک ئەزانی قۆناغ لە کێیە.

-*جوابێ ئەحەی ، پەحەیە.

-*لە جێ ی سندانێ، قوزڵقورتە.

-*پارەکە خۆش ، بە گایەکی رەش.

-*نە ساری دوو بوار،

نە کوڕی گوێ بەگوار،

نە ژنی تیلاکە خوار.

-*نە کەرەبابی سەربارە داران

نە گیسکی بارو بەران.

-*مەڕۆنە سەرو گەردەنم

برۆنە لیرەی لە بنم.

-*مارە بەدۆیە، دۆش بۆن سۆیە.

-*مار ئەرێ لەمن گاز ،
مشکیش ئەرێ لەمن باز.
-*لە بووکێ نیە سەرو زمان ،
لە خەسوێ نیە دین و ئیمان.
-*زگی برسی، چ ناپرسی.
-*راستە ، راستە، کەرەلە ماستە.
-*دوژمن تەماشەی پێراوت ئەکا
دۆست تەماشەی کراوت ئەکا.
-*پیس بە پیسیێ چی.
-*سەرەژێری ژنان
گەوەی کەران
هەورازی پیاوان.
-*سرقێ سرپبردی
سماقی سێ ئاو لێکردی
ژنێ سێ مێرد کردی.
-*ئاوێ کەندۆران،
گۆشتی بەرخۆران،
ماچێ کیژۆران.
-*نووستنێ سەرەو لێژ،
گۆشتی مەڕێ گێژ،

ماچی ژنێ درێژ.

-*خەوێ لێژان،
گۆشتی گێژان،
ماچێ درێژان.

-*مشکێ تەڕازنێ،
بەرخێ بەربزنێ،
مێردێ دەستێ ژنێ،
هەرسێک لۆمردنێ.

-*گۆتنێ لەهەورازی،
غارێ لەدووبەرازی،
کوڕبێوەژنێ بخوازی.

-*گۆلکی چرمن،
جاشکێ کورکن،
رەزی بەفریز،
کوڕی داک حیز.

-*ژنێ درێژ مازیێ لە لێڕی،
قەدەژن گۆیێ لەزێڕی،
کورتەژن فتنانەگێڕی.

-*ئەگەر کابانم کابان بی
چ رۆژان مار بێ شیرنابی.

-*دنیایێم پێ بکێری کاکە
کزنان لەبیرنەکەی چاکە.
-*مەڕ ئەڵێ:بواران زوو دەرم کە
کەر ئەلێ:هاوینانیش جلم کە.
-*لەناو عاردان تاریشکم
لەدەرمانان سەرپشکم.
-*پوونگێ دەو جۆگەو ئاوانم
دەرمانی هەموو دەردانم.
-*لەدەشتان ناوم مێکووکە
دێمم کەو بمخۆ هەندووکە
ئەبمە دەرمانی زاواو بووکە.
-*داری مێو ئەڵێ:
بەدوژمن بمڕن
بە دۆستان بم رنن.
-*بزن ئەڵێ:
پاییزان شەوینم کە
جستانان دووینم کە.
-*هاوینان بکورێ مێشکۆکە
جستانان دەکورێ مەنجەرۆکە.
-*دەورەمەندی دز

پیری ئاشقه....
فەقیری بەبوغز.
-*بامێردت بەدری خۆبی
شەو نوینت چارۆگێ خۆبی.
-*تابەفر بمینێ لەچیای رەش
هەندی نیوچەوانێ گای قەرەبەش
تێری ناخوا گای رەش.
-*ئەگەر جگم نەبن، کووبچمە جگجگانێ؟.
-*مەمشۆ بەگواوێ
چاکەی دواییشم ناوێ.
-*زار دەرێتە زمانی
تائەتووم لە جیرانی
خۆشیم نایێتە گیانی.
-*ئینسان دەکا تەگبیران
خودا دەکا تەقدیران.
-*بریا خەسوو نەبانە
دەرکە بێ کلیربانە
بووکە سەربەخۆبانە
مێرد بەدرێ خۆبانە.
-*سەری گەورە لۆپیاوان سەروەتە

لۆژنان نسیبەتە.

-*ژنێ سەر بارەکە
پیاوی سەر جوانەگا.

-*پیاوی دم لەبا
ژنێ .....لەبا.

-*پیاوی درێژ ئاقری لەچۆکانە
ژنێ کورت ئاگای لەفتنانە.

-*پیاوی خەپەو دم بیورانی
لەبەر هەرێ تا ئەتوانی.

-*پیاو خزمەت کارە
ژن چرای مارە.

-*شەوان بنجێ گەرمە
هەرامەش بێشەرمە.

-*قسەی هەق ورەقن
هەردەرێی مەترەقن
دەچاوانە چەقن.

-*گولەو دەرمانی بایزاغەی
عافەریم لۆ قەرەنیاغەی.

-*لەخۆشناوێ چۆغەر مەرەز
سوندەکیان خواردیە بەغەرەز

ئامۆکانە کەینە رەز

-*لەخۆشناوێ شل و مل

لەقورەگۆییێن کردنە جل.

-*پێروو ئاوابوو،

نیسک ساوابوو.

-*هەژدەی رەشەمێیە،

قاڕژنی سییێیە.

-*ئادار نەکا خەتەرێ،

نیسان نەینی زەرەرێ،

هەرچەنگی باری کەرێ.

-*گەلاوێژ بگری شەوێ،

ئاوساردەبن لەهەرکەوێ،

دەست بەباغەرێ مێوێ،

ترێی بخۆ بە لێوێ.

-*بەزینێ کتکێ تا کادینێیە.

# پێشبینیەکانی کەشوهەوا لەخۆشناوەتی

جاران خوێندەواری زۆر کەم بوو، ئەوەی هەش بوو بەو جۆرەی ئێستا نەبوو، ئەوانەی خوێندەوار بوون زیاتر چینی مەلاو فەقێ بوون، ئەوانیش نەدەپرژانە سەر ئەوەی بەدواداچوون بۆ پێش بینیەکانی کەشوهەوا بکەن، چونکە وەکوو ئێستا ئەو ئامێرە ئەلیکترۆنیە پێشکەوتوانە نەبوون کەوا بەکاریان بێنن بۆ پێشبینی کەش و هەوا، بەڵکوو زۆربەی ئەو کەسانەی کە پێشبینیان بۆئەم مەبەستە دەکرد، پیاوە بەتەمەن و قاڵبووەکان بوون لە بواری تاقیکردنەوەی ئەو شتانەی کەروویان دەدا، بەو کەسانە دەوترا (حیساب زان).

ئەو حیساب زانانە بەبێ ئەوەی لەبواری کەشناسیدا خوێندبێتیان توانیویانە پەی بەزۆر شت لەبواری کەشناسیدا ببەن.

بەهۆی ئەو تاقیکردنەوانەی کەئەنجامیان دەدا توانیویانە ئاگادار بن لە پێشبینیەکان، حیساب زانەکان بۆهەرهەفتەیەک لەزستاندا ناوێکیان داناوە لەگەڵ پەندێک، باشترین پێوەریش بۆ زانینی پێشبینی بارینی بەفروباران ئاراستەی با بووەلەگەڵ جۆرو رەنگەکانی هەورو دەست

نیشـانکردنی هەندێ شـوێن لەچیاکان بەمەبەسـتی زانینی پێش هاتەکان، حیسـاب زانی واهەبووە بەسـەیر کردنی ئاوی ناو رووبارو کانی و جۆگەکان زانیویەتی کەبەفرو باران دەبارێ یان نا.

حیسـاب زانەکان هەرلە هاوینەوە دەسـتیان دەکرد بە پێشبینی، بۆ نموونە ئەگەر لەهاویندا زۆر گەرم بوایە ئەوا پێشـبینی زسـتانێکی سـەختیان دەکرد، ئەیان ووت لەزستاندا لەبەرامبەر ئەو رۆژەدا زستان زۆر سارد دەبێ و بەفرو بەستەڵەک بەخۆیەوە دەبینێ، یان ئەگەر لەهاویندا بای شـەماڵ زۆر بایە یان زۆر بوونی زەنگەتە سـوورە لەهاویندا و زۆر بوونی بەرِوو لەپاییزاندا، ئەوا پێشـبینی بوون هەر لەهاوین و پاییزانەوە.

لەپاییزیشدا ئاراستەی بایان دەستنیشـان دەکرد، هەروەک دەیان گوت(ئەگەر هەور بچێتە شـارەزوور، بەرِێکەوە لۆ رێگەی دوور)واتا ئەگەر ئاراسـتەی با بەرەو رۆژهەڵات بوو، ئەوا پێشـبینی بارینی باران ناکرێ، بەڵام (ئەگەر هەور چووە بـادینـان، مـار دەچنە کـادینـان)کەواتە ئەو پێشبینییە زۆر نزیک بوو لەباران بارین.

لەخۆشناوەتی کە پاییزان هەور لەئاسمان پەیدا دەبوون، ئەیـان گوت(هەورێ نوێ هـاتن) کەئەو هەورانە پەیـدا

دەبوون خاوەن کێڵگە کشتوکاڵییەکان دڵیان تەنگ دەبوو، هەرلە دوعاکردندا بوون (خوایە نەباریّ)، چونکە بەرووبوومی خۆشناوەتی درەنگ پێدەگات بەتایبەتی (تووتن) درەنگ ووشک دەبوو بۆیە پێیان خۆش نەبوو باران بباریّ بەبارینی باران و تەڕ بوونی تووتن ریسەکەیان دەبووە خوری و مایەپووچ دەبوون، وەبەهارانیش بە پێچەوانەوە هەر دەیان گوت (خوایە بباریّ)چونکە ناوچەی خۆشناوەتی لەگەنم و جۆکردندا زیاتر پشت بەباران دەبەستن.

ئەگێڕنەوە کابرایەکی ئەو خۆشناوەتیە بەماڵەوە دەچێتە بەغداوەیەکی زۆر لەویّ دەمێنێتەوە، خزمەکانی کۆدەبنەوەو دەڵێن دەچین دەیهێنینەوە، هەرچۆنێک بەڕیّ دەکەون و دەچنە بەغدا، لەویّ داوای لێدەکەن و پێی دەڵێن کەدەبیّ بێیتەوە گوند، تۆکەسێکی خاوەن خزمی و خاوەن زەوی و زارێکی زۆری هەردەبی بێیتەوە، ئەویش دەڵیّ مەرجێکم هەیە بۆ هاتنەوەم، ئەوانیش دەڵێن مەرجەکەت چیە؟ دەڵیّ ئایە یارەببی بباری و نەباری پاییزو بواران مایە؟ئەوانیش دەڵێن بەڵیّ ئەریّ وەڵڵا هەرمایە، کابرا دەڵیّ دەبەخوای نایەمەوە ئەمن کاتی خۆی لەبەر ئەو دوعایەی رۆیشتیمە.

لەوەرزی پاییزدا پێش ئەوەی بارانی پەرە دەسـت پێبکات ، هەندێ بارانی لێدەهات، بەو بارانەیان دەگووت (کەپرە شـینە)، ئەو کەپرەشـینەیە بۆ نەریتێکی جولەکەکان دەگەڕێتەوە ، پێم وایە سـەرەسـاڵی ئەوانە ، کەپرێکیان دروسـت دەکردو دەوروبەری کەپرەکەیان بەهەڵواسـینی شـتی سـەیر دەڕازاندەوە، گەلێ جاری واهەبووە هەر لەکەپرە شینەدا (پەرە، پەڵە) کەتیە.

پێشـینـان ئەیـانوت (بواران خۆ تەڕمەکە، پـاییزان خۆگیرمەکە)مەبەسـت لەو پەندە ئەوەیە پاییز وەرزێکە بەرەو زسـتان دەڕوا، لەوانەیە بارانەکە خۆش نەکات و بەفری بەدواوەبێ، گەلێـک جـار زسـتـان غەدری لەپاییزکردووەو لەناوەڕاسـتی پاییزدا بەفر کەوتووە، بۆیە واباشـە لەپاییزاندا زوو بەرەو ماڵ بگەڕێیتەوە، بەڵام لەبەهـاراندا ئەگەر باران بشـبارێ گەوارەیەکەو دواتر دەبێتەوە ساماڵ و بۆیە زوو خۆت بگەیەنیە ژێر هەنوانێک بۆئەوەی تەڕ نەبی.

پەرە(پەڵە)بارانی زۆری لەسـەرەتای پاییزدا بەجۆرێک زەوی تێرئـاو بکـات و بەلای کەمی (٥٠)سـانتیمەتریک قووڵایـی زەوی تەڕببێ، ئەگەر بـارانـی بـاش ببـارێ ئەڵێن(پەرەی قەبری دایە) لەخۆشـناوەتی بەهۆی شـێداری

ناوچەکەو هەڵکەوتەی شـــوێنی زووتر لەشـــوێنەکانی تر پەرە دەکەوێ، بەڵام بەهۆی ووشکی دەشتی هەولێر پەرە درەنگتر دەکەوی، جووتیـاری دەشـــتی هەولێر هەر دەڵێن(کڕەی دەکـا)واتـا لەکـاتی جووتکردنـدا گـاســـن بە ووشکایی دەکەوێ،

پەڵە و جۆرەکانی:

هەروەک باســـمان کرد پەرە بریتیە لەتێرئاوبوونی زەوی بەشێوەیەکی باش ، ئینجا بابێینە سەر جۆرەکانی پەرە:

١-پەرەی سادە:

ئەو پەرەیەیە کەوا پەرەیەکی ئـاســـایی دابێ و لەکـاتی جووت کردندا گاســـن نەگاتە ووشـــکایی، گەنم و دانەوێڵە بەم جۆرە پەرەیە دەڕوێ.

٢-گەندەپەرە:

ئەوەیە کەبەتەواوی باران نەبارێبێ و گاسـنی جووتکردن بگاتە ووشـکاییی و کڕەی بکات ، ئەمەیان بۆ دەغڵ و دان باش نیە، چونکە تۆیەکە دەچێتە سـەرووشـکایی و ناڕوێ و گەلێک جاریش تۆیەکە دەڕزێ.

٣ -پەرەی یەعقووب ئاغایی:

ئەم جۆرە پەرەیە تـایبەتە بەدەشـــتی هەولێر، پەرەی هەرەباش پەرەی یەعقووب ئاغایی پێدەڵێن، دیارە کەسێک

بەو ناوە ئەو تاقیکردنەوەیەی ئەنجام داوە، پەرەکە بەم شێوەیەیە:

زەوی کێڵدراو(شۆ)پاش بارینی بارانێکی چەند شەوو و رۆژ و تێرئاوبوونی زەوی، وولاخ بەناویدا بڕواو یەکسەر جێپێی وولاخەکە پڕببێ لەئاو، یان دانانی قاپێک یان مەسینەیەک و پڕبوونی لەئاوی باران ئەوا نیشانەی کەوتنی پەرەی یەعقووب ئاغایە.

دەگێڕنەوە کابرایەکی خۆشناوەتی لەکاروان بووەو چەند شەو و رۆژێک لەرێگا بارانی پێکەوتووە، زۆر لەخۆی وەڕەس بووە، بڕیار دەدا هەرکەسێکی خەڵکی دەشتی ببینی و پرسیاری لێبکا و بڵێ پەرەنەکەتیە لێی بدا، بەرێکەوت دەگاتە کابرایەکی دەشتەکی و لەسەر رێگا ، هەروەک دەڵێن (دڵ ئاگای لەدڵە) بۆیە کابرای دەشتەکی لای مسۆگەرە کەخۆشناوەکە تووڕەیەو تەڕبووەو دڵنیابوو کەپرسیاری پەرەی لێدەکا بۆیە خۆی ئامادەکردبوو، کاتێک خۆشناوەکە گەیشتەلای بێ ماندی نەبوون کردن، گۆتی(پەرەکەتیە؟)

کابرای دەشتەکی وەلام دەداتەوە و ئەڵێ(بەخوای مام خۆشناو لەترسی توونەبی نەبەخوای پەرەنەکەتیە.

هەروەک ئاشـــکرایە پێشـــبینیکەران و حیســـاب زانەکانی خۆشـــناوەتی ئەوانەی قاڵبووبوون لە پێشـــبینی کەش و هەوا دوای کەوتنی بـارانی پەڵە ئینجـا کـاتی پـاییزەو پاییزیش هەروەک ئەیان ووت هەم هاوین هەم زســـتان زوڵم لەپـاییزدا دەکەن ، چونکە گەلێک جـاری واهەبووە هاوین درێژەی کێشـــاوەو باران و ســـەرما دانەهاتووەو تاکوو کۆتایی مانگی دە، لەو ســـەریشـــەوە زســـتان زوو داهـاتووەو لەمـانگی یازدە بەفر باریوە، لەکۆتایی پاییزدا ئەگەر ســـاڵێک تەم توومان زۆر بایە، ئەیانوت(ســـاری بەتەم، هەرمەگرە غەم)، واتــا ئەگەر لەکۆتــایی پـاییزدا تەمومژ زۆر بوو ئەوا نیشـــانەی ئەوەبوو ســـاڵێکی پڕلە بەفروبـاران دەبێ، هەروەهـا جۆرو رەنگی هەورەکـانیش هەنـدێ جـار پێوەر بوو بۆ بـارین و نەبـارین، هەروەک ئەیـانگوت(هەورەســـۆری ســـبیـانـان، مـار دەچنەوە بنەبانان)مەبەست لەو پەندەدا ئەوەیە کەوا بەیانیان ئەگەر هەور ســـوور بوو، ئەوا دیـارە لەپێش ئەو هەورە هیچ هەورێکی تری لەپێش نیە کە بەر لە تیشـــکی رۆژ بگرێ، سەرەتای هەورەو لەوانەیە بەفروباران بباریٚ.

بەڵام (هەورە ســـۆری هێواران ، مار دەچنەوە هەواران) نیشـانەی ســوور بوونی هەور لەئێواران ئەوەیە کەوا هیچ

هەورێکی ترنیه لەرۆژئـاوا تـابەر لەتیشـــی رۆژبگرێ، ئەمەیان نیشـانەی نەبارینی بەفروبارانه، نیشـانەی خۆش بوونی هەوایەو مرۆڤ دەتوانی لەهەواردا بژی.

لەوەرزی زستاندا هەندێ پێشبینی هەن کەوا نیشـانەن بۆ بـارینی بەفروبـاران وەکوو(دوونەیی)مەڕو بزن و وڵاخی بەرزە و بـاڵنـدە، زوو تێرنەبوونیـان لەخواردن، یـان ئەیانوت(ئاژەڵ و باڵندە بۆنی بەفریان کردووە)یان بەڕەوە رۆیشـــتنی چۆلەکە و خۆ بەماڵان دادانیش دوونەیی یە، ئەوانەش نیشـانەی سـەختی زسـتان بوون، بەڵام ئاژەڵ لەکاتی ئالیک داندا نەی خوارد و باڵندەش خۆیان لەگۆماو وەربدەن ئەوا نیشانەی نەبارین و وەرز خۆشیه.

هەروەها یەکێک له پێشـــهاتەکانی بەفربارینـدا هەڵکردنی بـایەکی بەهێزە، کەپێیـان ئەوت (بـای پێش بەفر)، پێش بـارینی بەفر(شـــرێوە)دەبـارێ، شـــرێوە کەپێشـــی دەڵـێـن(رایەخـی بەفـر) وەکـوو تەزرەیە بەڵام وردتـرو نەرمترە وەکوو تەزرە رەق نییە، دواتر بەفر دەسـتـــــت پێدەکات.

لەزســتاندا هەندێ نیشـانه هەن که ئەگەر رووبدەن ئەوا نیشانەی سەختی زستانه، وەکوو:

- ئەگەر لەکاتی بەفربارینـدا هەور بگرمێنێ.

- لەکاتی بەفرباریندا ناوەندی ئاســـمان لەناکاو ببێتە سامالْ، ئەیانوت (ئاسمان تەقی).

ئەو نیشـــانانە ئەیانوت ئەوە لەتووشـــیانە واتا لەســـەختی زستانە.

هەروەک ئەیان گۆت زســتان هەرچۆنێک بێ، زســتانایەتی خۆی دەکا(لەسواری هەوەک، لەجستانێ شەوەک) واتا بۆ شەوێکیش بێ زستانایەتی خۆی هەردەکات.

ناوی هەفتەکانی وەرزی زستان:

١- لە ١/١٤ تاکوو ١/٢٠ هەفتەی بێلندە.

٢- لە١/٢١تاکوو ١/٢٧ هەفتەی بەرخندە.

٣- لە ١/٢٨تاکوو ٢/٣ هەفتەی مێرەم

٤- لە٢/٤ تاکوو ٢/١٠ هەفتەی ئۆغەن.(مێرەم ئەبینی ، ئۆغەن ئەشکینی)وەکوو باس دەکەن هەندێک دەڵێن مێرەم و ئۆغەن ژن و مێرد بوونە، هەندێکیش ئەڵێن خوشـــک و برا بوونە، ئۆغەن چۆتە کـــاروان و مێرەمیش دەچێتە کۆڵکردن لەدەو رووبار، کەشـــەکە ئەوەندە ســـارد بووە مێرەم بەســـــتوویەتی، دوای هەفتەیەک ئۆغەن لەکاروان دەگەڕێتەوە ســـەیرەکا مێرەم لەماڵ نییە، بەپرســـیار بۆی روون دەبێتەوە کەمێرەم چۆتە کۆڵکردن، ســـــەیرەکـات

بەســتوویەتی، ئۆغەن دەچێ بەســتەڵەکەکە دەشــکێنێ و مێرەم دێنێتە دەرەوە، بەڵام بە مردوویی.

٥- لە ٢/١١ تاکوو ٢/١٧ هەفتەی پیت.(پیتێ پیت کرد، سارێ فیت کرد).

٦- لە ٢/١٨ تاکوو ٢/٢٤ هەفتەی پارۆس. وەکوو دەیان وت(پیت و پارۆس، سار بوو ئارۆز).

٧- لە ٢/٢٥تاکوو ٣/٣ خدر

٨- لە ٣/٤ تاکوو ٣/١٠ لاس.هەروەک دەیان گوت(ئەگەر هات خدر، عارد ئەبێ پندر، شین دەبێ کەنگر، ئەگەر هات لاس سار دەبێ خەلاس).

٩- لە ٣/١١ تاکوو ٣/١٧ سەرمای پیرەژن.

١٠- لەهەژدەی ئادارێ بەفر بکەوی تاگوێ دارێ، نامینێ تاهێوارێ.

لە شــــەوی ٢١ لەســــەر ١/٢٢ رۆژی یەکەمی رێبەندانە، کەبەشەوی (برایمی ) بەناو بانگە،

برایم پیاوێکی چوار شانەی بەهێزو کەڵەگەت و بە غیرەت بوو، لەشــــەوی یەکەمی رێبەنداندا، بەفرێکی زۆر باریوە لەخۆشــــناوەتی، ئەو شــــەوە هــاورێکـانی لەلای برایم دانیشــتوون و پێی دەڵن برایم ئەگەر خۆت بەپیاو دەزانی

و هێنده ئازاو چەربەزەو بەغیرەتی، داخوە ئەتوانی بەو شەوە بچیە (کوێستان)؟

ئەویش غیرەت دەیگرێ و یەکســـەر لەمەجلیســـەکە هەڵدەســـتێ و دەچێتەوە ماڵەوەو خۆی ئامادە دەکات، یەکســـەر بەو شـــەوەو بەو بەفرو ســـەهۆڵبەندانە بەڕێ دەکەوێ دەچێتە کوێستان.

بۆ بەیانییەکەی ژن و منداڵی برایم دەست دەکەن بەگریان و شین و رۆڕۆ، خەڵکی گوندیش مشاوەش دەبن ، لایان وابووە کەبرایم لەناو بەفردا مردووە، بۆیە چەند کەسێکی بەهێزی گوند ئەوانەی کەوا برایمیان هاندابوو، بەدوایدا دەچن، ســـەیرەکەن برایم لەکوێســـتان ئاگرێکی گەورەی کردۆتەوەو بزنە کێویەکی راو کردوەو وا خەریکی گۆشت برژاندنە، بۆیە ئەو شەوە ناو دەنرێ بە شەوێ برایمی.

لەو کاتەدا بەفر زۆر دەکەوێ و رێگاکان هاتووچۆیان بەسەردا ناکرێ و شەختەو بەستەڵەک دەست پێدەکات، ئەو کاتەیە کەئەیان گۆت(برا ناگاتە مارێ برای) .

ئەگەر شـــەوێک لەزســـتاندا زۆر ســـەخت بێ و بەفر زۆر بیارێ، ئەوا دەڵێن (ئەو شەو شەوێ گای سۆرە) شەوی گای سۆر رووداوێک بووە لەخۆشناوەتی روویداوەو بەم جۆرەبووە:

ئێوارەیەکی زســــتان یەکێک لە حیســــاب زانەکان چەند نیشـانەیەک دەبینێ و هەسـت دەکات کەوا شـەو بەفرێکی لەرادەبەدەر دەبارێ، هەرچەندە ســـەرلە ئێوارە ئاســـمان ســـامال بووەو هیچ پەلە هەورێک بەئاســـمانەوە نەبووە، بەلام ئەوەنـدە قـالبووی ئەو پێشـــبینیەبووە بۆیە لەلای مســـۆگەر بووە کەوا بەفرێکی ســـەخت دەکەوێ، ئەو حیســـاب زانە ســـێ کوڕی هەبوون، لەگەل جووتێک گای جووتکردن، کەهەموو ژیانی بەو کوڕانەو بەو جووتە گایە جێبەجێ دەکرد، دیـارە (گـای ســـۆر) زۆر قەلەو بووە، هەرلەئێوارە بانگی کوڕەکانی دەکات و فەرمانیان پێدەکات کەبچن گای سـۆر سـەرببڕن، کوڕەکانیش سـەریان سـوڕ دەمینێ کەبۆچی بەم ئێوارەیە گای ســۆر بکوژنەوە، بۆیە پرســـــیـاری لێـدەکەن کەبۆچی ئەم کـارە بکەن؟ئەدی لەبەهـاردا بەچـی زەوی بـکێلن؟هەرچەنـدی دەکەن و دەکۆشـن کەگای سۆر سـەرنەبڕن، بەلام باوکیان موسـیڕ دەبێ و دەلێ کوڕەکانم(نان ئەو نانە ئەوڕۆ لەخوانە)ئەو شـــەو دلنیام بەفرێکی ســـــەخت دەکەوێ، بۆ بەهاریش خواکەریمە، ئیـدی هەرچۆنێـک بوو لەقســـــەی بـاوکیـان دەرناچن و گای ســـۆر لەهۆرێ دیننەدەرەوە و ســـەری دەبڕن و لەکاتی کوشـــتنەوەی گای ســـۆردا هەندێ پەلە

هەور لەئـاســـمـان پەیـدا دەبن، بۆیە ئەوانیش گومـانی بەفربارینیان لەلا دروســت دەبێ، بۆیە زۆر بەدەســت و بردی گۆشتەکە ئامادە دەکەن و دەیکولێنن، ئینجا باوکەکە پێیان دەڵێ بڕۆن بۆخۆتان کەمێک بنوون، لەنیوەشـــەودا باوکیان هەڵیان دەســـتێنێ لەخەو و پێیان دەڵێ هەندێ گۆشــت بخۆن و بڕۆنە ســەربان و ســەربان بماڵن، ئیدی تاکوو رۆژدەبێتەوە چەند جارێک دەچنە سـەر بان و بەفر رادەماڵن و دێنە خوارەوەو گۆشــت دەخۆن، بەیانی تەنها خـانووی ئەو پیـاوە بەســـاغی دەرچوو، چونکە بەفر زۆربەی خانوەکانی گوند ژێر بەفر کەوتن.

دوای شـەوی گای سـۆر و سـەخت بوونی وەرزی زستان و کەوتنی بەفرێکی زۆر، ئەگەر هەتوو دوای بەفر بـارین بوو بە ســامال، شـــەوەکەی زۆر ســـارد دەبێ، هەروەک دەیان گوت(ئەو شـەو شـەوێ جۆتەیە)، مەبەستیان لەگەڵ یەک نووســـتنی ژن و مێردە بۆ ئەوەی گەرم ببنەوە، ئەو شەوە دەبێتە بەستەڵەک و جەلیتە بەلێوە سواندانەوە دێنە خوارەوە، هەروەک ئەیان گوت: (داروبەردی لێک بەستیە)، پاش ماوەیەک دەکەوێتە سـەر حیسـابی (مێرەم و ئۆغەن) دوو کاتی لەیەک جیاواز روودەدەن، مێرەم و ئۆغەن ژن و مێردێک دەبن، مێرەم دەچێتە کانی بۆ کۆر کردن، لەبەر

ئەوەی زۆر سارمابووە مێرەمی بەستووەو ئۆغەن دەچێ رزگاری دەکات، کەمێک کەش و هەوا خۆش دەبێ.

لەزۆربەی گوندەکان حیسابزان و کەشناس هەبوون، هەرکەسە و بەپێی شارەزایی لە پێشبینییەکانی بەپێی توانای خۆیان حیسابیان کردووە، زۆر جار راست دەرچووە هەندێ جاریش ماوەیەک دوا کەوتووە، لەگوندی(کانی بەرد)ی سەر بەناحیەی بالیسان دوو براهەبوون بەناوەکانی (ئەحمەد مەحموود و رەسوول مەحموود) تا ساڵەکانی چلی سەدەی رابردوو ژیاون، ئەو دوو کەسە زۆر بلیمەت بوونە لەبواری پێشبینیدا.

هەروەک دەگێڕنەوە لەمزگەوتی گوند هەندێ شوێنیان دەست نیشان کردبووەکوو ئاراستەی تیشکی رۆژو و باو هەندێ حاڵەت لەچیاکانداو شەویش چاودێریەکی ووردی ئەستێرەکانیان دەکرد، هەندێ جاریش تەنها بەسەیرکردنی ئاوی رووبار دەیانزانی کەئایا باران دەبارێ یان نا، لەوەرزی زستاندا جوتیارەکان و خەڵکی ناوچەو سەردانیان دەکردن دەربارەی داهاتووی زستان وەرەوەندەکانیش سوودیان لێدەبینین بۆ کاتی سەفەر کردن و کوێستان و گەرمیان کردن.

دەگێرنەوە پیرەژنێک بەناوی (پوور حەلیمە)هەندێ گەنمی بردووەتە ئاش و کردوویەتی بەئارد و لەسەر بانی خانوەکەی رای خستووە بۆ وشکبوونەوە، (مام احمد)بەوێدا تێدەپەڕێ و داوای لێدەکات کەئاردەکەی هەڵ بگرێتەوە چونکە باران دەبارێ، پیرەژنیش سەیرکات ئاسمان ساماڵەو هیچ هەورێکی لەبەر نیە، بۆیە زۆر گرنگی بەو قسەیە نادات و دەچێتەوە ژوورەوەو مەشغول دەبێ بە ئیش و کارەکانی ، پاش ماوەیەک باران دەست پێدەکات و ئاردی پیرەژن تەڕ دەبێ، ئیدی پیرەژن متمانەی بە مامە احمد پەیدا دەبێ و ناوە ناوە لێی دەپرسی(احمد کەنگی بچمە ئاشی؟).

ئێوارەیەکی زستان مام احمد بەناو بالیساندا تێدەپەڕێ و دەیەوێ بچێتەوە کانی بەرد، لەگەڕەکی (میرووسیان) علی بەگ لەسەر پێشەبانی خانووەکەی راوەستایەو رێ لەمام احمد دەگرێ و پێدەرێ(احمد بەفرت چی لێهات؟هەردەتگۆت بەفرە باری)، مام احمدیش کەیابیری کوڕی لەگەڵ بووە هەربەدەم رێوە پێی دەرێ (عەلی بەگ ئەو شەو خۆراگرە)، یابیری کوڕی دەڵێ: ئەو کاتەی بابم ئەو قسەیەی بە علی بەگ گوت هەرچی پەلەهەورە بەئاسمانەوە نەبوون، بەڵکوو ساماڵ بوو، هیچ

کزەبـایەکیشـــی نەدەهـات، بۆیە بەبـابم گوت ئەتوو ئەو قسەیەت بۆ بە علی بەگ گووت خۆهیچ هەوربەئاسمانەوە نیە؟یـابیر دەڵێ بـابم گوتی کوڕم من لەخۆڕا نـاڵێم بەفر دەبارێ دڵنیابە ئەو شـەو دەبارێ، نیشـانەکانی بەفر بارین لەلام دیـارن، ئەو شـــەو ســـەیرکە چ بەفرێک دەبـارێ، هەردووکیان دەگەڕێنەوە گوند.

یـابیر دەڵێ: بەدرێژایی ئەو رۆژە هەرتەماشـــای ئاســـمانم دەکرد، زۆر دەترسـام لەوەی قسـەی خەڵکمان بێتەسـەر و پێشـبینیەکەی بابم راسـت دەرنەچێ، کەچی تادوای بانگی مەغریبیش هیچ پەلە هەورێـک بەئـاســـمـانەوەم نەبینی، تـاکاتی نووســـتن چەند جارێک مام احمد چەند جارێک یـابیر دەنێرێتە دەرێ، پێش نووســـتن بەیـابیر دەڵێ ئەو جارەش بڕۆدەرێ و تەماشـای سـەر چیای نووسـەک بکە بزانە پەلە هەورەکە نەهاتیە، ئەڵێ کەچووم ســـەیرم کرد هەندێ هەوری زۆر بچووک و تەنکم بینی زۆر دڵخۆش بووم بەو پەلە هەورە ، بەڕاکردن چوومەوە ژوورەوەو خەبەرەکەم پێداو پێی گۆتم زۆرباشـــە بڕۆ بنوو، دەڵێ چووم نووســـتم، نازانم چەند خەوم لێکەوت لەنیوەشـــەو هەڵیســـاندم، کەچوومە ســـەربان بەفرباریبوو، بانمارێکی تەواو، چووم ســـەربـانم لەبەفر پـاککردەوەو هـاتمە

خوارەوەو لێی نووســـــتمەوە، بەاینبەکەی لەبەر دەنگی خەڵک لەخەو هەســـتام کەخەریکی بەفر ماڵین بوون، ئەو رۆژە عەلی بەگ بەپێیان دەچێتە کانی بەردو دەڵێتە مام احمد هاتووم زیارەتت بکەم، چونکە پێشبینیەکەت بەڕاست دەرچوو .

هەروەها مرۆڤە بەئەزموونەکان ئەوانەی قاڵبووی بواری کەشـــناســـی بوون، ســـوودیان لە هەڵس و کەوتی گیان لەبەرەکێویەکـان وەرگرتووە، یەکێک لەوانە(یونس مامەشـــین)ی شـــەقلاوەیی بوو، کەهەم راوچی و هەمیش کەشناسێکی کارامەو بەتوانا بوو، ئەی ووت( تاکوو پێرو ئاوانەبێ بزنەکێوی نـایەڵێ نێری نزیک ببێتەوە) تـاکوو نزیکی مـانگی یـازدە ، ئەو کـاتەی کەیەکەم بەفربـارین دەستپێدەکات کە (کرێوەی نێریان)ی پێدەڵێن، چونکە بزنە کێوی مەبەســــتی بوو کەکاریلەکانی لەکاتێک لەدایک ببن کەســـەرماو ســـۆڵ بەســـەر چووبێ بۆ ئەوەی لەســـەرما پارێزراوبن، لەبەر ئەوەی مـاوەی مـانەوەی کاریلە لەنـاو زگی بزن و مەڕ پێنج مـانگە، بۆیە جـاران خـاوەن بزن و مەڕەکان لەکۆتـایی هـاویندا نێریەکانیان لەمێگەڵ دادەبڕی و دەیان هێنانەوە ماڵەوە، هەم بۆ دابەستن و قەڵەو کردن

و هەمیش لەکاتێکی وادا دەیان بردنەوە ناو مێگەل کەوا کاریلەو بەرخەکان لە کۆتایی مانگی ئاداردا لەدایک ببن.
هەروەها پەندێک هەیە کەئەڵێ(پێروو ئاوابوو، نیسک ساوابوو)لەبەر ئەوەی نیسک لەپاییزاندا دەچێنرێت، بۆیە دەستنیشانکردنی جموجۆڵی ئەستێرەکانیان دەکردە نیشانە بۆ هەموو کاتەکان، بۆ شەوانیش پشتیان بەئەستێرەی (جەدی) دەبەست، ئەستێرەی جەدی جێگیرەو ناجولێ، دوو ئەستێرەی تر لەدەوریدا دەخولێنەوە، شوێنەکانیان بەپێی جوولەی ئەستێرەکان و گەیشتنیان بەشوێنەکانیان کاتەکانیان دیاری دەکرد، کاروانچیەکان ئەستێرەی جەدیان دەکردە نیشانە بۆ بەڕێکەوتن لەکاتی کاروان بەڕێکەوتندا، بەهۆی ئەو ئەستێرەیە ئەو شوێنەیان دەستنیشان دەکرد کەبۆی دەچوون، پیاوێکی ناوچەی بالچەکایەتی گێڕاویەتیەوە کەوا بەهۆی ئەو ئەستێرەیەوە لەسەربازی رایکردووە لەحەلەبەوەو گەڕاوەتەوە ناوچەکەی خۆیان ، چەندین کەسی تر کەسەفەریان کردووە بەشەو بەهۆی ئەو ئەستێرەیەوە چوونەتەوە شوێنی خۆیان، وەمام قادر گۆزێ لەکتێبەکەیدا(من و شەقلاوە) دەڵێ(حاجی برایمی

سـەرگرد) دەیگێڕایەوە کەچۆن بەهۆی ئەو ئەسـتێرەیەوە شەو ڕێگایان کردووە و گەڕاوەتەوە شەقلاوە.

ئەمە جگە لە ئەسـتێرەکانی حەفتەوان لەو کاتەیدا کەڕۆژ ئاوادەبێ چواریان لەپێشـەوەن تاکوو نیوەشـەو، لەوەش بەدواوە سێیەکەی تر بەپێشیان دەکەونەوە.

ئەسـتێرەی گەلاوێژیش ئەسـتێرەیەکی بریقەدارەو لەمانگەکانی هاویندا دەردەکەوێ، ئەو کاتەی کەدەگاتە بەرانبەر قیبلە ئەوانیشـانەی هاتنی بەیانیەو شـەو فێنک دەبن، بەڵام بەرۆژ هەرگەرمەو ترێ پێدەگات، هەروەک ئەیان گووت:

گەلاوێژ بگری شەوێ
ئاو ساردەبن لەهەرکەوێ
دەست بە باغەرێ مێوێ
ترێی بخۆ بەلێوێ.

ئەسـتێرەی گەلاوێژ لەکۆتایی تەممووزدا دەردەکەوێ پێش بەیانی هەڵدێ، تا وای لێدێ لەوەرزی زستاندا ون دەبێ و نامێنێ.

وەئەسـتێرەکانی (تەرازوو) کەسـێ ئەسـتێرەن لەتەنیشـت یەکترن، ئەوانیش بۆ دیاریکردنی کاتەکانی شەو سوودیان لێ دەبینین.

# سەرچاوەکان


١- گۆڤاری راز، ژمارە٢ (٢٠٠٩/٤/١٦)

٢- گۆڤاری خۆشناوەتی ژمارە ٢ بەهاری ٢٠١٠

٣- گۆڤاری شانزەی چوار ژمارە ٥ ساڵی پێنجەم ٢٠٠٨

٤- علماء و مدارس في اربيل، زبير بيلال اسماعيل.

٥- من و شـــەقڵاوە، قادرگۆزێ، چاپخانەی شـــەهاب، هەولێر ٢٠١٤

٦- ژیانی فەقێیایەتی لەکوردستاندا، مەلامحمد عەلیاوەیی.

٧- ژیـانی فەقێ و دەنگی فەقێ، مەحمود عەزیز حەســـەن، سلێمانی ٢٠٠٨

٨- ئینســـکلۆپیـدیـای هەولێر، بەرگی یەکەم، جوگرافیـا، لاپەڕە(١٠٩، ١١٢، ١١٥، ١١٨، لەبـڵاوکـراوەکـانــی دەزگـای بەدرخان)٢٠٠٩.

٩- خۆشناو و دۆو دۆشاو، فەقێ شێخوەسانی، ٢٠١٥

١٠- چەند زانیاریەک دەربارەی نـاوچەی خۆشـــناوەتی، مەلا خالید فریزی، چاپخانەی بژار ٢٠٠٦.

١١- پێنج توێژینەوە لەســـەر گوندەکانی ناحیەی بالیســـان، رێکخراوی کیمیاباران و ئەنفالکراوەکانی بالیسان و دەورووبەری ، چاپخانەی شەهاب ، هەولێر ٢٠١٣

١٢- گۆڤاری شەقڵاوە، ژمارە١ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٩

١٣- جوولەکەکانی کوردســـتان، بەختیـار دواوەیی، دەزگـای بەدرخان، هەولێر٢٠١١

١٤- مێژووی زانایانی کورد، مەلا تاهیر مەلا عبداللە بەحرکەیی، هەرسێ بەرگ، دەزگای ئاراس هەولێر، ٢٠١٠

١٥- مێژووی کۆیە، بەرگی یەکەم، نووســـینی تـاهیر ئەحمەد حەوێزی، بەغدا ١٩٨٤

١٦- هۆزی ئاکۆ لەنێوان مێژووی کۆن و نوێدا، نووسینی محمد حسن سەرگەینێلی، چاپی یەکەم ، هەولێر ٢٠١٧
١٧- ئینسـکلۆپیدیای هەولێر، مێژووی هاوچەرخ، مێژووی کۆن و نوێ ی کۆیە، نووسـینی کەریم شـارەزابەرگی چوارەم، لاپەڕە(١٨٩٨و ١٨٩٩) چـاپخـانەی گـرین گـالۆری بەیـروت، لەبڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان ٢٠٠٩.
١٨- تاریخ شـقلاوە، نووسـینی (میخاییل منێور کۆسـا) بەزمانی عەرەبی.
١٩- عنوان المجد- ابراهیم فێیح الحیدری
٢٠- عشائر العراق -عباس العزاوی
٢١- الکامل فی التاریخ – ابن الاپیر
٢٢- سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی
٢٣- مسالک الابێار- ابو فچلالله العمری
٢٤- فەرهەنگی هەمبانە بۆرینە- مامۆستا هەژار- چاپی ئێران.
٢٥- کوردو کوردسـتان لە رۆژگاری خیلافەی ئیسـلامیدا، نووسیینی(د. زرار سەدیق تۆفیق، ل.٧٥و ٧٦.ناوەندی ئاوێر٢٠١٢
٢٦- فۆلکلۆری خۆشـناوەتی، محمدجمال توتمەیی، چاپخانەی رۆشنبیری، ٢٠١٢
٢٧- بڵاو کراوەکانی (ئاوێر)کەلە بالیسـان دەردەچوون، سـاڵی ٢٠٠٦.
٢٨- خۆشـناوەتی لەسـەدەی بیسـتەمدا، بەختیار دواوەیی ، ناوەندی ئاوێر، ٢٠١٧، هەولێر.
٢٩- دووسـاڵ لەکوردسـتان، دەبلیو ئار هەی، و.لوقمان باپیر، چاپخانەی رۆژهەلات ساڵی ٢٠١٩٠.لاپەڕە- ١٤٣-١٥١.
٣٠- ئینسـکلۆپیدیای هەولێر، بەشـی سـێیەم، ئیدارەی هەولێر لەدوا سـەردەمی عوسـمانیەکاندا، د.خلیل علی مراد، ل ١٣٧٨، چاپخانەی گرین گالۆری.لبنان، ٢٠٠٩

## سوپاس و پێزانین

لێرەدا دەمەوێ زۆر سوپاسی نووسەر و ڕووناکبیری کورد کاک (زیرەک کەمال) بکەم، کە ئەرکی چاپکردنی ئەم کتێبەی خستە ئەستۆی خۆی.
هەروەها زۆر سوپاسی کاک (حەیدەر عەبدوللا)ی نووسەر و وەرگێڕ دەکەم، کە ئەگەر هاندان و هەوڵ و هیممەتی ئەو نەبووایە، هیچ لە کتێبەکانم چاپیان نەدەبینی.

